# سەردەم 24

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بییانی



supremata

گۆڤاری (سەردەم) هەر لە سەرەتاوە ویستوویەتی پەنجەرەیەك بێت لەسەر کەلتووری بێگانە، بە تایبەتیش بوارەکانی فەلسەفەو فیکرو تۆژینەوەی رەخنەی ئەدەبیو هەڵبژاردە لە دەقی بێگانەو هونەرەجوانەکان. بە مەبەستی ئاشناکردنی خوێنەری کوردیش بەو کەلتوورە؛ گۆڤاری (سەردەم) جەخت لەسەر هەڵبژاردنی چۆنیی بابەتەکانو وەرگێڕانی سەرکەوتوو دەکات. هەر بۆیە ئومێدەوارە کە بتوانێت لەم رێیەوە؛ لە بزاوتی رۆشنبیریی کوردیدا بە جۆرێك لە جۆران رۆڵی خۆی ببینێت. ئەوەش رادەگەیەنین کە ئەم گۆڤارە گۆڤاری هەموو وەرگێڕێکی کوردە کە ئەم پێرەوە رەچاو بکات.


دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: رەووف بێگەرد

بەرێوەبەری نووسین: ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین

رێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری

تاڤگە فائق



ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: 3130347

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044162 8486008 – Faz: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە رێی سندوقی پۆستی ژمارە 14665/615 و 14665/616 تاران

لە رێگەی ( e~mail )ەوە

sardam@sardam.net

کانونی یەکەم
2002
ســــالّی چـــــوارەم

سەردەم 24

Sardam

## ناوەڕۆك

# کۆمەڵگا وەك پیرۆزی

• دانیاڵ ئێل. پاڵس
▪ لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

ئایدیای کۆمەڵگا رۆحی ئایینە
دۆرکهاییم

## فۆڕمە بنەڕەتیەکانی ژیانی ئایینی[1]

لەوسالآنەدا کەفرۆید لە ڤییەنناوە تێڕوانینە مشتومڕاوییەکانی خۆی دەخستە روو، بیریارێکی تر، لەفەرەنسا، ئەمیل دۆرکهاییم، دەستی کرد بەکارکردن لەسەر تیورییەك بۆ ئایین، کە ئەویش وەکو شۆڕشێك وەهابوو، بەلآم لە تویێی ڕێگایەکی تەواو جیاوازەوە. ئەگەر فرۆید یەکەمین ناوبێت کە خەڵك پەیوەستی بکەن بە سایکۆلۆجیای مۆدێرنەوە، ئەوا پێویستە دۆرکهاییم، گەرچی کەمتریش ناسرابوو، یەکێك بێت لە یەکەمینی ئەو کەسانەی لە کاتی ئاماژەکردن بۆ سۆسیۆلۆجیادا بە بیرماندا بێن. دۆرکهاییم تەحەددای کرد لەسەر بایەخی سەنتەریی کۆمەڵگا، بونیادە کۆمەلآیەتییەکان، پەیوەندییەکان، لەگەڵ دامەزراوەکاندا. لە تێگەیشتنی بیرکردنەوەو رەفتاری مرۆڤدا. گۆشەنیگای جیاوازی ئەو بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ بینینی هەموو بونیادێکی



دۆرکهایم

سەرەکیی ژیانی مرۆڤ. یاساو ئاکارەکانمان، کارو ئەفراندنەکان، خێزان و کەسێتی، زانست و هونەر، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئایین. لە توێی هێڵەکانی ئاراستە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە. ئەو دەیووت ئەگەر کۆمەڵگایەك نەبووایە تا ئەوانە بخوڵقێنێت و بیانرسکێنێت، هیچ یەکێك لەوانە نەیاندەتوانی بێنە بوون.

بێشك لە تێڕوانینی یەکەمدا، هەر تیوریستێك خۆی لەم بابەتانە بئاڵێنێت، زەحمەتە لە بەرپاکەری شۆڕێك بچێت. چونکە لە کەش و هەوای بیرکردنەوەی هاوچەرخدا، کەمجار ڕێکەوت دەکات هیچ جۆرە مشتومڕێك ئەنجام بدرێت، بەبێ ئەوەی ببرێتەوە بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتی. زەحمەتە رۆژێك تێبپەڕێت بەبێ ئەوەی دەربارەی رەوتی کۆمەڵایەتی، ئەندازەی کۆمەڵایەتی، ریفۆرمی کۆمەڵایەتی، بدوێین. وەلێ پێش کەمتر لە سەدەیەك، ئەم چەشنە زمانە باوەی ئێستا بەقەدەر باوییەکەی دەگمەن بوو. کۆمەڵگا وشەیەك بوو زیاتر پەیوەندیی بە چینی باڵاو کاروبارەکانی ئەو چینەوە هەبوو، هاوشان لەگەڵ ئاهەنگی ئێوارانی خێزانە دەوڵەمەندەکاندا. سیستمە براییەکانی بیرکردنەوە شتێکی یەکجار تاکانە بوون، هەروەها دیاردەی روانینە سازانی کۆمەڵایەتی. لەدیوی تاکەخێزانێکەوە بەرەو گوندێك، کەنیسەیەك، یاخود نەتەوەیەك. وەکو شتێکە کەمێك زیاتر لەوەی کۆبوونەوەی تاکە جیاجیاکان بێت کە وەکو باو پێکەوە کۆبوونەتەوەو سودمەندیشن. بەڵام دۆرکهایم تێڕوانینێکی جیاوازتری هەبوو، ئەو دوورتر رۆیشت و وتی فاکتە کۆمەڵایەتییەکان زۆر

لە هی تاکەکان بنەڕەتیترن ، چونکە ئەوانە لەرێی خۆیانەوە رێك وەکو شتە فیزیاوییەکان راستەقینەن، هەروەها چونکە ئەگەر جێگادەستی کۆمەڵگا لەسەر تاکەکان پشتگوێ بخەین، یان بە نارەحەتیی تێبینیان بکەین، ئەوا زۆر خراپ لە تاکەکان تێدەگەین. دواجار مرۆڤ بە تەنیا هەر تاکێك نیەو بەس، بەڵکو مرۆڤەکان بەردەوام سەر بە شتێکن. بە دایکوباوك یان کەسوکار، بە شارۆچکەیەك یاخود شارێك، رەچەڵەك، پارتی سیاسیی، یان هەرگرووپێکی تر بێت. لە تێڕوانینی دۆرکهاییمدا، هەڵەیە ئەگەر وا بیربکەینەوە کە دەتوانین لە رێی غەریزە بایۆلۆجییەکانەوە، سایکۆلۆجیای تاکەکان، یان لە توێی کۆمەڵگاوەو لە ناویدا، راڤەی تاکەکان بکەین، هەروەها لە چەمکە کۆمەڵایەتییەکانەوە بڕوانینە کۆمەڵگا.

لەبەردەمی ئەم پێشەکییە کۆمەڵایەتییانەدا، دۆرکهاییمیش وەکو فرۆید، جەخت لەوە دەکات کە بابەتەکەی پێویستی بە دیسپلینی زانستیی نوێ هەیە، تا لێی بکۆڵێتەوە. هات ئەم بوارە تازەیەی ناونا سۆسیۆلۆجیا، گەرچی ئەو یەکەمین کەس نیە ئەم وشەیەی بەکارهێنابێت، بەڵام ئەم بە سانایی سۆسیۆلۆجیای کرد بە زانستی کۆمەڵگا. جێی سەرنجە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی پشتگیریی و گاریگەریی دۆرکهاییمەوە، ئەم جێگا گرنگەیان لە ژیانی مۆدرێندا داگیر کردووە، چ ئەگەر لە مەسەلەی دەوڵەت، ئابوریی، رۆشنبیرییدا هانای بۆ ببەین، یان لە هەر شوێنێکی تری مشتومڕی باودا، هەر لەوانەی ناو هۆڵەکانی

زانکۆوە، تا دەگاتە دیداری تەلەفزیۆنی. تێڕوانینە جیاوازەکانی ئەمڕۆمان بەرەو جیهان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شۆڕشە سەرکەوتووەی کە دۆرکهاییم بەرپای کرد[2].

لە راستیدا دۆرکهاییم دوو هاوتەریب بەوەی فرۆیدمان[3] دەخاتە بەردەست. نەك ئەوەی هەردوکیان هەست بە پێویستیی بواری تایبەتی لێکۆڵینەوەکەیان دەکەن. سایکۆلۆجیا بۆ یەکێکیان و سۆسیۆلۆجیاش بۆ ئەوەی تریان. بەڵکو هەردوکیان بۆیان دەرکەوت کە بۆچوونە نوێیەکانیان، دەیانباتەوە بۆ دواوە بۆ سەر پرسیارە زۆر دێرینەکەی لەمەڕ رەفتارو باوەڕی ئایینی. دۆرکهاییمیش وەکو فرۆید ناچار بوو بپرسێت: ئایین چیە؟ بۆچی ئەوەندە گرنگەو بووە بە سەنتەریی بایەخەکانی مرۆڤ؟ کاریگەریی لەسەر تاك و کۆمەڵگا چییە؟ وەکو بینیمان فرۆید پێی وابوو کە ناتوانێت بەبێ ئەوەی خۆی بدات لە قەرەی ئایین، کەسێتی شیکار بکات. دۆرکهایمییش هەستی بە هەمان شت کرد دەربارەی کۆمەڵگا. لە هەوڵیدا بۆ تێگەیشتنی کۆمەڵ، لە هەر هەموو ئاراستە شاراوەو بەهێزەکانیدا، خۆی بینییەوە بەرەو ئایین کێش دەبێت. بەلای دۆرکهاییمەوە، ئایین و کۆمەڵگا لە یەکتریی جیانابنەوەو دوو تەواوکەری بنەڕەتیی یەکترین.

## ژیان و کار

دۆرکهاییم لە ساڵی *1858*دا لە شاری ئیپینال لەدایکبووە، کە نزیکی ستراسبۆرگەو دەکەوێتە باکوری فەرەنساوە.[4] باوکی رابی بووە، کاتێك کوڕێکی لاو بوو کەوتە ژێر کاریگەریی یەکێك لە مامۆستا کاسۆلیکەکانی قوتابخانەوە. پێدەچێت ئەم کارتێکەرانە دەوری هەبووبێت لەوەدا کە بایەخ بدات بە ئایین، بەڵام خۆی بە شێوەیەکی تایبەتی رێگای (نازانمی) هەڵگرتبۆوە.

لە قوتابخانەی باڵا دۆرکهاییم خوێندکارێکی زرنگ بوو، لە تەمەنی بیستویەك ساڵیدا لە پەیمانگای باڵای مامۆستایان وەرگیرا (پێشتر دووجار هەوڵیدابوو، بەڵام لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو نەبوو) کە یەکێکە لە سەنتەرە هەرە نایابەکانی خوێندن لە فەرەنسا، لەوێ فەلسەفەو مێژووی خوێند. ئەزمونی ئەو لەوێ زۆریش خۆش نەبوو. لەلایەکەوە، ئارەزووی ئەو شێوازە مردووە نەبوو کە پرۆگرامەکانی خوێندنی پێ داڕێژرابوو. هەروەها ئەوکاتە میزاجێکی پڕ لە پرتەو بۆڵەو سکاڵاکردن و ناڕەزایی هەبوو. بەڵام پێویستە دۆرکهاییم سوپاسگوزاری ئەو رەوش و بونیادە بێت، کە نەیانهێشت، تەنیا لەبەرئەوەی حەزی لەرێساکانی نییە، دەسبەرداری پەیمانگا ببێت. دوای تەواوکردنی پرۆگرامی خوێندن و پێشکەشکردنی دوو دانە لێکۆڵینەوەی درێژ، کە ئەوکاتە داوا لە هەموو خوێندکارێکی ئەو پەیمانگایە دەکران، ئینجا دەستی کرد بە مامۆستایی لە ناوەندییەکانی دەوروبەری پاریسدا. هەروەها بۆماوەی ساڵێکیش چوو بۆ ئەڵمانیا، تا لەسەر دەستی "ولیەم ۆندت" دەرس بخوێنێت. دۆرکهاییم لە ساڵی *1887*دا لویزا دریفۆسی مارەکرد، ئەم ئافرەتە ژیانی خۆی

تەرخانکرد بۆ وەزیفەکەی دۆرکهاییم و هەردوو منداڵەکەیان. هەر هەمان ساڵ دۆرکهاییم بوو بە پرۆفیسۆر لە زانکۆی بۆردیۆ، کە بۆ یەکەمجار کورسییەکی تەرخان کرد بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان و رۆشنبیریی، بە تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆجیەکانی دۆرکهاییم[5].

دۆرکهاییم لە ماوەی پازدە ساڵی داهاتوودا، کاتێك لە بۆردیۆ سەرقاڵی پرسیارە سۆسۆلۆجییەکانی بوو، ئایدیاو بۆچوونەکانی خۆی پێشخست و یەکەمین کتێبی سەرەکیی خۆی بلاوکردەوە، دابەشکردنی کار *1853*، هەروەها لەساڵی *1895*یشدا، کتێبی یاساکانی میتۆدی سۆسیۆلۆجیا، کارێکی تیوریی بوو، لێوان لێو بوو لەمشتومڕی زانستیی، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی گرنگیشی بلاوکردەوە: "خۆکوشتن ـ *1897*" کە تێیدا بەدوای ئەو فاکتەرە باوو میللییانەدا دەگەڕا، کە وایان لە خەڵکی سەردەمەکەی دەکرد بە شێوەیەکی گێلانەو خۆبەخۆ خۆیان لەناو ببەن. هەرلەو دەوروبەرەشدا، لەگەڵ چەند لێکۆڵەرەوەیەکی دیکەدا گۆڤاری ساڵانەی سۆسیۆلۆجیایان دامەزراند، گۆڤارێکی ئەکادیمییانەی نوێ بوو، وتارو تێڕوانینی سۆسیۆلۆجییانەی بلاودەکردەوە. ئەم گۆڤارە، کە دواتر لە سەرانسەری ئەورووپاو جیهاندا شۆرەتی پەیداکرد، بەقەدەر کتێبەکانی دۆرکهاییم دەوری هەبووە لە پێشخستنی سۆسیۆلۆجیادا. لێکۆڵەرەوە بەهرەدارەکانی تریش کێشکران بۆ ئەوەی کارەکانی خۆیان لەسەر لاپەڕەکانی ئەو گۆڤارە بلاوبکەنەوەو بەشداریی بکەن لەو پرۆسێسەدا کە تێڕوانینی دۆرکهاییمی بەرەو قوتابخانەیەکی بیرکردنەوە پێشخست. جێی سەرسوڕمان نیە، لەژێر کاریگەریی ئەم بەرهەمە کاریگەرانەداو (بە یاریدەی هەندێك دانوساندنی سیاسییانەی ناو حکومەت)، دۆرکهایم لە تەمەنی چلوچوار ساڵیدا دەبێت بە پرۆفیسۆر لە زانکۆی پاریس، رەنگە ئەوە مەزنترین شانازیی ئەکادیمیی فەرەنسا بێت.

لە پاریس دۆرکهاییم ساڵانێکی پڕ لە شانازیی و دواتریش تراجیدیی بەسەربرد. لە بۆردیۆ، بایەخدانەکانی دەستیان پێکردبوو بە گەڕانەوەیەکی بەهێز بەرەو تەقاندنەوەی دەوری ئاین لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا، بەڵام دوای شوێن گۆڕینەکەی، ئەرك و سەرنجی تازەتر بەرەو پێشەوەچوونی لێکۆڵینەوەکانی ئەویان پیشان دا. بێ شك ئەو نەخشەکەی خۆی هەر هێشتبوەو دە ساڵ دواتر کتێبی فۆرمە سەرەتاییەکانی ژیانی ئاینییانەی بلاوکردەوە (*1912*)، کە ناودارترین و گرنگترین کتیبێتی. دۆرکهاییم بەم کتێبە شایانی ئەوەیە بە تیوریستی ئایین دابنرێت ، هەروەها کاریگەریی زۆریشی لەسەر بیریارانی دیکە بە فراوانیی بەهۆی ئەم لێکۆڵینەوە کاریگەرەوەیە کە لەم بەشەدا بە وردیی لێی دەکۆڵینەوە. هەرچۆنێك بێت، وەك لە سەردەمەکەی ئەوەوە دەردەکەوێت، فۆرمە سەرەتاییەکان، تەنیا دووساڵ پێش ئەوەی ئەورووپا بەهۆی جەنگی جیهانیی یەکەمەوە رابچڵەکێت، کەوتە بەرچاو. جەنگ نەهامەتییەکی گەورەبوو بەسەر فەرەنساو بەلجیکادا هات، بەشی زۆری جەنگەکان لەوێدا ئەنجامدران، هەروەها

کاریگەریی خۆیشی لەسەر ژیانی تایبەتیی دۆرکهاییمیش جێهێشت، هەروەك چۆن کاری کردە سەر ژیانی زۆرێکی تریش. ئەو کە باوەڕی وابوو، پێویستە لێکۆڵەرەوەکان پارێزگاری لە بابەتێتی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بکەن، بەوەی خۆیان لابدەن لە روداوە ئێستاییەکان، بەڵام لە کاتی جەنگدا، لەوە لایداو، بە توڕەیی باسی لە کێشەی فەرەنسا دژی ئەڵمانیا دەکرد. پاشان لە سەرەتای ساڵی *1916*دا، هەواڵی زانی ئەندرێ، کوڕە تاقانەکەی ، کە مژدەی لێکۆڵەرێکی باشی پێبوو، لە سیبریا لە پێکداکێشانێکی سەربازییدا کوژراوە. دۆرکهاییم بە تێکشکاویی و مەینەتباریی، لەسەر نوسین و کارکردن بەردەوام بوو، تەنیا بۆئەوەی چەند مانگێك دواتر بڕستی لێبڕێت. ساڵێك دواتر، واتە لە ساڵی *1917*دا، لە تەمەنێکی لاوی پەنجاونۆ ساڵیدا، دەمرێت.

## ئایدیاو کاریگەرییەکان

بایەخدانی زۆری دۆرکهاییم بە کۆمەڵگا، شتێك نەبوو کە لەپڕێکداو لە خۆیەوە خوڵقابێت. رەنگە ئەو یەکەمین کەس بێت بیخاتە روو، بەڵام لەپێش ئەودا چەند بیریارێکی تری فەرەنسیش لەو چەشنە بایەخدانەیان هەبووە، دەشێت ئایدیاکانی دۆرکهاییم بە پەرەپێدراوی ئایدیاکانی ئەوان دابنرێت[6]. یەکێك لەو وتارە درێژانە لەلایەن بارۆن دی مۆنتسکیۆ گەورە فەیلەسوفی فەرەنسا لە سەدەی هەژدەدا، نوسرابوو. کە بە وردیی چاودێریی کەلتوری ئەوروپایی و دامەزراوە سیاسییەکانی کردبوو، هەروەها شی کردبوونەوە. کاری مۆنتسکیۆ دەری دەخات کە دەتوانرێت بونیادە کۆمەڵایەتییەکان لە رێگای مۆدێلێکی زانستییەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. دۆرکهاییم نوسینەکانی کۆمت دی سان سیمۆنیشی خوێندۆتەوە، کە بیریارێکی سوسیالیستی سەرەتای ساڵانی *1800* بوو، کە بڕوای وابوو کە پێویستە هەموو ئیمتیازەکان بەدەستی دەوڵەتەوە بن. هەروەها لەلایەنی فەیلەسوفی نێوداری سەدەی نۆزدەیەمی فەرەنساوە زۆر کاری تێکرا، واتە ئۆگست کۆمت، کە ئەمیان تا رادەیەك وەکو تایلۆرو فرێزەر، نمونەیەکی مەزنی دەربارەی ژیار پێشکەش کردووە. لەم هێڵکارییەدا، قۆناغەکانی پێشووتری بیرکردنەوەی مرۆڤ، کە سەرەتا تیۆلۆجیا بەڕێوەی دەبردو پاشانیش، ئایدیا پەتییەکانی فەیلەسوفان، تا دواجار ئەم سەردەمە پۆسیتیڤ، یان زانستیی، یاخود، بیریارەی ئێستا جێی دەگرێتەوە، کە لێرەدا لێکۆڵینەوە تەنیا بەهۆی پشکنینی ئەو فاکتانەوە دەبێت کە کلیلی هەموو زانستەکانمان پێشکەش دەکەن. لەم ماوەیەی ئێستای زانستدا، ئاینێکی تازە" ئاینی مرۆڤایەتی" جێگای ئەو ئاینانەی گرتۆتەوە کە قابیلی بڕوا پێکردن نین، لەگەڵ فەیلەسوفەکانی رابردووشدا. دۆرکهاییم لە کۆمتەوە فێری ئەوەبوو کە مرۆڤ پێویستییەکی زۆری هەیە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و، شیکردنەوەیەکی قووڵی زانستییانەی دیاردەی کۆمەڵ، گەرچی ئەم رێگایەکی یەکجار سەختی بۆخۆی دیاری کرد بۆ سەرنجدانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی.

لەپاڵ ئەم ئاماژە زووانەشدا، پێویستە دوان لە هەرە دیارترینی بیریارەکانی فەرەنسا لەیاد نەکەین کە لە سەردەمی لاویی دۆرکهاییمدا دەرکەوتبوون: رەخنەگری مەزنی ئینجیلیی، ئێرنست رینان، کە بایەخێکی زۆری دەدا بە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی لە هەردوو ئاینی جولەکەو مەسیحییداو، هەروەها یەکێکیش لە مامۆستاکانی زانکۆ لە پەیمانگای باڵای مامۆستایان، دیارییەکی زۆر نائاسایی بوو بۆ دۆرکهاییم، مێژوونوسێکی کلاسیکیی بوو، ناوی نۆما دینیس فوستێل دی کۆلانگێس بوو، کە کتێبە کاریگەرەکەی "شارە دێرینەکە . *1864* " بوو بە لێکۆڵینەوەیەکی کلاسیکی ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی دێریندا. لەم کارە سەرنجراکێشەدا، کۆلانگێس شیکردنەوەیەکی زۆر نزیکی ژیانی شارە یۆنانی و رۆمانییەکانی بۆ خوێنەرانی کردووە بە دیاریی، کە نەك تەنیا ئەوەی پیشانداوە کە چۆن ژیانی ئاسایی بەڕێوە دەچێت، بە پێشاندانی نەریت و رۆتینی ئاکارێکی پارێزگار، بەڵکو پیشانی داوە کە ئەم نەریت و رۆتینانە، ئاوێتەی باوەڕەکانی ئاینە فرەیەزدانییەکان کراون.

دۆرکهاییم بە شێوەیەکی سروشتی لەسەر ئایدیاکانی ئەم بیریارانەوە، بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆی بیناکرد.[7] بەڵام بارودۆخی ژیانی مۆدرێنی فەرەنسا شتێکی تریشی گرتبووە خۆی. وەکو زۆرینە دەیزانن لە کۆتایی ساڵی *1800*ەکاندا، فەرەنساو ئەوروپا بە دوو شۆڕشی گەورەدا تێپەڕیون. یەکێکیان ئابوریی بوو: شۆڕشی پیشەسازیی، ئەویتریشیان سیاسیی بوو: شۆڕشی فەرەنسی و شەش حەوت میراتگرەکەی. لە تێڕوانینی دۆرکهاییمدا، بەیەکگەیشتنی کاریگەری ئەم دوو ساتە دەبێتە هۆی پەرەپێدانی گۆڕانکارییەکی هەمیشەیی لە مۆدێلی ژیانی ژیاری خۆراواییدا. ئەوروپا ماوەیەکی زۆر بە سەقامگیری شانی دادابووە سەر کشتوکاڵەکەی، چینە کۆمەڵایەتییە باش پێناسەکراوەکانی، خاوەندارێتییەکەی بۆ هەریەکە لە ئەریستۆکراسییەکان و حکومەتی پادشایەتی، لەگەڵ کۆمەڵگایەکی بنچینەییدا، کە شارو گوندەکانی پێکەوە گرێ دەدات، لەگەڵ راستییەکان و دابودەستورەکان، بونیادەکانی کەنیسەی مەسیحییدا. لە ئاکامی دوو شۆڕشەکەدا، ئەم بنەما چەسپاوانەی کەلتوری خۆراوایی، خۆیان بینیەوە تووشی راچەنینێکی وەها بوون کە هەرگیز پێشتر تووشی نەهاتبوون و بە رێگایەکدا وەرچەرخێنران کە ئیتر هەرگیز وەك ئەوسای لێنایەتەوە، لە ناوەوەو دەوروبەریشیاندا، چەشنە ژیارێکی نوێ دەستی کرد بە گەشەکردن، کە خەڵکەکەی خۆی بینیەوە روو دەکەنە کارگەو شارەکان، لە لۆردە خاوەن نازناوەکانەوە بەرەو بازرگانە سەرچڵەکان، دەسەڵاتەکەی لە چینە خاوەن ئیمتیازەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ جوڵانەوە رادیکاڵەکان یان مەسەلە میللییەکان، هەروەها ئاینەکەشی لە هەموو شوێنێکدا رووبەڕووی مشتومڕو جیاوازیی، یاخود باوەڕنەهێنانی کراوە بووەوە. بە چەند زاراوەیەکی دیاریکراو، دۆرکهاییم بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنجی ئەم چوار مەیلە یان نمونەیەی دا:

. لـە جێگـای سیسـتمە كۆمەڵایەتییـە كۆنەكـەی ئـەوروپا، پێكـەوە كەوتنـە كـار، وەك ئـەوەی پەیوەستەكانی خێزان، كۆمەڵگا، هەروەها باوەڕی ئـاینییش بـن، پـەیمانێكی نـوێ دەردەكـەوت، كـە تێیدا سودی تایبـەتی و پـەیوەندیی سوودمەندیی دراویی بڵاوبوونەوە.

. لـە جیـهانی ئاكـارو رەفتـاردا، ئـەو بـەها پیرۆزانـەی كـە رۆژێـك لـە رۆژان لەلایـەنی كەنیسـەوە سـەلمێنراون، ئێسـتاكەش لەلایـەنی ئایدیـای تـازەترەوە كێبـەركێیان دەكرێت، جەخت دەكەنە سەر عەقڵ نەك باوەڕی ئاینی، هەروەها ئارەزووی كامەرانیی ئەم ژیانە دەكـەن، لـە سـەرووی هـەموو هیوایەكـەوە بـە بەهەشـت (یـاخود ترسـان لـەدۆزەخ) لـە ژیـانێكی تردا بەڕێوە بێت.

. لـە پانتـایی سیاسـەتدا، دەركـەوتنی جـەماوەرە دیموكراسـییەكان لـە بنكـەی كۆمـەڵگاوە، لەگـەڵ حكومەتێكی بە دەستەڵاتی مەركەزیی لە لوتكەدا، سروشتی كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتیان گۆڕیوە. تاكەكان خۆیان بینییەوە لە مامۆستا ئاكارییەكانی كۆنیان جیادەبنـەوە . خێزان، گونـد، هـەروەها كەنیسـەش جێـهێڵراون بۆئـەوەی رێنماییـەك لـەناو پـارتێكی سیاسییدا، جولانەوەیەكی جەماوەرییدا، هەروەها دەوڵەتدا، بدۆزنەوە.

. لـە روبـەری كاروبـاری تایبـەتییدا، سەربەسـتیە نوێیەكـەی تاكـەكان، لـە چوارچێـوە كۆنەكـەیانی جیاكردنـەوەو هـەڵی گـەورەو سـەرچڵیی گـەورەی پێبەخشـین. لـەپاڵ ئەویشـدا فرسـەتی خۆشـگوزەرانی زیـاترو، بەدەسـتهێنانی خودیـش زیـادی كـرد، لەگـەڵ هەسـتكردنێكی سـەخت بـە تەنیایی و گۆشەگیریشدا.

## سۆسیۆلۆجیا و كۆمەڵگا

دۆركـهاییم بـە روانـین لـەم گۆڕانكاریـە مەزنانەوە، هەستی كرد كە تاقە یەك رێگا هەیە بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی باش لێیان نزیك ببێتەوە. بە تـەنیا سۆسـیۆلۆجیایەكی پڕاوپـڕ زانسـتیی دەتوانێـت یـاریدەی خـەڵك بـدات بـۆ تێگەیشـتنی راچەنینـەكانی ئەوجیهانـەی كـە لـەژێر پێیانـەوە دەلەرزییـەوە، بۆیـە دوو پرەنسـیپی بنـەڕەتی و كامڵی بۆ لێكۆڵینەوەكانی خۆی دیاریكرد:

*1.* سروشتی كۆمەڵگا باشترین و مژدەترین بابەتە بۆ لێكۆڵینەوەیـەكی سیسـتماتیكیی، بـە تایبـەتی لەم ساتەوەختەی ئێستای مێژوودا، هەروەها..

*2.* كـە پێویسـتە هـەموو ئـەو چەشـنە حەقیقەتـە كۆمەڵایەتییانە، بە گونجاوترین میتۆدی زانستیی بەردەست لێیان بكۆڵرێتەوە.

## سروشتی كۆمەڵگا

لـە دابەشـكردنی كـاردا، یەكـەمین كتێبـی سـەرەكیی خـۆی، دۆركـهاییم پیشـانی دەدات كـە چەند بە سانایی مرۆڤ دەتوانێت بە هەڵەدا بچێت بە خۆگێلكردن لە پرەنسیپی یەكەمیان. ئەو روونی دەكاتـەوە كـە ژیـانی كۆمەڵایـەتی، زوربـەی شـتە بنەڕەتییەكانی نـاو كـەلتوری مرۆڤی رسـكاندووە، بەڵام ئەمە ئەوە نیە كە چۆن بیریارەكانی پێشووتر هەوڵیان داوە بیبینن. ئەگەر ئەوان بە هەرشێوەیەك

بایەخیان پێدابێت، ئەوان ئەوەیان وەکو چەشنە پاش بیرکردنەوەیەك کردووە. کاتێك ئەوان روانیانە رابردوو، پێشنیاری ئایدیاکانیان کردووە وەکو "پەیمانێکی کۆمەڵایەتی" کە ئەو کۆمەڵگایە کاتێك بەرپار کراوە کە دوو تاك بۆ یەکەمین جار رێکەوتن لەسەر ئەوەی یاریدەی یەکتریی بدەن. یەکێکیان وتی" من ئەمە دەکەم ئەگەر تۆ ئەوە بکەیت" ئەوەی تریش رازیی بوو، بەمەش کۆمەڵگا لەدایك بوو. دۆرکهاییم دەڵێت، ئەم چەشنە کۆمەڵگایانە، چەندان کردەوەی دڵگیر لە چیرۆکی ئەندێشە ئامێزدا پێشکەش دەکات، بەڵام مێژووی راستەقینەی مرۆڤایەتی هەرگیز وانەبووە. تەنانەت لە کاتەکانی پێش مێژووشدا، هەردەم تاکەکان لەناو گرووپدا لەدایك بوون، لە ناو خێزانەکان و تیرەکان و هۆزەکان و نەتەوەکاندا ، هەر لەو نێوەندەشدا پەروەردە بوون. زمانەکانیان، خووەکانیان، باوەڕەکانیان، لەگەڵ کاردانەوە سۆزییەکانیاندا، تەنانەت ئەو چەمکە زۆر تایبەتیەی دەربارەی خودی خۆشیان هەیانبووە. هەردەم لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتییەوە هاتووە، کە ئامادەیی هەبووە بۆئەوەی هەر لە ساتی یەکەمیانەوە لە جیهاندا، مشتومالیان بکات و شێوەیان پێ ببەخشێت. بۆنمونە پێویست بووە بە سوێندێکی پیرۆزی ئاینیی سوێند لەسەر پەیمانە دێرینەکان بخورێت، کە پیشانی دەدا ئەو چەشنە رێکەوتنە بەتەنیا مەسەلەی رێکەوتنی نێوانی دوو لایەن نەبووە، بەڵکو لەلایەنی خوداکانەوە پێیان کراوە، چونکە سەراپای کۆمەڵگا سوودی لە ئاکامەکان وەرگرتووەو، لە قازانجی موڵکایەتی تایبەتیشدا بووە. هەر لەبەر ئەمە دەبێت بە شێوەیەکی تاکانە پەرەی سەندبێت. بیرکردنەوەی دێرینە پێی وابووە کە ئایدیای مافی تاکەکەس بۆئەوەی خاوەنی شتێك بێت، یاخود پارچە زەوییەکی هەبێت، لەوەوە هاتووە کە دەشێت ئەو شتانە وەکو درێژبوونەوەی خودی تاکەکە بێت. بەڵام دۆرکهاییم دیسانەوە رادەگەیەنێت، کە حەقیقەتەکانی مێژوو شتێکی ترمان پیشان دەدەن. یەکەمین خاوەندارێتی، تاکانە نەبووە، بەڵکو هی هەمووان بووە، لەگەڵ ئەو زەمینە پیرۆزەدا دەست پێدەکات کە خەڵکانی زوو وەکو کەلوپەل بوونیان هەبووە نەك وەکو قەشە یاخود هەرجۆرێکی تری تاکەکەس، بەڵکو هی هەموو خێڵەکە بوون. ئەم حوکمە باوانە ئایدیاکانی سەرەتایان لەمەڕ موڵکی تایبەت و خاوەندارێتی دارشتووە. تەنیا بەپێی تەسەوری مافە میللییەکان، شتەکان لەلایەنی هەمووانەوە هەڵدەگیرانەوەو هەمووان خاوەنیان دەبوون. شتەکان بەلای تەواوی هۆزەکەوە پیرۆزن. کەلتورەکان پەرەیان دا بە ئایدیای ئەوەی شتێك ببێتە موڵکایەتی کەسێك بەتەنیا، یاخود هی چەند کەسێك بێت بەیەکەوە.

کەواتە، هەردەم هاریکاریی کۆمەڵایەتی شتێکی بەرایی بووە. ئەم بونیادە بنەڕەتییانە دەربارەی ژیان لە وێنەی لێپرسراوێتی ئاکاریی و خاوەندارێتی کردنی موڵکی تایبەتی، لە هەستێکی دیاریکراوی گرووپەوە سەری هەڵداوە. دۆرکهاییم سەرنج دەدات، کە وتراوە جیاوازیی سەرەکیی لە نێوانی کۆمەڵگا دێرین و

مۆدێرنەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێگایانەی کە لێیانەوە هەوڵ دەدەن یەکێتییەکەی خۆیان ئەنجام بدەن. بۆ نمونە، لێکۆڵینەوەی کۆدە یاساییەکان دەری دەخات کە کۆمەڵگا زووەکان پشتیان بە هاریکارییەکی "میکانیکی" بەستووە. بەهۆی سزادانەوە ڕەفتاری باش زامن کراوە (کە بەزۆری ئەشکەنجەدان بووە) بۆ ئەوکەسانەی کە کۆدە ئاکارییەکانی گرووپەکە دەشکێنن. ئەمە بریتیە لە ناچارکردنی دەرەکیی. لەلایەکی تریشەوە، لە سەردەمە زیاتر مۆدێرنەکاندا، مۆدێلێکی جیاوازی هاریکاریی ئۆرگانیی خراوەتە گەڕ. چونکە دابەشکردنی کار هاتۆتە کایەوە، چونکە خەڵکە جیاوازەکان دەتوانن شتی جیاواز بکەن، هەستی پەیمانی هاریکاریی بە شێوەیەکی تر پەرە دەسێنێت. ئەوە بە تەنیا لەر ێگای ترسان لە سزادانەوە نایەت، بەڵکو لەو پێویستییەوە کە هەر تاکێك پێویستی بە کاری ئەوانی تر دەبێت. لێرەدا پێویستە ناچارکردنەکە ببێت بە شتێکی ناوەکی. پێویستە کردەوەیەك لەلایەنی هەر تاکێکەوە، بە وێرانکردنی ئەوانەی تر لەقەڵەم بدرێت، کە ئەم پشتیان پێدەبەستێت. کۆمەڵگا دێرینەکانیش "هەستێکی بەکۆمەڵی" بەهێزیان لەناو خۆیاندا هەبووە، ڕێکەوتنێکی بڵاو هەبوە لەسەرئەوەی چی دروستە و چی هەڵەیە، لە نزیکەی هەموو ئەو شتانەدا کە مرۆڤ دەیانکات. کۆمەڵگا مۆدێرنەکانیش کە جیاواز لەمان، بە ئاکاری تاکایەتی نیشانە کراون، هێشتا هەر پێویستیان بە دامەزراندنی چەند ڕێسایەکی باوی ئاکاریی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوانە ڕێگا دەدەن بە جیاوازییەکی تاکانەی زۆرترو سەربەستییەکی تایبەتی زیاتر، ئەوا هەستی دەستەجەمییان مەودایەکی تەسکتری هەیە کورت کراوەتەوە بۆ چەند فەرمان و پەیمانێکی کەم، نەك زۆر.

ئەم ڕاستیەی دوایی بە شێوەیەکی تایبەتی دەردەکەوێت چونکە دۆرکهاییم بە مکومیی باوەڕی بەوەیە کە ئاکارێتی، پەیمانی هەریەکە بەرامبەری ئەوانیترو هەموانیش بۆئەوەی لەناو گرووپدا بمێننەوە، شتێکە لە ئایین جودا ناکرێتەوە. لەوەش زیاتر، وەك تۆزێکی تر دەیبینین، هەردوو ئایین و ئاکار لەچوارچێوەی کۆمەڵایەتی جودا نابنەوە. بەبێ ناواخنێکی کۆمەڵایەتی هیچیانمان هەبێت، هەروەها بە گۆڕانی ئەو ناواخنە، ئەوانیش دەگۆڕێن. کەواتە، وەك بەشێوەیەکی تایبەتی لە ژیاری خۆراواییدا ڕوویداوە، کۆمەڵگا دەسبەرداری هەستی دەستەجەمیی دەبێت، ئەو لە زۆربەی کاتە بەراییەکانداو لە تویّی دابەشکردنی کارەوە، بە ئاکارێتی سیستمی تاکایەتی جێگای گرتۆتەوە، وەکو ئەوەی ئێستامان، پێوستە سەرمان سوڕ نەمێنێت کە ببینین ئایین و ئاکار پێکەوە وەکو باقی شتەکانی تری کۆمەڵگا گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە.[8]

## لێکۆڵینەوەی زانستییانەی کۆمەڵگا

دووەمین پرەنسیپی تۆژینەوەی دۆرکهاییم لە کتێبی یاساکانی میتۆدی سۆسیۆلۆجیدا ـ *1895* پەرەی پێدراوە، لەوێدا ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن چۆنی پێویستە سۆسیۆلۆجیا وەکو زانستێکی

سەربەخۆی بابەتیانە تێبکۆشێت[9]. لە فەرەنسا، زۆرکەس ئاگاداری ئەو شیکردنەوە ناوازانە بوون کە لەلایەنی مۆنتسکیۆ، ئەلیکسی دی تۆکڤیل و ئۆگست کۆمتەوە، ئەنجام درابوون، ئەوانە لە شێوازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی تەقلیدیدا، نوسینی سەرنجڕاکێش و دیار بوون. کاتێك دۆرکهاییم بەهۆی ئەوانەوە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە زانستەکەی خۆی لەمەڕ کۆمەڵگا، بەتەواوی شتێکی دیکەیە، خەڵکانی ژێر بە شێوەیەکی سروشتی پرسیان: چ جۆرە شتێکی دیکە؟ چۆن دەشێت زانستێکی ئاوا ئەبستراکت دەربارەی مەسەلەی کۆمەڵایەتی هەبێت، دەربارەی شتێك کە ئێمە لە راستیدا ناتوانین بیبینین یان دەستی لێ بدەین، بەو رێگایەی کە کیمیاگەرێك یان رووەکناسێك دەتوانێت لە سروشتێکی بینراوی بەرجەستە بکۆڵێتەوە؟ وەڵامەکەی دۆرکهاییم بریتی بوو لەوەی بەو شێوەیە بیر لە سۆسیۆلۆجیا بکەینەوە، کە لەوە دەچێت کە تایلۆرو ئەنترۆپۆلۆجیستە ئینگلیزەکان کردوویانە کاتێك بیریان لە کەلتوور کردۆتەوە، بەڵکو لەوەش دورتر بڕۆین. ئەو جەختی کرد کە فاکتە کۆمەڵایەتییەکان، لە خرکەبەرد یاخود سەدەفی دەریا کەمتر شتی راستەقینە نین، ئەوانیش بە رێگای خۆیان وەکو ئەمان بەرجەستەو فیزیایین. کۆمەڵگا بەتەنیا بریتی نییە لە بیرێکی راگوزەر بەناو کەللەی کەسێکدا، بەڵکو بریتییە لە جەستەیەکی کۆکراوە لە فاکتەکانی زمان، یاساکان، دابونەریتەکان، ئایدیاکان، بەهاکان، خووەکان، تەکنیکەکان، هەروەها بەرهەمی هەموو ئەوانەی کە پێکەوە بەستراون و بە شێوەیەکی تەواو دەرەکی بونیان هەیە بە نیسبەتی عەقڵی تاکەکانی مرۆڤەوە. ئەوانە لە جیهاندان پێش ئەوەی ئێمە تاك بگەینە جێ، لە ساتی لەدایکبوونماندا، ئێمە لە منداڵییەوە گەشە دەکەین و ئەوانیش خۆیان بەسەرماندا دەسەپێنن، لە گەورەیماندا، وەگەڕمان دەخەن و رێنماییمان دەکەن، هەروەها بە دڵنیاییی لە مردنیشماندا ئەوان دەمێننەوە. لەوەش زیاتر، ئەوە شتێکی عەقڵییە کە ئەگەر بە راستی ئەم چەشنە فاکتە کۆمەڵایەتییە سەربەخۆو راستەقینانە دەورەی ئێمەیان دابێت، ئەوا پێویستە دیسپلینێکی زانستییانەی تایبەتی تەرخان بێت بۆ لێکۆڵینەوەیان. ئێمە ئەندێشەی ئەوە ناکەین کە دەتوانین تەنیا لە تویێی فیزیا یان کیمیاوە ئۆرگانێکی زیندوو لێك بدەینەوە، ئێمە پێویستیشمان بە بایۆلۆجیا هەیە. بەهەمان شێوە، ئێمە ناتوانین کۆمەڵگا لێکبدەینەوە ئەگەر بە تەنیا بڕوانینە بایۆلۆجیا یاخود سایکۆلۆجیا تەنانەت ئابورییش. کۆمەڵگا پێویستی بەکۆمەڵناسیی هەیە، دیسپلینەکانی تر گونجاو نین.

> **ئێمە ناتوانین کۆمەڵگا لێکبدەینەوە ئەگەر بەتەنیا بڕوانینە بایۆلۆجیا یاخود سایکۆلۆجیا، یان تەنانەت ئابورییش. کۆمەڵگا پێویستی بە کۆمەڵناسیی هەیە**

لای دۆرکهاییم هیچ یەکێك لەوانە میتۆدی ڕاستەقینەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسییانە نین و ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوەیەکی دراماتیکی جیاوازە لەو زانستانەی دیکە. کلیلی هەر زانستێك، فیزیایی یان کۆمەڵایەتی، بریتیە لە گەڕان بەدوای بەڵگەدا، بە بەراوردکردن، پۆلاندن بۆ گرووپەکان، دواجاریش مشتومالْ کردنی پرەنسیپە گشتییەکان، یاخود یاساکان، بە ڕێگایەك دەتوانرێت بۆ لێهاتووییان تاقی بکرێنەوە. لەم پەیوەستکردنەدا، سۆسیۆلۆجیا نەك تەنیا ئەوە دەکات کە زانستەکانی تریش دەیکەن، بەڵکو بە ڕێگایەك لە ڕێگاکان هیوای ئەوەی لێدەکرێت باشتریش بیکات. بۆ نمونە، دۆرکهاییم بە تەنگەوەیە کە خۆی لەو میتۆدە بەراوردکارییە نێودارە جویْ بکاتەوە، کە لەلایەنی تایلۆرو فرێزەرو ئەنترۆپۆلۆجیستە بەریتانیە ڤیکتۆرییەکانی تر ئیشیان پێکردووە. ئێمە بینیمان کە چۆن ئەوان لە پشکنینەکانی خۆیاندا بۆ مۆدێلی لێوەشاوە، خۆیان ڕێکخست بە سەرانسەری جیهاندا بگەڕێن، دابونەریتەکان یان ئایدیاکانیان هەڵدەبژارد، کە دەشێت بیانخەنە ناو خشتەیەکی گشتییەوە، لە نمونەی "ئەفسونی لاسایکەرەوە" لەگەڵ بایەخدانێکی کەم یان هەر بایەخ نەدان بە دەوروپشتەکەی. ئەم پشکنینە مکومە بەدوای فاکتەکاندا، لە سەردەم و کۆتاییە نادیارەکانی جیهاندا، کە بۆ کتێبێکی قەبەو سەرنج ڕاکێشی وەکو چڵی زێڕین ئەنجامدراوە، لە تێڕوانینی دۆرکهاییمدا زانست نییە چونکە هەموو شتێك لەسەر ڕووتەختی هاوشێوەیی ڕیز دەکات و بە دەگمەن بایەخ بە کرۆك دەدات. سۆسیۆلۆجیا زۆر لەمە وریاترە. ئەو دەزانێت کە تەنیا ئەگەر دوو دانە کۆمەڵگا زۆر لە نزیکەوە بپشکنرێن و وا بێتە بەرچاو کە بە ڕوونی لەگەڵ تەرزێکی باودا ڕێك دەبنەوە، ئینجا دەشێت بەراوردکاریی بکرێت و، یاسا گشتییەکان هەڵبهێنجرێن.

بۆیە لێرەدا ناتوانین بە دوورودرێژیی دوای حیساباتەکەی ئەو بکەوین لەمەڕ میتۆدە سۆسیۆلۆجییەکان، دەتوانین بە کورتی چەند سەرنجێك دەربارەی ئەو وتانە تۆمار بکەین کە دۆرکهاییم بەکاریان دەهێنێت لە دەستبردنیدا بۆ ئایین. ئەو باوەڕی وایە کە دەتوانین، لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەفتارە ئاساییەکان و ڕەفتارە پاتۆلۆجییەکان، یاخود نائاساییەکان دیاری بکەین[10]. بە دڵنیایی ئەمە مەسەلەی بەها ڕەهاکان نییە، ئەوانەی کە لە هەموو کات و شوێنێکدا چاکن یان خراپن. هەمیشە ئاسایی لەناو گرووپێکدا دیاریی دەکرێت، هەرگیز لە دەرەوە دیاریی ناکرێت. بۆ نمونە خۆکوشتن، بەلای هەندێك کۆمەڵگای وەك یابانەوە، لەچاو کۆمەڵگاکانی تردا، زۆر ئاساییە. فرەژنی بۆ کۆمەڵگا بەراییەکان زۆر ئاساییترە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. پێویستە هەمیشە لەناو کۆمەڵایەتییدا بڕیار لەسەر ئاسایی بدەین. لەوەش زیاتر، بەلای دۆرکهاییمەوە چەشنی وەزیفە لەناو کۆمەڵگایەکدا، زۆر بایەخدارە بۆ ڕاڤەکردنی ڕەفتار، جا چ وەزیفەی ئاسایی بێت یان نائاسایی، بۆیە پێویستە لە ئایدیای هۆکار جیابکرێتەوە. ڕەنگە هۆی ژیانەوەی ئاینێکی شاریی بریتی بێت

لــەو مەراســیمانەی کــە واعــیزێك لەبــەردەمی فرۆشـــگەیەکدا ئـــەنجامیان دەدات، بـــەڵام زیندووکردنـەوەی وەزیفەیـەکی کۆمەڵایـەتی بگاتـە ئاستێك کە ئەوانەی پەیوەندی پێوە دەکەن خۆیـان تێبینی نەکـەن[11]. سۆسیۆلۆجیسـت دەتوانێـت لـە ژمـارەی گوناهبـارە وێناکراوەکانــەوە نەڕوانێتــە سەرکەوتوویی واعیزەکە، بەڵکو لە شتێکی ترەوە کە بەتەوایی لەلایەنی ئەوانەوە کە لە نوێژەکانیاندا دەپارێنـەوە، شـتێکی نادیـارو تێبینـی نـەکراوە: روداوەکــە وەکــو گشــت لــە هەســتی کۆمــەڵدا پارێزراوە، لە شوناس و مەبەستەکەیدا، بەرەو تاکە بێچـارەو دابڕاوەکـان، ئەوانـــەی کـــە هێشـــتا نەکەوتوونەتە ناو وەهمەکەوە.

دەتوانـین لـــە لێکۆڵینـــەوە نێودارەکــــەی دۆرکـــهاییمدا دەربـــارەی خۆکوشـــتن (*1895*) نمونەیـەکی بـاش بـۆ ئـەو تێزانـە بدۆزینـەوە، کـە زۆری نەخایاند دوای یاساکان بڵاوکرایەوە. دوای بەراوردکردن و بـەراوردکردنێکی وردی ڕێژەکـانی خۆکوشـتن لـە وڵاتـە سـەرەکییەکانی ئـەوروپادا، دۆرکـهاییم تێبینـی دەکـات کـە ڕێژەکـە لـە وڵاتـە پرۆتســـتانتەکاندا بـــەرزترەو، لـــە وڵاتـــە کاســـۆلیکەکاندا نزمـــترە، لـــەو وڵاتانەشـــدا کـــە جـەماوەرێکی ئـاینیی تێکـەڵاویان هەیـە، ڕێژەکـە دەکەوێتـە ناوەڕاسـتەوە.[12] لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ڕێژانەدا، شتێکی شیاو کە بڵێین چەشنێکی دیاری خۆکوشـتن کـە دۆرکـهاییم بـە خودپەرسـت نـاوی دەبـات، زۆر ئاسـاییە . ئەمــەش بــە شـێوەیەکی تایبـەتیتر بۆ وڵاتـە پرۆتسـتانتەکان راسـتە لـەچاو کاســۆلیکەکاندا. دەڵێــت، ئێمــە نــاتوانین بــە

شێوەیەکی راستەوخۆ لە لێکۆڵینـەوەی سیسـتمە ئاینییەکانـەوە حیسـاب بۆ ئـەم بارودۆخـە بکـەین، چونکە هـەردوو گرووپەکە پێیـان وایـە خۆکوشـتن هەڵەیــــە. هــــەرچۆنێك بێــــت، لــــە ڕووی سۆسیۆلۆجییەوە، چەند سنورو جیاوازییەکیان لە نێوانـدا هەیـە. لـە کۆمـەڵگا پرۆتسـتانتەکاندا، تاکـەکان ئازادییـەکی زیاتریـان هەیـە لـە ژیـان و بیرکردنـەوەدا، لـەوێدا، خـەڵکی زیـاتر خـەریکی خۆیـانن لـەپێش ئـەوەوە خـەریکی یـەزدان بـن. کاسـۆلیکیش بـە پێچەوانـەوە، دەگەڕێنـەوە بـۆ کۆمەڵگایـەکی کۆمەڵایـەتی تۆکمـەتر، کـە لـەوێدا پیـاوی ئـایین دەبێـت بـە نێوەندێـك لـە نێوانـی یـــەزدان و بـــاوەڕداو، پـــەیوەندیی نێوانـــی ئەبرەشـییەکان پتـەوە. بۆیـە وا دەردەکـەوێت کـە ڕێژەی خۆکوشتن لە کۆمەڵگایەکداو بە شێوەیەکی نەرێ وابەستەی پلەی یەکگرتوویی کۆمەڵگاکەیە. هـەتا پەیوەسـتە کۆمەڵایەتییـەکان توندوتۆڵـتر بـن، ڕێژەی خۆکوشتن نزمتر دەبێتـەوە. لـەوەش زیـاتر، لێك جیاکردنـەوەی هـۆو وەزیفـەش پەیوەندییـەکی بـەتینی پێـوەی هەیـە. وا دیـارە نمونەیـەکی هاوشـێوەی ئەمـە بـۆ چەشـنێکی تـری خۆکوشـتن هەیـە، کـە دۆرکـهاییم پێـی دەڵێـت ئـانۆمیك (لـە وشەی یۆنانیی ئانۆمیاوە کە بە مانای بێ یاسایی دێـت) بـۆ گوزارشـتکردن لـە هەسـتی بـێ پلـەو پایـەیی و بێ مەبەست، کە بە زۆریی لە ئـەنجامی ناســـەقامگیریی کۆمەڵایـــەتی و ئـــابورییدا، دەردەکـــەوێت. کەواتـــە، بـــە نیســـبەتی سۆسیۆلۆجیســـتێکی لێـــهاتووەوە، دیـــاردەی خۆکوشـتن بـە شـێوەیەکی زۆر جیـاوازتر ڕوون

دەبێتەوە، لەچاو ئەوەیاندا كە بە چاوێكی ئاسایی بۆی دەڕوانێت.

## سیاسەت، كەلتور، ئاكار

دۆركهاییم هەستی بەوەكرد كە تێڕوانینە سۆسیۆلۆجییانەكەی، تیژبینییەكی تایبەتی پێشكەش دەكات بۆ ناواخنی سیستەمە سیاسییەكان، كەلتور، ئاكار، هەروەها بەتایبەتیش ئایین. لە بازنەی فەلسەفەی سیاسییدا، چەند وانەیەكی دەربارەی سوسیالیزم و كۆمۆنیزم وتەوە، هەردوكیانی بەوە وەسف كرد كە دەگەڕێنەوە بۆ ناسەقامگیریی ژیانی هاوچەرخ، بەڵام ئایدیاكانی ئەوانی دەربارەی خەباتی چینایەتی و تیورییەكانیانی دەربارەی دەوڵەتێكی بەهێز، ڕەت دەكردەوە[13]. لە چەند وانەیەكی تریدا، بە تایبەتی (*professional Ethics and civic Morals*) كە لەدوای مردنی چاپكرا، ئەو تێبینی كرد كە پێویستە دەوڵەت دەسەڵاتی بەرینی هەبێت، كە دەشێت بۆ ژیانی تاكەكان بەكەڵك بێت. هەر لە هەمان كاتیشدا، جەختی كرد لەسەر گرنگی ئەوەی كە خۆی پێی وت گروپە نێوەندیەكان، لە وێنەی برایەتی لوكاڵ و دامەزراوە پیشەییەكان، بۆئەوەی یاریدەی پاراستنی مافەكان و خۆشگوزەرانیی تاكەكان بدەن، بەوەی حكومەتی نیشتمانیی زۆر بەهێز ببێت. كلیلی ئەركەكانی دەوڵەت بریتیە لە پێشخستنی ڕێژەكانی ئاكار، كە ئەوەشە هۆی ئەوەی بۆچی دەبێت دەوڵەت ڕۆڵێكی سەنتەریی ببینێت لە سیستەمی پەروەردەی كۆمەڵگادا. دۆركهاییم چەندان جار باسی ئەم بابەتەی كردووە، لەناو كارەكانی تریدا دوو بەرگ دەربارەی مێژووی پەروەردەی نوسیوە لەفەرەنسادا[14]. هەروەك خۆی باسی دەكات، مەبەستی قوتابخانەكان بەتەنیا بریتی نییە لە دادانی مەشقێكی تەكنیكی دەربارەی چەند پسپۆڕییەكی دیاریكراو، بەڵكو ئەوەشە كە بەهاكانی خود دیسپلین كردن و خزمەتكردنی كۆمەڵ بگەیەنێتە قوتابی، هەروەها بۆئەوەی رایان بێنن لەسەر زۆر بایەخنەدان بەسوودە خودییە تەسكەكانی تاك. ئەم دەرس و دەورە دەربارەی بەها ئاكارییەكان شتێكی ڕەفاهیی یان ئیختیاریی نییە، بەڵكو پێویستە بۆ تەندروستیی و كاركردنی هارمۆنییانەی هەر كۆمەڵگایەك. ئەو بۆچوونانە، كە كاریگەرییەكی بەرچاویان هەبووە لەسەر تیورەی پەروەردەیی مۆدێرن لە فەرەنسا، بە لایەنی كەمەوە بەشێكی لێپرسراوێتیان لە ئەستۆیە لەو چاودێرییە تۆكمەیەدا، كە هەر ڕۆژێك بگریت وەزیری پەروەردە لە پاریس بەدیاریكراویی دەزانێت كە هەموو منداڵانی فەرەنسا كام لاپەڕەی كتێبەكانیان دەخوێنن. لە بەرامبەری ئەم پەردە شاراوەیەدا، شتێكی سەرسوڕهێنەر نییە كە دەبینین دۆركهاییم لەپاڵ بایەخدانیدا بە هەردوو سیاسەتیش و پەروەردەش، شیكردنەوەی تیورەی ئاكار و نەریتە ڕەسمییەكان ئەنجام دەكات بە بەشێكی سەرەكیی لە بەرنامەكەی خۆی[15].

هەروەك تێبینیمان كرد، لە تێڕوانینی دۆركهاییمدا، مەحاڵە بتوانرێت بەبێ بوونی چەند خاڵێكی بادانەوە بۆ سەر ئایین، وەڵامی پرسی ئاكار بدرێتەوە. ئەو لە ساڵانی سەرەتای كارەكەیدا بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ، لە ڕێی وتار، نوسین، هەروها سەرنج دەربڕین لەسەر كاری خەڵكانی تر، ئەو كارەی كرد. بەڵام ئەو لێكۆڵینەوە تەواوەكەی خۆی دەربارەی ئایین لەناو دوایین كتێبی زۆر گرنگی خۆیدا مشتوماڵ كرد، فۆرمە سەرەتاییەكانی ژیانی ئاینیی، كە دوای زیاتر لە دەساڵی لێكۆڵینەوەو وردبوونەوە، لە ساڵی *1912*دا چاپكراوە. ئیتر ئەو كتێبە بوو بە دڵی تیۆرییەكەی دۆركهاییم دەربارەی ئایین، پێویستە ئێمەش تۆزێك بە درێژیی لەسەری رابوەستین.

> **لە تێڕوانینی دۆركهاییمدا، مەحاڵە بتوانرێت بەبێ بوونی چەند خاڵێكی بادانەوە بۆ سەر ئایین، وەڵامی پرسی ئاكار بدرێتەوە.**

### فۆرمە سەرەتاییەكانی ژیانی ئاینیی

رەنگە كرنگترین دوو شت كە لەم كتێبە درێژو پێشەنگەدا تێبینی بكرێت بریتی بن لە ناونیشانەكەی و شێوازی دەستپێكردنەكەی. كتێبی فۆرمە بنەڕەتییەكان ( *1912*) بەدوای رەگورِیشەكاندا، توخمە بنەڕەتییەكاندا دەگەڕێت، بە شێوەیەك كە رەنگە هەروەكو زانایەكی فیزیای ناوكی بپرسێت ئایین لە چییەوە هاتۆتە دەرەوەو لە چی پێكهاتووە. هەروەها بە ڕێگایەكیش دەست پێدەكات كە رەنگە زانایەكی فیزیای ناوكییش بەدڵی بێت. بەوەی بە شێوەیەكی بەرچاو هەموو ئەو رێگاو مۆدێلە باوانەی بیركردنەوە لە بابەتەكە بخاتە لاوە. پێویستە ئەوەمان لەیادبێت كە تایلۆرو فرێزەرو فرۆیدیش هەروەها، بە شێوەیەكی بەرفراوان بە بیرۆكەیەكی كۆنینە رازی ببوون كە گوایە ئایین بریتیە لە باوەڕبوون بە بونەوەرە ژوور سروشتییەكان، لە وێنەی خوداو خوداوەندەكان. بەڵام دۆركهاییم وا نییە. ئەو هەر لە دەسپێكردنەوە رایدەگەیەنێت كە خەڵكە بەراییەكان بە شێوەیەكی ئاسایی بیر لە دوو جیهانی جیاواز ناكەنەوە، جیهانێكیان ژوور سروشتی و ئەوەی تریشیان سروشتی بێت، بەو رێگایەی كە خەڵكە ئاینداڕەكانی ناو كەلتورە پێشكەوتووترەكان دەیكەن. هاوچەرخەكان زۆر لەژێر كاریگەریی گریمانەو یاسا سروشتییەكانی زانستدان، خەڵكە بەراییەكان وانین. بەلای ئەوانەوە هەموو رووداوەكان چ ئەفسوونیی و چ ئاسایی بە شێوەیەكی بنەڕەتی سەربەیەك چەشنن. لەوەش زیاتر، چەمكی خوداوەند خۆی لە خۆیدا گرفتێكە، چونكە هەموو باوەڕدارەكان باوەڕیان بە بوونە یەزدانییەكان نییە، هەتا ئەگەر باوەڕیشیان بە ژوور سروشتیی هەبێت. بۆ نمونە بودایییەك، نكولیی لە بوونی خوداوەندان دەكات، لە كاتێكدا خەڵكانی تر بە شێوەیەكی رۆتینی مومارەسەی ئەو سروتانە دەكەن كە بەهیچ شێوەیەك

پەیوەندییان بە رۆحەکان یان یەزدانەکانەوە نییە. کەواتە بەلای دۆرکهاییمەوە شتێکی حاشاهەڵنەگرە کە بابەتەکە پێویستی بە پێناسەکردنێکی تازەترە، هەروەها لە هەنگاوی یەکەمیشدا دەسبەرداربوونی تێڕوانینە کۆنەکە شتێکی پێویستە بەلام دوای ئەوە دەبێت بۆ کوێ بچین؟.

پاشان دۆرکهاییم سەرنج دەدات ئەو شتەی کە لەناو باوەڕە ئاینییەکان و سروتەکاندا زۆر دیارو دەرکەوتووە، رەگەزی ژوور سروشتی نییە، بەڵکو چەمکی پیرۆزییە، کە لە ڕاستیدا بە تەواویی جیاوازە. سەیری هەرکوێیەك بکەین، ئەو خەڵکانەی ئایندارن شتەکانی ناو جیهانەکەی خۆیان دابەش دەکەن بۆ دوو بواری جیاکراوە، بەلام بریتی نین لە سروشتی و ژوور سروشتی. ئەوانە تاڕادەیەك بریتین لە هەردوو کایەی پیرۆزو پۆخڵ. شتە پیرۆزەکان هەردەم وەکو شتی بالا، بەهێز، دوور لە پێوەستی ئاسایی، هەروەها شایستەی رێزلێنانێکی مەزنن. شتە پۆخڵەکانیش بە پێچەوانەوە، سەر بە ئاساین، بێ مەترسی، هەروەها رۆتینی کردەیی ژیانی رۆژانەن. بایەخی دێرینەی ئایین بە یەکەمینی ئەم دوو شتە بووە. بە قسەی دۆرکهاییم خۆی" ئاین بریتیە لە سیستمێکی یەکخراو لەو باوەڕو نەریتانەی پەیوەندییان بە شتە پیرۆزەکانەوە هەیە، کە لە بەشی دووەمی پێناسەکردنەکەی دۆرکهاییمدا وەلامی دراوەتەوە: ئەو دابونەریتانە بەستراون بەیەك کۆمەڵەی ئاکارییەوە کە پێی دەوترێت کەنیسە، هەموو ئەو شتانەش کە پێیانەوە نوساون"[17]. کلیلە وشەکان لێرەدا بریتین لە کۆمەڵەو کەنیسە، هەردەم شتە پیرۆزەکان بایەخێکی زۆریان پێدەدرێت: سودو خزمەتکردنی گروپێکی تایبەتی لە خەڵك، نەك تەنیا کەسێك یان چەند کەسێك. لە لایەکی تریشەوە شتە پۆخڵەکان، شتگەلێکی کەمن، کاردانەوەیان هەیە لەسەر کاروباری رۆژانەی هەر تاکێك. چالاکییە بچوکە تایبەتییەکان، هەروەها کاروبارە راستەوخۆکانی خێزان و ژیانی تایبەتی.

**پیرۆز بە شێوەیەکی تایبەتی لەپاڵ ئەو شتانەدا سەرهەڵدەدات کە کۆمەڵگا بایەخیان پێدەدات**

بۆیە کردنی ئەوە شتێکی سەرنجڕاکێشە، دۆرکهاییم ئاگادارمان دەکاتەوە کەوا ئەم جیاکردنەوەیەی نێوان پیرۆزو پۆخڵ جیاکردنەوەیەکی ئاکارییە ئیتر وابزانین کە پیرۆز باشەو پۆخڵ خراپە. لە راستیدا ئەم هێڵی جیاکردنەوەیە بە توێی دابەشکردنی نێوان پیرۆز و پۆخڵدا تێدەپەڕێت. دەشێت پیرۆز باش بێت یان خراپ بێت، بەلام هەرگیز شتێکی پۆخڵ نابێت، پۆخڵ دەشێت باش بێت یان خراپ بەلام بەهیچ جۆرێك پیرۆز نابێت. پیرۆز بە شێوەیەکی تایبەتی لە پاڵ ئەو شتانەدا سەرهەڵدەدات کە کۆمەڵگا بایەخیان پێدەدات، پۆخڵ بە شێوەیەکی سروشتیی پەیوەندیی بە جیهانی کاروبارە تایبەتییەکانی تاکەکانەوە هەیە.

ئەم جەختکردنە لەسەر پیرۆز وەکو شتێکی کۆمەڵایەتی دۆرکهاییم دەبات بەرەو ناکۆکییەکی تریش لەگەڵ پێپێشینەکانی خۆیدا، کە لەسەر پرسیارە مەتەڵاوییەکەی سیحر سەنتەریان گرتووە. لە بۆچوونی فرێزەردا، وەك دەبینین، سیحرو ئایین لە یەك قوماش بڕراون، هەردوکیان هەوڵ دەدەن هەمان شت بکەن، بەڵام بە ڕێگای جیاواز. هەردوکیان هەوڵ دەدەن روونی بکەنەوە کەجیهان چۆن کاردەکات، بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگادا کۆنترۆڵ بکرێت. چەشنی مرۆڤ سەرەتا شوێنی رێساکانی سیحر کەوتبوو، دوای ئەوەی نوشوستییان هێنا، بەرەو ئایین وەرچەرخان وەکو فۆرمێکی باشتری بیرکردنەوە. دۆرکهاییم لەگەڵ ئەمەشدا ناکۆکە. بەلای ئەوەوە، کە سیحر نوشوستی دەهێنێت، ئایین یەکسەر نایەت بۆئەوەی جێگەی بگرێتەوە، چونکە هەردوکیان بایەخ بە هەمان شت دەدەن. سیحر بە تەواویی شتێکی تایبەتییە، کە زۆر کەم بایەخ دەدات بە پیرۆز و مەسەلەکانی، یان هەر بایەخی پێنادات. سیحرباز وەکو دکتۆر پێستی من چارەسەر دەکات یان جادوویەك لە دوژمنەکەی تۆ دەکات، بەڵام ئەمە شتێکی تەواو کەسییە. رەنگە من هەر نەشزانم کە سیحربازەکەی من یاریدەی تۆش دەدات، لەبەرئەوەی هەریەکێکمان بە جیا دەچین بۆ لای بۆئەوەی پێویستییە تایبەتیەکانمان بۆ جێبەجێ بکات. هەرچۆنێك بێت هیچ یەکێك لەمانە مەسەلەکە نین، لەچاو مەسەلە مەزنترەکەی ئاییندا. هەرکاتێك بایەخدانەکانی گرووپ لە بیرکردنەوەدا سەرەکیی بن، ئەوا سروت و باوەڕە ئایینییەکان دەکەونە گەڕ، وەزیفە پیرۆزەکان وەکو چەقە خاڵێکی ئەو بانگەشەیەی کاردەکاتە سەر تەواوی کۆمەڵگا، دەسبەکار دەبن. بەمجۆرە سیحرو ئایین دەتوانن بەئارامی شان بەشانی یەکتریی بونیان هەبێت، یەکێکیان شوێنی کەسەکانەو ئەوەی تریش جوغزی کۆمەڵایەتییە. وەك دۆرکهاییم دیاریی دەکات، سیحربازیش مشتەریی خۆی هەیە، بەڵام تاقمێك یان دەستەیەکی تایبەتی نییە. کەنیسەیەك نییە بۆ سیحر؟[18].

ئەم دوو خاڵی ناکۆکییە دەربارەی پێناسەی ئایین و سروشتی سیحر دەچێتە سەر لێپرسینەوەیەکی سێیەمی دۆرکهاییم کە گرنگترینیانە. لە تێڕوانینی ئەودا تیۆرییەکانی تر، بە هەڵە لە ئایین تێگەیشتوون.

## تیوریەکانی پێشووتر: سروشتگەرایی و رۆحگەرایی

دۆرکهاییم جەخت دەکات لەسەر ئەوەی وردبوونەوەیەکی نزیك لەسەر تیورییە رابەرەکانی رۆژ، بیرۆکەیەکی باو لە توێی خۆیانەوە پیشان دەدەن: هەموویان رادەگەیەنن کە ئایین بریتیە لە غەریزەیەکی سروشتیانەی چەشنی مرۆڤ، ئەوانە قەناعەتیان وایە کە لەناو هەموو خەڵکە کەلتوردارەکاندا، سیستمەکانی باوەڕی خۆیان بە شێوەیەکی تەواو لۆجیکی بەرەو ئەو جیهانە دامەزراندووە کە بەرەو رووی دەبنەوە. دیارترینی ئەو تیوریانە بریتین لە سروشتگەراییەکەی

فریدریك ماكس مۆلەر، كە لە پێشەكیەكەماندا پێی گەیشتین، هەروەها رۆحگەراییەكەی تایلۆر[19]. مولەر پێی وایە كە خەڵك لە رێگەی هەوڵدانەوە بۆ لێكدانەوەی دیاردەو روداوە مەزنەكانی ناو سروشتەوە ـ شتی وەك خۆر، ئاسمان، هەروەها گێژەڵوكە، دەگەنە ئەوەی باوەڕیان بە خوداكان هەبێت. تایلۆریش وەك بینیمان، پێی وایە ئەم باوەڕە بە یەزدان لە بیرۆكەی رۆحەوە پەرەدەسێنێت[20]. ئێستا، دۆركهاییم لە چوارچێوەی ئەم تێڕوانینانەدا، سەرنج دەدات كە هەردوكیان زۆر زێدەڕۆیانە تەماحكارن. ئەوانە بەوە قەناعەتیان كردووە بەوەی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەناو پرۆسێسێكی دوورو درێژی پەرەسەندندا تێپەڕیوە، بۆیە هەوڵیانداوە بەرەو دواوە بگەڕێنەوە بۆئەوەی ئەندێشەی ئەوە بكەن كە ئایدیاو هەست و سۆزەكانی مرۆڤی سەرەتا چۆن بووە. بەڵام لە راستیدا ئەمە پڕۆژەیەكی مەحاڵە. راستییەكەی ئەوان ویستوویانە بەرامبەری ئایین زانستیی بن، ئێمە ناتوانین بەپێی مەزەندەكردنی ئەوەی خەڵك لە دامێنی مێژوودا چۆن بیریان كردۆتەوە، لە ئایین تێبگەین. پێویستە لە جیاتی ئەوە هەوڵ بدەین بڕوانینە "ئەو خاڵە هەمیشەییانەی" كە ئایین لەسەریان رادەوەستێت، ئەو شتانەی كە لە هەموو كات و شوێنێكدا، وایان لە خەڵك كردووە كە بە رێگا ئاینییەكان رەفتار بكەن و باوەڕیان پێیان هەبێت. دۆركهاییم پێشنیار دەكات كە لەجیاتی ئەوەی مەزەندەیەكی سەرەكی بخەینە روو دەربارەی ماوەی رابردوو، با یەكەمجار بڕوانینە نمونە راستەقینەكانی ئایین كە ئێستا لە چالاكییدان. بۆ ئەم مەبەستەش، چ میتۆدێك باشتر دەبێت لەوەی، سادەترین كۆمەڵگای ناسراو هەڵبگرینەوەو متمانە بە كەسێك بكەین كە بەراستی ئاگاداریەتی؟ ئاینێك پێوەست بێت بە سادەترین سیستمی كۆمەڵایەتییەوە، كە لەئارادا بێت، بۆی هەیە بە باشی وەك نمونەی سەرەتاییترین ئایین بێت كە دەیناسین[21]. ئەگەر بتوانین ئەم ئایینە روون بكەینەوە، ئەوا دەسپێكێكمان لەبەردەستدا دەبێت بۆ روونكردنەوەی هەموو ئایینەكان. ئێمە ئاینێكمان بەدەستەوەیە لە فۆرمە سەرەتاییەكانیدا.

## ئایینی خێڵە ئوسترالییەكان: تۆتەمیزم

تۆكمەترین بەڵگەی دۆركهاییم بریتی بوو لە دۆزینەوەی نمونەیەك بۆ شارستانێتییەكی بەڕاستی سادەو ساكار ـ لەم بارەیەوە لێكۆڵینەوەكانی ئەم ماوەیەی دوایی بەشێوەیەكی بەرچاو بەڵگەو دەستاوێژی تۆكمەمان پێدەدەن. ئێمە سەرنجمان دابوو كە چۆن لە سالآنی پێش و پاش وەرچەرخانی سەدەكە، فرێزەر سودی لە كارەكانی باڵدوین سپنسەرو ئیف جەی گیلین وەرگرت، كە ئەنترۆپۆلۆجیستی مەیدانی بوون و توانیبوویان لە نزیكەوە چاودێری دانیشتوانە ئەسڵییەكانی ناوچەی پشتەوەی ئوسترالیا بكەن. كارەكانی ئەوان، شانبەشانی لێكۆڵەرەوەی مەیدانی ئەڵمان كارل ڤۆن سترێلۆ و خەڵكی تریش كە لێكۆڵینەوەی هاوشێوەیان كردبوو، توانیبووی وێنەیەكی وردی ژیانی كۆمەڵایەتی لەو كۆمەڵگا

هەتا بڵێی سادانەدا بکێشێت[22]. هەروەها بە شێوەیەکی تەواو سەرنجڕاکێش، بە هەمان شێوە پیشانی دابوو کە ئاینی ئەو خەڵکانە لە تۆتەمیزم زیاتر شتێکی تر نەبوو، هەروەك بینیمان هەمان ئەو شتەی کە رۆبرستۆن سمیس، فرێزەر، فرۆید، لێتۆژەرە ئەنترۆپۆلۆجییەکانی زووی سەراسیمە کردبوو.

دۆرکهاییم بەم لێکۆڵینەوە ئوسترالییە نوێیە، لەوانیتر کەمتر سەرسام نەبوو، بەڵام قەناعەتیشی بەوە هەبوو کە هیچ یەکێك لەو تیوریستانەی پێش خۆی نەیانتوانیوە بە تەواویی سودی لێوەربگرن، کەسیان نرخی ئەوەیان نەزانیوە کە تۆتەمیزم بەلای کەلتورێکی بەراییەوە شتێکی چەند بنەڕەتییە. بۆ نمونە هەموویان ئەوەیان ناسیوەتەوە کە خەڵکە خێڵەکییەکان خۆیان دابەش دەکەن بۆ هۆزی جیاجیا، هەریەکێکیان گیانەوەرێك، رووەکێك یان هەر بابەتێکی تریان کردوە بە تۆتەمی خۆیان. هەروەها هەموویان سەرنجیان داوە کە خودی تۆتەمەکە، چ ئەگەر ورچێك یان قەلەڕەشێك یان کەنگەرێك بێت یاخود درەختی چا بێت، بە شتێکی پیرۆز دادەنرێت بەلای ئەو هۆزەیەوە کە رایانگەیاندووە. بەڵام هیچیان بە شێوەیەکی راستەقینە شتە گرنگەکەیان نەپێکاوە: تۆتەمیزم چۆن بە شێوەیەکی ئاوا کاریگەر چەمکەکانی پیرۆزیی و پۆخڵیی وێنا دەکات.

دۆرکهاییم سەرنج دەدات کە لە هەریەکێك لەو کۆمەڵگا بەراییانەدا، گیانەوەرەکانی تر جگە لە تۆتەمەکە، کە پۆخڵن، دەتوانرێت بە شێوەیەکی ئاسایی لەلایەنی هۆزەکەوە بکوژرێن و بخورێن، بەڵام گیانەوەرە تۆتەمەکە نا، چونکەئەو پیرۆزە، بەتەواویی لەهۆزەکە قەدەغەکراوە، جگە لەو بۆنە هەڵبژاردانەدا، کە وەکو بەشێك لە نەریتە تایبەتییەکان، بەشێوەیەکی سروتئامێز دەکرێت بە قوربانیی و دەخورێت. بەمەش خودی هۆزەکە بە پیرۆز لە قەڵەم دەدرێت، چونکە لەگەڵ تۆتەمەکەدا بووە بەیەك. هەروەها رەنگە لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە هێما یان ئاماژەی گیانەوەرە تۆتەمەکە هەمیشە زۆر گرنگ بێت، ئەوە نەك تەنیا پیرۆزە بەڵکو مۆدێلە، نمونەیەکی پوختەی شتە پیرۆزەکەیە. کاتێك هۆزەکە پێکەوە کۆدەبنەوە بۆ ئەنجامدانی نەریتەکانیان، ئەوە بەردەوام دەبێت بەرەمزی تۆتەمەکەو دەکرێت بە پارچە تەختەیەك یان بە بەردێکەوەو دەبێتە سێنتەری نەریتەکە. تۆتەمەکە بە شێوەیەکی باڵا پیرۆزەو پیرۆزییەکەی دەگوێزێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی لە چواردەوریدان.

لەوەش زیاتر، باوەڕە تۆتەمییەکان لە ژیانی ئەو کۆمەڵگا سادانەدا شتێکی ئەوەندە بنچینەیین کە هەموو شتێکی گرنگ لەلایەنی ئەوانەوە سیما وەردەگرێت. زەحمەتە بتوانین شتێك بدۆزینەوە کە لە وتەزاکانی بیر و ئەزمونەکانی مرۆڤ گرنگتر بێت، لەناو دانیشتوانە ئەسڵییەکاندا، ئەوانە تۆتەمیزمیان هەیە. بۆ نمونە، چەمکە تۆتەمییەکان تێڕوانینە سەرەکییەکانیان دەربارەی سروشت بەڕێوە دەبات، چونکە نەك تەنیا گرووپەکانی خەڵك، بەڵکو سەراپای جیهانی شتە سروشتییەکان دابەشکراوە بۆ چەند نمونەیەك بەپێی هۆزە تۆتەمییەکان، یاخود هۆزە

هێشوویییەکان، کە پێیان دەوترێت *phratries*. بۆ نمونە خێڵێك هەتاو دەخاتە ناو هۆزی توتییە سپییەکانەوە، لە کاتێکدا کە مانگ و ئەستێرەکان لکێنراون بە هۆزی هاوشێوە سپییەکانیانەوە[23]. لەوەش زیاتر، شتە سروشتییەکان لە هێرارکیی هێزدا ریزکراون، کە دەتوانرێت تەنیا بەپێی رێساکانی ئاستەکانی دەسەڵات کە بەراییەکان سەرەتا لە بونیادی خێزان و هۆزدا دەرکی پێدەکەن. بۆیە چەمکەکانی تۆتەم و هۆز رێچکەی خۆیان دەدۆزنەوە بۆ ناو هەموو دیاردەیەکی دیاری ناو ژیانی خێڵایەتی. تەنانەت حاڵەتی تۆتەمی ناکیش هەیە. ئەوانەی ئەندامی هۆزێك دەتوانێت هەڵی ببژێرێت وەکو چەشنە هاورێیەکی شەخسیی. هەروەها تۆتەمی سێکسی، کە خەڵکەکان بەپێی رەگەزەکانیان کۆدەکاتەوە. بێگومان ئەمانە هەردوکیان لە تۆتەمی بنەڕەتیترو گشتیتری هۆزەکەوە دێنە دەرەوەو سەلماندنێکی زیاتر پێشکەش دەکەن بۆ گرنگێتییە سەنتەرییەکەیان.

تیوریستە پێشووترەکان، لە گەڕانیاندا بۆ روونکردنەوەی تۆتەمیزم، شوێنی رێرەوە چاوەڕوانکراوەکانی خۆیان کەوتوون. تایلۆر وەك ئەوەی ئێمە پێی گەیشتین، سوورە لەسەر ئەوەی ئەو نەریتە لە ئایمیزمەوە سەری هەڵداوە، هی تر وای بۆچوون کە ئەوە لە پەرستنی سروشتەوە هاتووە، هەروەها هەندێکی تری وەك فرێزەر وتویاتە ئەو شتێکی سیحرییە یاخود لەوانەیە هیچ پێوەستێکی نەبێت نە بە ئایینەوەو نە بە سیحرەوە. بەلای دۆرکهاییمەوە، ئەوەی کە هەموو ئەو تیوریستانە بە هەڵە بۆی دەچن، شتێکە بینینی زەحمەت نیە. هەریەکەیان هەوڵ دەدات بۆ شوێنهەڵگرتنی تۆتەمیزم بەرەو شتێکی تر کە وا دابنرێت پێشترو بنەڕەتیتر بێت. بەڵام ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. دۆزینەوەی شێوەیەکی ئایینی کە لە تۆتەمیزم کۆنتر بێت شتێکە بە تەواویی مەحاڵە، لەبەر هۆیەکی سادە کە ئەویش ئەوەیە نیە. تۆتەمیزم کە لە سادەترین کۆمەڵگاکاندا دەردەکەوێت، خۆی سادەترین و بنەڕەتیترین فۆرمی ئەسڵییە بۆ ئایین، هەموو فۆرمەکانی تر دەتوانن لەمەوە سەرهەڵبدەن. تۆتەمیزم بەرهەم نییە، درێژکراوەی فۆرمێکی بنەڕەتیتری ئایین نییە، ئەو خۆی ئەو سەرچاوەیەیە کە هەموو شێوەکانی تری پەرستنی ئایینیی چ ئەگەر پەرستنی رۆح، خوداوەندەکان، ئاژەڵ، رووەك، یاخود ئەستێرەکان بێت، لەوەوە سەرهەڵدەدەن.

> **تۆتەمیزم کە لە سادەترین کۆمەڵگاکاندا دەردەکەوێت، خۆی سادەترین و بنەڕەتیترین فۆرمی ئەسڵییە بۆ ئایین**

ئەوە راستە لە یەکەمین تێروانیندا، تۆتەمیزم وادەردەکەوێت یەکێك بێت لە تەرزە باوەکانی ئایین: جۆرێك لە پەرستنی گیانەوەر یان رووەك، ئیتر لەوە زیاتر نا. بەڵام دۆرکهاییم پێ دادەگرێت. ئێمە کاتێك بە درێژیی لێی ورد دەبینەوە، ئینجا دەردەکەوێت شتێکی بە تەواویی جیاوازە. شوێنکەوتووانی کەلتوری تۆتەمی بە راستی قەلەرەشکە، بۆق، یاخود تووتی سپی ناپەرستن،

بەڵکو خەریکی پەرستنی هێزێکی نەناسراوی ناکەسیی دەبن، لە هەریەکێك لەوانەدا بوون دەدۆزنەوە بەڵام لەگەڵ هیچیاندا ناتەبا نابن. کەس ناتوانێت و بە تەواویی خاوەنی نیەو بەراوردیش ناکرێت لەگەڵ هیچ شتێکدا. ئەگەر بمانەوێت، بێشك دەتوانین بێهوودە باسی خوداوەندێك بکەین لە ناو کەلتورێکی تۆتەمییدا دەپەرسترێت، "بەڵام ئەوە خوداوەندێکی ناکەسییە، ناو یان مێژووی نییە، لە جیهاندا هەیەو لەناو برێکی لە ژمارە نەهاتووی شتەکاندا هەیە"[24]. دۆرکهاییم وای پێباشترە کە ئێمە بە دروستییەکی زیاترەوە باسی شتێك بکەین کە پێی دەوترێت "پرەنسیپی تۆتەمیی" کە لە چەقی هەموو باوەڕو نەریتەکانی خێڵەکەدا هەیە. لە پشتەوەی تۆتەمەکە هێزێکی ناکەسیی هەیە کە هێزێکی لەبن نەهاتووی هەیە، کە هەم هێزێکی فیزیاییەو هەم ئاکارییشە، بەسەر ژیانی خێڵەکەدا. خەڵك ڕێزی لێدەگرن، هەست بە پێوەستێکی ئاکاریی دەکەن بۆ جێبەجێکردنی نەریتەکانی، هەروەها لە توێی ئەوەوە بە تەواویی هەست بە پێوەستیی قووڵ دەکەن بە یەکترییەوەو دڵسۆزیی بۆ یەکتریی دەنوێنن.

لێرەدا دەتوانین ببینین بۆچی دۆرکهاییم وابیری لێدەکاتەوە کە پێناسەکردنی ئایین وەکو باوەڕبوون بە خوداکان یاخود بوونەوەرە باڵاکان شتێکی سەرلێشێوێنەرانە بێت، لانی کەم لە دیوی دەرەوەی. لە تێڕوانینی ئەوداو پێش ئەوەی باوەڕمان بە خوداکان هەبێت، هەمیشە ئەم شتە بنەڕەتییەی یەکەم هەیە، هەستکردن بە هێزێکی شاراوەی ناکەسیی بەهێز. پرەنیسپە تۆتەمییەکە کە بریتیە لە چەقە ئەسڵییەکەی پەرستشەکانی خێڵەکە. لەوەش زیاتر، ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە ئەو بەڵگەیەی ئێمە بۆ ئەم پرەنسیپە تۆتەمییە دەیدۆزینەوە، بە هیچ جۆرێك تەرخان نییە بۆ ئوستراليا. دۆرکهاییم رادەگەیەنێت کە لەژێر ناوی جیاجیادا، لە کۆمەڵگا خێڵەکییەکانی تریشدا دەیدۆزینەوە، لەناو میلانزییەکاندا، چەمکی هاوشێوەی مانا هەیە، هەروەها لەناو هۆزە هیندییە ئەمریکییە جیاجیاکاندا، هەمان پرەنسیپ دەدۆزینەوە کە بە چەند وشەیەکی وەکو واکان، مانیتۆو، هەروەها ئۆرێندا وەسفی کراوە، کە هەر هەموویان ئایدیای ئەو هێزە باڵادەست و ناکەسییە دەنوێنن، دەسەڵاتێکی باڵا، کە چەقی راستەقینەی پەرستشی هۆزەکە یان خێڵەکە لەوێدایە[25]. کەواتە ئەگەر بمانەوێت لە ئایین بکۆڵینەوە، پێویستە لە روونەختەکانی باوەڕبوون بەو خوداوەند یان رۆحانەی کە خەڵکی دەیانپەرستن، بۆی بگەڕێین، پێویستیمان بەوەیە ئەو واقیعە راستەقینەیە زیاتر روون بکەینەوە، پێویستە پیشانی بدەین کە پەرستنی ئەم "پرەنسیپە تۆتەمییە" لە راستیدا چییە.

## کۆمەڵگا و تۆتەم

تۆتەم لە یەکەمین نمونەدا رەمزە، بەڵام رەمزی چییە؟ ئێستا دەتوانین ببینین کە وەڵامێك بریتیە لە "پرەنسیپی تۆتەمی" هێزی شاراوەی پەرستراو لەلایەنی خێڵەوە. لە هەمان کاتیشدا لێرەدا دۆرکهاییم بادانەوە سەنتەرییەکەی خۆی

دەكات . تۆتــەم شــتێكی بەرهەستیشــە، كۆتــەڵی بینراوی هۆزە، ئالآیەتی، دروشمی بەرنامەكەیەتی، خودێكی دیارە لەناو رەمزێكدا، رێك وەك ئــەوەی كەسێك بتوانێت ئەوە هەڵۆی ئەمریكایە." شكۆی دێریـن" یـان "مـام سـام" دروشمـی بەرهەسـتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە، بەلآم ئەگـەر تۆتــەم " یەكســەر رەمـزی خوداوەنـدو هــەروەها كۆمـەڵگاش بێـت، ئایـا ئـەوە لەبـەر ئـەوە نیـە كـە خوداوەنـدو كۆمــەڵگا تــەنیا یــەك شــتن؟" لەبەرئــەوە خوداوەنـــدی هۆزەكـە، پرەنسـیپە تۆتەمییەكــە، هیـچ شـتێكی تـر نـابێت جگــە لــە خــودی هۆزەكــە كــە كــراوە بــە كەسێتی و سەرلەنوێ هێنراوەتەوە نــاو ئەندێشـــەوە لـــەژێر فۆرمـــی بینراوی گیانەوەرێك یان میوەیەكدا كە خزمەتی تۆتەمەكە دەكات[26]. بە كورتی، تۆتـەم لەیـەك كـاتدا سـیمبولی هەریەكـە لـە خوداوەنـدو هۆزەكەشە، چونكە هەردوو خوداوەندو هۆزەكەش بـە راسـتی یـەك شـتن! لـە فۆرمێكـی تۆكمــەدا، دڵســــۆزیی بـــۆ خوداوەندێكـــی نــــێر یـــان ژنــەخوداوەندێك بریتیــە لــەوەی چــۆن مرۆڤــە بەرایییـەكان گوزارشــت لــە دڵسـۆزیی خۆیـان بـۆ هۆزەكە دەكەن.

بێشك ئەوە راستە كە ئەندامانی ئەو خەڵكە ئەسڵییانەی ناو هۆزەكە خۆیان وابیردەكەنەوە كە بە سروتەكانی پەرستن خوداوەندێك دەپەرستن، ئـاژەڵێك یـان روەكێـك، كـە لـە دەرەوە لـەوێدا لـە جیهاندا بوونی هەیە، كە دەتوانێت كۆنترۆڵی باران بكات، یان خێروخێراتیان بەسەردا برێژێت. بەلآم ئەوەی بە راستی لە شتێكی تردا روودەدات، شتێك كە باشتر بە دەستەوە بێت لـە زاراوەكانی وەزیفە كۆمەلآیەتییەكاندا[27]. دۆركهاییم سەرنج دەدات كە كۆمــەڵگا پێویســتیی بــە پــەیمانی تــاك هەیــە، "ناتوانێت بوونی هەبێت لە هۆشی تاكدا نەبێت". هەربۆیە هەمیشە پرەنسیپی تۆتەم دەمانسمێت و خـۆی لـەناوماندا ئۆرگـانیزە دەكـات"[28]. لـەوەش زیـاتر ئێمـە دەتوانین بـە تـەواویی بزانـــین ئـــەوە كـــەی و چـــۆن دەردەكـەوێت. لەسـەر بنـەمای ئـەو ئاهەنگـــە ترسبەخشـــانەی كـــە روودەدات هــەموو كۆمــەڵ رێكــی دەخـەن بـۆ سـروتە گشـتییەكانی هۆزەكە یان خێڵەكە. لەو ئاهەنگە مــــــەزن و لەبیرنەكراوانـــــــەدا پەرستیارەكان پـەیمانی خۆیـان بـۆ هۆزەكـە مـۆر دەكەن. لەوساتە پڕ لـە جۆشانەیاندا، لـەو حاڵەتە كێوییە پڕ لە هەژان و درودانەدا، تاكەكان دەتوانن خۆیــــان لـــــەناو ئــــەو قەرەباڵــــەغی و ئــــاپۆرا هەناسەســــــوارەدا ون بكــــــەن، دەســــــبەرداری تایبەتمەندێتی خۆیان دەبن بۆئـەوەی لـەناو یـەك تاقە خودی هۆزەكەدا نغرۆ ببن. لـەناو ئـەم چەشنە كۆبوونەوە پڕ لە ترپەو جۆشەدا، تاكەكان هەست و سۆزی وەهـا بەدەسـت دەهێنـن و رەفتـاری وایـان لێدەوەشــێتەوە كــە خۆیــان بــە تــەنیا هــەرگیز نـەیاندەتوانی ئـەنجامیان بدەن. ئـەوەی كـە هـی خۆیانە لە پشتەوە جێی دەهێڵن، بە ئاسودەییەوە شوناسی خۆیان نێكەلآوی خودی تاقانەی هۆزەكە

> دۆركهاییم سەرنج دەدات كە كۆمەڵگا پێویستی بە پەیمانی تاك هەیە، "ناتوانێت بوونی هەبێت لە هۆشی تاكدا نەبێت"

دەکەن، ئەوانە دەسبەرداری ژیانی رۆژانەی سواوو خۆپەرستانەی خۆیان دەبن، لەبری ئەوە دەچنە ژێر سایەی ئەوەی مەزن و گشتییە، دەچنە ناو چوغزی پیرۆزی ئاینییەوە.

دۆرکهاییم چالاکانە وەسفی ئەو سۆزە دەکات کە" قولّپ دەدات" لە جۆشسەندنی ئاهەنگەکانی ئەو گروپانەدا. کەواتە ئان و ساتێکی سروتییانەن، پڕن لە وزەو سۆزو جۆش، چوستیی، پەیمانی ناخودانە، هەروەها ئەوپەڕی ئاساییش. "لەناو ئەم ژینگە کۆمەلاّیەتییە خرۆشاوانەدایەو پێدەچێت ئایدیا ئاینییەکانیش لە خودی ئەو خرۆشانانەوە لەدایك بووبن"[29]. لەم ساتانەدا دونیا لە دواوە جێهێلّراوەو تەنیا ئاینیی بوونی هەیە.

## مانا ناوەکییەکانی تۆتەمیزم

دۆرکهاییم بیرۆکە سەرەکییەکەی خۆی خستە روو ـ ئایدیای ئەوەی کە پەرستنی تۆتەم هیچی لە پەرستنی خودی کۆمەلّگا کەمتر نیە، ئەو وا هەست دەکات کە پارچەکانی تری مەتەلّەکەی کۆمەلّگای ئوسترالی و ئایینەکەی دەکەونە ناو ناوچە نزیکەکانی ترییەوە. بۆ نمونە، ئێستا رۆلّی سیمبۆلّی تۆتەم روون دەبێتەوە. کۆتەلّە نەخشێنراوە بەردیین یان تەختەییەکان، بابەتی بەرهەستن کە راستی هۆزەکە دەگەیەنن بە هەموو تاکێك، کە گوزارشت لە دلّسۆزیی هەمووان دەکات، بە تەنها شتێکی ئەندێشەکراو نییە، بەلّکو شتێکی راستەقینەیە، کە خۆی بەسەر ژیان و بیرکردنەوەی هەمواندا دەسەپێنێت. هەروەها سیمبولی تۆتەمەکە ئەو ئایدیایە دەگوێزێتەوە کە کۆمەلّگاش وەك ئەو شتێکی کامڵ و هەمیشەییە، وەکو چەقێکی سروشبەخش دەمێنێتەوە، بۆماوەیەکی درێژ دوای ئەوەی جۆش و خرۆشی ئاهەنگەکان تەواو دەبێت. ئەگەر بپرسین بۆچی دەبێت ئاژەلّ و رووەك باوترین شێوەی تۆتەم بن، ئەوە شتێکی زۆر روونە، هۆزەکە نایەوێت شتێك بکات بە هێمای خۆی کە دوورەدەست و تەژم بێت، پێویستی بە بابەتێکە کە شێوەیەکی بەرچاوی هەبێت و لەبەردەستدا بێت، شتێك کە بە توندی بەسترابێت بە ئەزمونی رۆژانەیەوە. ئەگەر بپرسین چۆن ئەو کۆمەلّگا سەرەتاییانە سیستمی بیرکردنەوەی خۆیان پێش دەخەن، شێوازی خۆیان بۆ مامەلّەکردن و پۆلاّندنی جیهان، ئەمەش دیسان دەشێت بە روونی ببینرێت[30]. مەبەستی تۆتەمیزم ئەوەیە تێبینی پێوەستی ناوەکی شتەکان بکرێت، ئەو تۆڕە ئالّۆسکاوەی کە هەرتاکێك بەوەی تەنیشتیەوە لەناو هۆزەکەدا گرێ دەدات، هەروەها هۆزەکەش بە جیهانی سروشتییەوە، هەروەها بەشە جیاجیاکانی جیهانی سروشتی بە یەکترییەوە. ئەمە بۆئەوەی هەموو شتەکان بە توندی پێکەوە گرێ بدات، لە راستیدا ئەمە تۆتەمیزمی بەرایی والێدەکات، بەو سادەییەشیەوە، دەبێت بە زەمینەی ئەو سیستمە بە ئالّۆزی پێکەوە گرێدراوانەی زمان، لۆجیك، هەروەها زانست، کە لە قۆناغەکانی دواتری شارستانێتیدا پەرەیان پێدراوە.

پرەنسیپی تۆتەمی دەتوانێت بە شێوەیەکی گونجاو حیسابی باقی بەشەکانی تری ئایین

پێشکەش بکات. باوەڕبوون بە ڕۆحەکان یان ڕۆحیانەتەکان، مەسەلەیەکە ئاماژەی بۆ بکەین. تۆتەمیزم پیشانی دەدات کە ئەو چەشنە باوەڕانە چۆن پەرەیان سەندووە. ئایدیای ڕۆح هەر پرەنسیپە تۆتەمییەکەیەو لەناو هەموو تاکەکاندا شەتڵ کراوە. لەوکاتەوەی هۆزەکە بوونی هەیە، تەنیا لەبەرئەوەی تاکەکان لە مێشکی خۆیاندا بیر لەوە دەکەنەوە، ئەوە تەنیا شتێکی سروشتییە بۆ ئەندامەکانی وا بیر لە پرەنسیپی تۆتەمیی بکەنەوە وەك ئەوەی بە شێوەیەك لە شێوەکان خۆی لەناو هەریەکێکیاندا بڵاو دەکاتەوە. کە خۆی بەناو هۆزەکەدا بڵاو دەکاتەوە، پارچەکانی کە هەر یەکێك لەتاکەکان دەبێتە خاوەنیان، دەبێتە ڕۆحی تایبەتی هەریەکەیان، "ئەوە هۆزەکەیە لەناوەوە"[31].

دۆرکهاییم لەسەری دەڕوات، کاتێك بیر لە گرفتە ئاینییە (فەلسەفییەکانیش) دێرینەکان دەکەینەوە، دەربارەی پەیوەندیی بە جەستەوە، ئەوا ئەم ئایدیا کۆمەڵایەتییە دەربارەی ڕۆح شتێکی زۆر پرشنگدارە. ئەگەر ڕۆح بە کارایی بریتی بێت لە هۆزەکە کە لەناو خوددا شوناسی دراوەتێ و شەتڵ کراوە، ئەوا بە هەمان قەبارە ئەرکەکەشی بریتییە لە نوێنەرایەتیکردنی داواکاریی و ئیدیاڵەکانی کۆمەڵگا لە بەرامبەری تاکەکاندا. ڕۆح بریتییە لە هۆشی خود، دەنگی ناوەوەی هۆزەکە، کە پەیمانی هەریەکەیان بەرامبەری گرووپەکە ڕادەگەیەنێت. جەستەش لەلایەکی ترەوە، جەخت لەسەر ئارەزووە سەنتەرییەکانی خودی خۆی دەکات، کە دەتوانێت چەندبارە بە تیژی بەر داواکاریی و قەدەغەکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بکەوێت. کەواتە هیچ سەرسوڕمانێك لەوەدا نییە، کە ئایین هەمیشە بە گومان بووە لە ئارەزووەکانی لەش! ئەوانە تاك دادەمرێکننەوەو شتی دزێون، ئایین جەخت لەسەر داواکارییە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، بۆیە شتێکی پیرۆزە.

پێڕەوی نائاکارێتی ڕۆحیش دیسان پەرەسەندنێکی سروشتییە لە تۆتەمیزمەوە. قسەکردن دەربارەی ڕۆح وەك نەمرێتی بەلای خەڵکە تۆتەمییەکانەوە، تەنیا ڕێگایەکی ترە بۆ دەربڕینی ئەوە لە کاتێکدا کە تاك دەمرێت و هۆز بەردەوام دەبێت لە ژیاندا. ڕۆحی پێشینان وەك پارچەو مارچە لە ڕابردووی هۆزەکەوە دەردەکەون، ئەو ڕۆحیانەتانەی توانیویانە بمێننەوە بۆ ئێستا. مایەی خۆشحاڵییە، ئەو ڕۆحیانەتانە زۆرجار خۆیان بەشدار دەکەن لە ژیانی ئەندامانی تیرەکەدا، بە ڕێگایەك کە دوو ڕۆح دەدات بە هەر تاکێك: "یەکێکیان ئەوەیە کە لە ناوەوەماندایە، یاخود تا ڕادەیەك ئێمەیە، ئەوەی تریشیان (لەشێوەی ڕۆحییانەت پێشینانماندایە) کە لە سەرووی ئێمەوەیە، کە وەزیفەکانیشیان بریتییە لە کۆنترۆڵکردن و یاریدەدانی ئەوەی یەکەم" لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا بۆ تیرەکە[32]. بە تێپەڕینی کات، دەسەڵات و پیرۆزیی ئەم تارماییە پاسەوانانە گەشەی سەند. بایەخیان زیادی کرد، ناوچەی کاریگەرییان فراوانتربۆوە، هەروەها "کەسێتیی ئەفسانەییانەی باڵا" یان بەدەست هێنا. بە کورتی، کە چەمکی ڕۆح و نەمرێتییەکەی وردە وردە سەری

هەڵداو لە پەرستشەکانی پرەنسیپی تۆتەمییەوە هاتە دەرەوە، بۆیە بە تێپەڕینی کات، پەرستنی خوداکان لە شێوەی ڕۆحی نەمری باپیراندا سەری هەڵدا.

دواجار دۆرکهاییم، لەگەڵ دەرکەوتنی خوداوەندەکانەوە لە تۆتەمیزمە بنەڕەتییەکەوە، دێتە سەر جیهانی ئایین، وەك زیاتر ئەوەی کە بەشێوەیەکی تەقلیدیی لێی تێگەیشتبوون. ئەو دان بەوەدا دەنێت، کە تەنانەت لە ئوستوالیاش، ئایینیی هۆز پەرەی سەند بۆ ئەو خاڵەی کە چەند خوداوەندێکی لە ژمارە نەهاتوویان هەبێت. زۆرێك لەوانە نەك لە بۆنەی تیرە بچکۆلەکاندا، بەڵکو لە سروتە خێڵایەتییە فراوانترەکاندا، بەشدارییان دەکرد، ئەو سروتانەی کە ژن و پیاوانی لاویان دەکرد بە ئەندامی تەواوەتی کۆمەڵگای تەرزەکان. لەراستیدا، باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتنی ئەم خوداوەندە گەورەترانە، ئەوەیە وا بیریان لێبکەینەوە کە بەکەسکردنی یەکە فراوانەکانی خێڵە. هەمان شتیش راستە بۆ ئەو بوونەوەرە زۆر باش ناسراوەی ئایینیی بەرایی کە تائێستاش لە ئوستوالیادا دەبینرێت: باوەڕبوون بە خوداوەندێکی باڵا کە لە سەرووی هەمووانەوە فەرمانڕەوایی دەکات. لێکۆڵەرەوانی هاوچەرخ سەرسام بوون بەوەی لەناو خەڵکانی بەراییدا ئەو چەشنە باوەڕە بدۆزنەوە، کە بە شێوەیەکی ئەوەندە سەرسوڕهێنەر لە باوەڕی جولەکەو مەسیحیی دەچێت، بە نوێنەرو بەڕێوەبەرێکی نەمری جیهان. دۆرکهاییم دەڵێت، بەڵام لە ئوستورالیا، ئایدیای ئەم چەشنە خوداوەندە، بریتیە لە درێژکردنەوەیەکی سروشتیی هەمان ئەو بیرکردنەوەیەی کە بەرامبەری خوداوەندە خێڵەکییەکان هەیە. کە پەیوەندیی وەبەریەککەوتنی ئەو خێڵانەی لە یەك هەرێمدا دەژین، زیادی کرد، هەروەها کە بیروبۆچوون و ئایدیاکانیان لەگەڵ یەکتریدا گۆڕییەوە، دەستیان کرد بە گریمانەکردنی ئەوەی کە هەر هەموویان یەك دانە پێشینەیان هەیە کە بایەخێکی زۆر تایبەت هەیە، ئەو پێشینەیەش خودای باڵا بوو. پەیکەرێکی گەورەی هەیە، بەڵام وەکو خوداوەندەکانی دیکە وەك بەرینکردنەوەیەکی زیاتری پرەنسیپە تۆتەمییە ئەسڵییەکە هاتۆتە بوون. چونکە ئەو ئاستەی ئێمە لێی دەکۆڵینەوە هەرچییەك بێت، ئەو پرۆسێسەی کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی باوەڕبوون بە خودا، شوێنەوارێکی روونی بۆ جێهێشتووین لەمەڕ چۆنییەتی کارکردنی. خوداوەندەکان لە پرەنسیپە تۆتەمییەکەوە دێنە دەرەوە، وەك وردەوردە لە توێی تیرەکەوە دەپاڵێورێن، سەرەتا بۆ ڕۆحەکان، پاشان بۆ ئەو پیشینانەی کە دەبن بە ڕۆحییانەتی تیرەکە، پاشانیش لەپشتی ئەوانەوە بۆ بەرزترو بەرزترین خوداوەندەکان[33].

## تۆتەمیزم و سروتەکان

دوابەشی فۆرمە بەراییەکان لە مەسەلەی باوەڕەوە وەردەچەرخێن بۆئەوەی رووبکەنە لایەنەکەی تری ئایینی ئوسترالیی: جێبەجێکردنی سروتەکان. لێرەدا پێویستە سەرنجی تێبینیەکەی

زووتری دۆرکهاییم بدەین کە دەڵێت هەست و سۆزی ئاینیی، سەرەتا لە ساتە بەرایییەکاندا سەرهەڵنادات، بەڵکو لەناو ئاهەنگە بەکۆمەڵەکانی تیرەوە سەرهەڵدەدەن. لەمەوە ئەو یاوەڕانەی لە تۆتەمیزمدا دۆزراونەتەوە، بریتی نین لە گرنگترین شت دەربارەی تۆتەمیزم. لە تێڕوانینی دۆرکهاییمدا، سروتەکان بریتین لە کەڵت *cult* (لە وشەی لاتینیی کەڵتۆس *cultus*ەوە هاتووە، کەمانای پەرستن دەگەیەنێت)، کە پێکهاتوە لە بۆنە سۆزییەکانی گرووپ، کە لە چەند بۆنەیەکی دیاریکراودا سازکراون، ئەو کرۆکی راستەقینەی پێکەوەژیانی تیرەکەیە[34]. هەرکاتێك ئەوانە رووبدەن و هەرچۆنێکیش پیادەبکرێن، ئەوا ئەم کردەوە کەڵتییانەی پەرستن، گرنگترین شتن کە خەڵکی ناو هۆزەکە هەڵیانگرتبێتەوە. ئەوانە پیرۆزن، هەموو شتێکی تر پۆخڵە. هەمیشە مەبەستی ئەوانە بریتی بوە لە پەرەدان بە هۆشی هۆزەکە، وا لە خەڵك بکەن هەست بکەن بەشێکن لێی، هەروەها بە هەموو شێوەیەك لە پۆخڵیی دوور بخرێتەوە.

لە مومارەسەکردنی تۆتەمییدا، کەڵت دابەش دەبێت بۆ دوو شێوەی سەرەکی، نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ، لە کاتێکدا کە چەشنێکی سێیەم، کە پێی دەوترێت پیکیولار (لە وشەی لاتینی پیکیولۆمەوە: کەفارەت) لەجێی خۆیەوە لەپاڵ هەردوکیاندا رۆڵێك دەبینێت. سروتەکانی کەڵتی نێگەتیڤ یەك ئەرکی سەرەکی هەیە: هێشتنەوەی پیرۆز بە شێوەیەکی جیا لە پۆخڵ[35]. بە شێوەیەکی سەرەکی لە قەدەغەکردن پێکدێن، یاخود لە تابۆکان. ئەوانە بە شێوەیەکی سەرەکی قەدەغەکردنەکان یان تابۆکان دەگرنە خۆیان. تابۆکانی شوێن پارێزگاری لە چەند شوێنێکی پیرۆز دەکەن، کە بەزۆری بەرد یان ئەشکەوتن. ئەوانە ئەو سەرچاوەیەی باوەڕن کە لە ئاینەکانی دواتریشدا باو دەبێت، ئەویش بەوەی پەرستگایەك یان کەنیسەیەك لەسەر خاکێکی پیرۆز دابمەزرێت و ببێت بە سنوری جێگایەکی یەزدانییانە. پێویستە پیرۆزو پۆخڵ لەوە دووربخرێنەوە کە بە درێژایی کات لە ناکۆکییدا بن. لەبەرئەوە کەڵتی نێگەتیڤ چەند رۆژێکی پیرۆز تەرخان دەکات بۆ فیستیڤاڵە پیرۆزەکان، یەکێك لە هەرە باوترین تابۆکان لەو رۆژانەدا بریتیە لە قەدەغەکردنی هەر چالاکییەکی رۆتینی لەوەی ژیان پۆخڵ بکات. کاری ئاسایی و گەمە قەدەغە دەکرێن، بە تەنیا حەوانەوە یاخود چالاکییە پیرۆزەکان رێیان پێدەدرێت، رێك وەك ئایینە زیاتر پێشکەوتووەکانی لە نمونەی جانسینیزم یان مەسیحییەت لە شەممە یان یەکشەممەدا داوای دەکەن. ئەگەر ئەو یاسایانە نەگونجاو یان بێزارکەر بێتە بەرچاو، نابێت کەس سەری بسوڕمێنێت، چونکە خۆیان هەر چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت کە وەهابن. رۆڵی ئەوان ئەوەیە فشاری پێویستیی نکوڵییکردن لە خود بخەنە سەر هەموو کەسێك، یاخود لە پێناوی گرووپدا، تەنانەت ئازاریش قبووڵ بکەن. دۆرکهاییم لەسەری دەڕوات، لە راستیدا ئەمەیە هۆی ئەوەی کە نزیکەی هەموو ئایینەکان، بە شانازییەوە ئاماژە دەکەن بۆ چەند کەسێکی دیاریکراو ـ زاهیدەکان، وەك خۆیان دەڵێن، ئەوانەی کە بەشێوەیەکی

سەخت نکوڵیی لە خودی خۆیان دەکەن. بێشك ئەو چەشنە خەڵکانە زۆر ڕێزیان لێدەگیرێت. ئازارە زۆرەکانیان و خۆچروساندنیان، ڕەتکردنەوەی چێژی سێکس، خواردنی باش، یاخود لەزەتەکانی تر، مانای خزمەتکردنی ئیدیاڵێکی هەموانە. ئەوانە مۆدێلن بۆئەوەی کە لە پلەیەکی نزمتردا لە هەموو کەسێك داوادەکرێت بۆ چاکەی تیرەکە[36]. بەبێ قوربانیدان بە خود، تیرەکە نە دەتوانێت بمێنێتەوە و نە دەشتوانێت بەرگە بگرێت.

کەواتە، بە شێوەیەکی ئاسایی، پیرۆزییەکان سنورکراون، هەروەها بەلای کەڵتە نێگەتیفەکانەوە، ئەوەیە کە ئاواهی بهێڵرێنەوە. هەرچۆنێك بێت کە کات و شوێنەکە دروست بن، ئەوا تیرەکە دەگوێزێتەوە بۆ جیهانی پیرۆزیی، کەواتە ماناکانی جێبەجێکردنی ئەمە، بەهۆی ئەو سروتانەوە دەبێت کە دۆرکهاییم وا پێناسەیان دەکات کە بگەڕێنەوە بۆ کەڵتە پۆزەتیڤەکان. بەلای ئوستراڵییەکانەوە، سروتی سێنتەریی بریتییە لە ئینتیچینۆما، ئەو ئاهەنگەی کە دەشێت بیهێنینەوە یاد کە، ڕۆبێرتسۆن سمیس، فریزەر، هەروەها فرۆیدیش دۆزیویانەتەوە، بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە شێوی یەزدانیی مەسیحیی دەچێت. لە سەرەتای هەموو وەرزێکی باراناوییدا، پیاوانی هۆزەکە زنجیرەیەك ئاهەنگ دەگێڕن بۆ پیشخستن و گەشەکردنی تۆتەمەکەیان. لەسەر چەند تاشەبەردێکی پیرۆز، کردەوە پیرۆزەکانیان دەستپێدەکەن، پاشان ماوەیەکی پڕ لە جۆش و خرۆشی ئاینیی بەدوایدا دێت، ئینجا لە سروتێکی بە سام و هەیبەت و پیرۆزدا، خودی بوونەوەرە تۆتەمەکە دەکوژرێت و لە شێوێکی پیرۆزدا دەخورێت. دۆرکهاییم پرسیار دەکات، ئەمە بۆچی دەکرێت؟ وەك ڕۆبێرتسۆن سمیس بە دروستی بینیویەتی، بریتییە لە بەراییترین فرۆمی قوربانیدانی پیرۆز، کە لە گەڵێك ئایینی دواتریشدا جێگایەکی سێنتەریی داگیر دەکات. لە پەرستنی تۆتەمەکەدا، هەر کەسێك بە شێوەیەکی میللی ئاهەنگ بە دەرکەوتنیەوە دەگێڕێت و ڕادەگەیەنێت کە پابەندی ئەو دەبێت و شکۆداری دەکات، لە بەرامبەریشدا، بە خواردنی تۆتەمەکە، هەریەکێکیان لە خوداوەندەکەوە جزیسکێکی هێزی یەزدانیی بەردەکەوێت، لەگەڵ نوێبوونەوەی ژیانی یەزدانیی لە ڕۆحیدا. دۆرکهاییم بە شێوەیەکی بلیمەتانە، بە گۆڕینەوەیەکی پیرۆزانە وەسفی دەکات. لە سروتی ئینتیچیومادا، پەرستیارەکان ژیان دەبەخشن بە خوداوەندەکەیان، خوداوەندیش دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەوان.

لەسەر ئاستی دەرکەوتنەکان، بێشك دەشێت تۆزێك دڕدۆنگیی هەبێت کە ئینتیچیوماکەی ئوستراڵییەکان، سروتێکی ئاینیی تەواوەتی بێت. مامەڵەی نێوان خەڵکی ناو تیرەکەو خوداوەندەکەیان. لە ژێرەوە، یاخود لە ڕاستیدا، شتێك نیە لە نوێبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتییانەی ژیانی تیرەکە. لەژێر توێکڵی تیۆلۆجیادا، چینی سەرەوەی سۆسیۆلۆجیا خۆی حەشارداوە. دۆرکهاییم ئەمە بەمشێوەیە ڕوون دەکاتەوە:

ئەگەر پرەنسیپی پیرۆزی جگە لە گۆڕینی سیمای کۆمەڵگاو کەسێتییەکەی شتێکی تر

نەبێت، ئەوا شتێکی شیاو دەبێت کە بەهۆی زاراوە کۆمەڵایەتییەوەکانەوە، سروتەکان لێک بدەینەوە. هەروەها وەکو مەسەلەیەکی راستی، ژیانی کۆمەڵایەتی رێک وەك سروتەکان لەناو بازنەیەکدا دەجولێتەوە. لەلایەکەوە،، تاك باشترین بەشی خودی خۆی لە کۆمەڵگاوە وەردەگرێت، کە ئەمەش وەزیفەیەکی ناوازەو جێگایەکی تایبەتی پێدەبەخشێت لەناو بوونەوەرەکانی تردا... کەلتورە رۆشنبیریی و ئاکارییەکەی، بەلام لەلایەکی تریشەوە، کۆمەڵگا تەنیا لەتوێی تاکەکانەوە بوونی هەیەو دەژی. ئەگەر ئایدیای کۆمەڵگا لە بیروباوەڕەکانی تاکدا بسڕێتەوە، ئیتر تاکەکان چیتر هەست بە دابونەریت و سرودەکانی کۆمەڵگا ناکەن و پێڕەوییان لێناکەن، کۆمەڵگا دەمرێت. دەتوانین هەمان شت دەربارەی ئەم بڵێین، ئەوەی دەربارەی یەزدانێتی وتمان: ئەوە تەنیا تا ئەو ئاستە راستەقینەیە کە لەناو هۆشی مرۆڤدا جێگایەکی هەیە، ئەم جێگایەش هەرچییەك بێت کە پێی ببەخشین. ئێمە ئێستا هۆیە راستەقینەکە دەبینین، کە بۆچی خوداوەندەکان ناتوانن بەبێ پەرستارەکانیان هیچ سودێکیان هەبێت زیاتر لەوەی کە بۆ ئەوانە هەیانە کە باوەڕیان بە خودا نییە، هۆی ئەمە کۆمەڵگایە، کە لەوێدا خوداکان تەنیا دەربڕینی رەمزییانەن، ناتوانن بەبێ تاکەکان، هیچ شتێکیان پێ ناکرێت جگە لەوانەی کە دەشێت بەبێ کۆمەڵگا بکرێن[37].

لەم پەرەگرافە گرنگەدا، دەتوانین لە هەر جێگایەکی تری فۆرمە بەراییەکان، روونتر ئەو گریمانانە ببینین کە لەناوجەرگەی تیۆرییەکەی دۆرکهاییمدان. لە دوایین شیکاردا، باوەڕو سروتە ئاینییەکان، بریتین لە گوزارشتکردن لە واقیعی کۆمەڵایەتی[38]. پەرستنی تۆتەم لە راستیدا بریتیە لە داننان بە شکۆداریی هۆزدا. خواردنی تۆتەمەکە لە راستیدا بریتیە لە جەختکردنەوەو سەپاندنەوەی گرووپ، ئەمە رێگایەکی رەمزییانەیە بۆ هەر تاکێك، بۆئەوەی بڵێت کە هەمیشە هۆز لە خودی تاك گرنگترە.

بۆیە سروتە تۆتەمییەکان دەمانخەنە جێگایەکەوە کە بتوانین دابودەستورە ئاینییەکان بە هەمان ئەو رێگایە لێك بدەینەوە کە ئایدیاکانی تۆتەم دەتوانن باوەڕە ئاینییەکان لێك بدەنەوە. جارێکی تریش چەمکی کۆمەڵگا کلیلەکەمان پێشکەش دەکات. وەزیفەی سروتە ئاینییەکان، کە لە باوەڕەکان زۆر بنەڕەتیترن، بریتیە لە ئامادەکردنی بۆنەی وەها کە تێیدا تاکەکان پەیمانی خۆیان لەگەڵ کۆمەڵگادا نوێ دەکەنەوە، لەناو ئەو مۆدێلە پیرۆزەدا بیری خۆیانی بهێننەوە کە پشت بە هۆز دەبەستن، رێك وەك ئەوەی هۆز پشت بەوان دەبەستێت. رۆژانی فێستیڤاڵ و فێستیڤاڵەکانیش بۆ ئەوە دێنە بوون کە کۆمەڵگا، کۆمەڵ، بگێڕنەوە بۆ بەشی سەرەوەی هزری خەڵك، بۆئەوەی پاڵ بە تاکەکانەوە بنێنەوە، ئەوانەی بە خودی خۆیان کیفایەتیان کردووە، بۆ جێگایەکی سانەویتر، کە ئەوان سەر بەوێن.

لەپاڵ ئەوەدا سروتەکانی تریش لەپاڵ ئاهەنگی ئینتیچیومادا، دەکەونە ناو کەڵتێکی پۆزەتیڤەوە. بۆ نمونە، سروتێکی لاساییکردنەوە هەیە، لە چەشنی ئەوەی فرێزەر وەکو چەشنێك لە

سیحر پۆلاندوویەتی. لە سروتەکانی هۆزێکی دیاریکراودا، خەڵکەکەی لاسایی خوێندنی باڵندە تۆتەمییەکانیان دەکەنەوە، وا دەزانن کە ئەوە وایان لێدەکات بتوانن دیسان بەرهەم بهێننەوەو گەشەش بکەن. لە حاڵەتەکانی تردا، ئەو شتانە هەیە کە دۆرکهاییم پێیان دەڵێت سروتە "نوێنەرایەتییەکان"، یاخود سروتەکانی یادەوەریی، کە لەوێدا هەر ئەندامێکی کۆمەڵگا بە سادەیی ئەفسانەی پێشینانی مەزن بۆ گروپێك لە گوێگران دەگێڕێتەوە، کە وادیارە تەنیا بۆ کات بەسەربردن و ئامۆژگارییە. بەڵام تەنانەت ئەگەر واش بێت، مۆتیڤی مەبەست شتێکی کۆمەڵایەتییە. دواجار، گێڕانەوەی چیرۆکی پێشینان، بریتییە لە بەستنەوەی ئەندامانی رابردووی کۆمەڵ بەوانەوە کە زیندوون و ئامادەن. هەروەها خەڵکی وایان لێبێت باوەڕ بکەن کە چەند سروتێکی دیاریکراو دەتوانن بە شێوەیەکی ئەفسوناویی وا لە تۆتەمەکە بکەن بە ڕاشکاویی بێتەوە بەرهەم بەهۆی ئەو هێزەوە کە ئەو ئاهەنگانە هەیانە کە دەخرێتە روو بۆ یەکخستنی ئەندامەکانی هۆز. ئەوە هێزە کۆمەڵایەتییەکەی سروتەکانە کە دەمانبات بۆ ئەو بیرەی کە ئەوانە بەهەمان شێوە هێزی فیزیاییشیان هەیە.

## سروتە نامۆکان

دواجار لەپاڵ هەردوو کەڵتە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکاندا، چەند سروتێکی گرنگ هەن کە دۆرکهاییم پێیان دەڵێت نامۆکان[39]. ئەوانە سروتی کەفارەتکردن و پرسەگێڕانن، کە هەمیشە دوای مردنی کەسێك یاخود رووداوێکی تراجیدییانە رێکدەخرێن. تایلۆر پێی وابوو کە خەڵکە بەراییەکان ئەو چەشنە سروتانە سازدەکەن بۆ ئەوەی ئاشتی لەگەڵ رۆحیانەتی مردووەکەدا ببەستن، کە لەوە تووڕە بوون کە ژیانەکانیان کۆتاییان پێهاتووە. وەلێ دۆرکهاییم جارێکی تریش هۆیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەش دەکات. لەوکەلتورانەدا کە ئاهەنگی پرسەگێڕان بریتییە لە گریان بە دەنگی بەرزو لەخۆدانی پەرێشانانە، ئەو رەفتارانە بە تەنیا شتێکی عەفەویی و هەژانی هەستی نین، ئەوانە بە تەواویی ئاماژەی زۆر رەسمییانەن، کە وەك دابونەریت لە هەموو ئەندامەکانی هۆزەکە داوا دەکرێن، تەنانەت ئەوانەش کە زۆر لە دوورەوە کەسە مردووەکەیان ناسیوە. بەڵام بۆچی؟ چونکە کاتێك یەکێك دەمرێت، بە تەنیا خێزانەکەی کۆستیان نەکەوتووە، سەراپای هۆزەکە ئەندامێکیان لەدەست چووە، بەشێك لە هێزی خۆی لێ زایە بووە. لەو کاتانەدا، پێویستە لە توێی کەلتورەکەوە، هۆزەکە سەرلەنوێ خۆی رێك بخاتەوەو بژێتەوەو سەرلەنوێ خۆی بسەلمێنێتەوە. لە سەردەمە زووترەکاندا سروتەکان کە بریتین لە کۆبوونەوەو لاواندنەوەو سنگ کوتان، راستەوخۆ ئاڕاستەی هیچ رۆحیانەتێك یان خوداوەندێك نەدەکران. لەراستیدا باوەڕبوون بەو بونەوەرە رۆحییانە، دواتر بە تێپەڕینی کات پەرەیان سەندووەو بەتەنیا وەك ئەنجامێکی سروتەکان وابوون، تەنیا بۆئەوەی

وێنەیەکی عەقڵیی باشتر بدەن، وەکو چەقێك بۆ کردەوەکانیان. لە بنەڕەتدا هیچ خودایەك لە ئارادا نەبوو بۆئەوەی فەرمان بدات سروتەکان ئەنجام بدرێن، ئەو سروتانەی کە بە تێپەڕینی کات، خۆیان خوداوەندەکانیان خوڵقاند.

لە کۆتاییدا، سروتە نامۆکان، دوولایەنی دەبڵێ دەسەڵاتی پیرۆزیی نیشان دەدەن، کە دەشێت تاریك و شەیتانیی بن، وەك چۆن دەشێت رۆشن و یەزدانیی بن. رێك وەك چۆن کەلتوری پۆزەتیڤ بریتییە لە شایی هۆزەکە لەوپەڕی چوستی و چالاکی بە رابواردن و متمانە بەخۆکردندا، دەکەوێتە ناو کەلتورە نامۆکانەوە بۆئەوەی لە توێی راڕەوە نوتەکەکانییەوە بەڕێی بکات. ساتەکانی پەژارە، کارەسات و لێقەومان، ترس، یاخود دڵنیانەبوون لەوەی دەشێت لە هەرکات و شوێنێکدا بێت ببێت بە مایەی نەهامەتی بۆ کۆمەڵەکە. لێرەدا دەتوانرێت نمونەیەك بۆ ئەم خاڵەی دۆرکهاییم لە مێژووی نزیکەوە بهێنرێتەوە. لە نۆڤەمبەری ساڵی *1963*دا، کاتێك سەرەك جۆن کەنەدی تیرۆر کرا، بەڵام کەم کەس لە ئەمریکییەکان دەتوانن ئەو کارەساتە هەژێنەرو تەزوو بەلەشدا هێنەرە لەیاد بکەن کە کاریگەریی لەسەر گەل هەبوو، ئاهەنگێکی پرسەگێڕانی خەماوییانە لەسەر شەقامەکانی پایتەختدا بەرپاکراو چەند سروتێکی جەرگسوتێنەر لە گۆڕستانی ئارلینگتۆنی نەتەوەیی سازکرا. ئەوانەی لەهەموو شارو شارۆچکەکانەوە سەیری ئاهەنگەکەیان دەکرد، دەتوانرا بە باشی ببینرێت کە سەراپای گەلەکە یەك تاقە خێزانی کۆستکەوتوو بوون. چەمکەکەی دۆرکهاییم لەمەڕ سروتە نامۆکان، بە جوانی روونی دەکاتەوە کە بۆچی دەبوو وابوایە. میزاجی کۆمەڵگا هەرچییەك بێت، سروتەکانی ئایین بە شێوەیەکی جێگیر پەرچی دەکەنەوەو تازەی دەکەنەوە.

## دەرەنجام

دۆرکهاییم بە مکومیی جەخت دەکات کە ئەگەر شیکردنەوەکەی دروست بێت، ئەوە شتێکی زۆر هەیە لە خەڵکە بەراییەکانی ئوستралیاوە فێری ببین. دەتوانرێت لە ناتۆتەمیزمی خێڵ و هۆزەکانی ئەواندا، فۆرمە بنەڕەتییە دروستەکانی ژیانی ئاینیی بدۆزرێتەوە: جیاکردنەوەی پیرۆزو پۆخڵ لە یەکتریی، ئایدیاکانی رۆح و رۆحییانەت، دەسپێکی بونەوەرە ئەفسانەییەکان و خوداوەندە مەزنەکان، هەروەها پۆلاندنێکی تەواوی سروتەکان، بەوانەشەوە کە هی قەدەغەکردن (تابۆکان)، ئاهەنگ، لاساییکردنەوە، یادەوەریی، خەم و پەژارە. کە ئەمەمان بەدەستەوە بێت، ئەوە شتێکی شیاو دەبێت تیۆرییەك دابمەزرێنین کە دەشێت لە توێی مێژوو، هەروەها کەلتورەکانیشەوە پیادە بکرێت، بۆ روونکردنەوەی باوەڕە ئاینییەکان، ئیتر هەرچەشنێك بن. تیۆرییەکەی دۆرکهاییم گوێ ناداتە ئەوەی لە کوێدا بۆ پێناسەکردنی هۆیەکانی دەگەڕێین. هەموو ئایینەکان. ئەو هۆیانە بە شێوەیەکی سەقامگیر گەڕێنراونەتەوە بۆ ناو کۆمەڵایەتی. بۆیە

شتێكی زەحمەتە بتوانین لەناو ئایینە باڵادەستەكانی جیهاندا، تێبینی بكەین كە ئەوانە بەبێ هەڵە لەناو ئەو نەریتە ئاڵۆزانەدا ئامادەییان هەیە، وەك ئەوەی سادەترین تۆتەمیزم بن. خۆرهەڵات یان خۆراوا، دێرین یان هاوچەرخ، باوەڕەكان و سرووتەكان، هەردەم گوزارشت لە پێداویستییەكانی كۆمەڵگا دەكەن. بە شێوەیەكی جێگیر داوا لە هەموو ئەندامەكان دەكەن لە پێشەوە بیر لە كۆمەڵ بكەنەوە، دەرك بە گرنگیی گرووپ بكەن، هەست بە هێزەكەی بكەن، هەروەها قوربانیی بدەن بە چێژە شەخسییەكانی خۆیان لەپێناوی خۆشگوزەرانیی بەردەوامی ئەودا. بەم پێیە رۆڵی ئایین، بریتی نییە لە راگەیاندنی بیروبۆچوون دەربارەی جیهانی دەرەكی، یان فێركردنی ئەوەی وا دەزانن دەربارەی ئەفراندنی جیهان، بوونی خوداوەند، یاخود ژیانی دوای مردن، بیریان لێكراوەتەوە دروست بن. دواجار هەموو ئەم بابەتانە، كە جاران خەڵكی وایان دەزانی بۆ باوەڕ گونجاون و پێویستن، جێبهێڵرێن بۆ زانست، كە ئەمیان سیستمێكی زۆر زیاتر گونجاوتری بیركردنەوەیە، كە لەراستیدا، ئایین خۆی یاریدەی سەرهەڵدانی داوە. مەبەستی دروستی ئایین بریتی نییە لە بابەتی رۆشنبیریی، بەڵكو بریتییە لە بابەتی كۆمەڵایەتی كە خزمەتی هەڵگرانی سۆزی كۆمەڵایەتی دەكات، ئەو هێماو سروتانە پێشكەش دەكات كە وا لە خەڵك دەكەن بتوانن گوزارشت لە هەستوسۆزی قووڵی خۆیان بكەن، كە بە كۆمەڵگاكەیانەوە گرێیان دەدات. لەوەش زیاتر، ئایین كە ئەمە دەكات، یاخود جێی دەگرێتەوە، هەمیشە لەگەڵماندا دەبێت چونكە ئیتر ئایین لەسەر زەمینەی راستەقینەی خۆی رادەوەستێت، پارێزگاریی لە"رۆحی كۆمەڵگا" دەكات.

## شیكردنەوە

لە شوێنكەوتنی لێكۆڵینەوەكانی دۆركهاییمدا دەربارەی ئایین، بە شێوەیەكی سروشتی ناچاربووین بەسەر هەندێك وردەكارییدا باز بدەین، بەڵام دەبێ ئێستا هێڵە سەرەكییەكانی تیۆرییەكەی ئەو روون بووبنەوە. هەر لە سەرەتای دەركەوتنی "فۆرمە بنەڕەتییەكان"ەوە، سەراسیمەبوونێكی خوڵقاندووە، بەتایبەتی لە فەرەنسا، كە هاوكارو قوتابییەكانی دۆركهاییم قایل بوون بەوەی لە دیدە كۆمەڵایەتییەكانەوە بڕواننە ئایین. تەنانەت لە دەرەوەی فەرەنساش، دۆركهاییم بە شێوەیەكی بەرفراوان ناسرا. لە بەریتانیا، لەژێر كاریگەریی ئەودا لێكۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆجیا پێكهێنرا، هەروەها كایەی نوێی سایكۆلۆجیای كۆمەڵایەتی لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش هەروابوو، كە لەوێ قسەكەرێكی بەرچاوی وەك جی. ئێچ. مید و سی. ئێچ. كووڵەی، ئایدیاكانی ئەویان هەڵگرتەوە بۆ بەرنامەی لێكۆڵینەوەكانی خۆیان[40]. دەتوانرێت شوێن پەنجەی تۆخی دۆركهاییم لە لێكۆڵینەوە نایابەكانی ئاییندا بدۆزرێتەوە، لە وێنەی "خێزانی خودا ـ 1959"ی دەبلیو. لیۆد وارنەر، كە هێزی سیمبوڵیزمی مەسیحیی لەناو كۆمەڵگا

ئەمریکییەکاندا، تەقاندەوە، هەروەها شیکردنەوەی ئایین و کۆمەڵگا لە هەریەکە لە ئەمریکاو یاباندا لەلایەنی سۆسیۆلۆجیستی هاوچەرخ رۆبەرت بێلاوە. لەناو ئەوانەدا کە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا کاردەکەن، بیرکردنەوەکەی دۆرکهاییم بە راشکاویی بایەخی نوێی پێدەدرێت و دەبێتە هۆی کردنەوەی هێڵی تازەتری پرسیارکردن.

> **دۆرکهایم نەك هەر تاکە بیرياری سەردەمەکەی خۆیەتی کە دەڕوانێتە دەسەلاتی "کۆمەلایەتی" لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکو ئەو بە شێوەیەکی ناوازە لە گرنگیی ئەوە تێدەگات و دەیکات بە سەرتۆپی لێکۆڵینەوەکەی**

ئەم هەموو دانپێدانانە بۆچی؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە بەشێکیدا لەناو ئەو حەقیقەتەدایە کە دۆرکهاییمیش وەکو فرۆید، بیریارێکی زۆر بەرفراوانە. ئەو رێگایەکی نوێ لە سۆسیۆلۆجیادا دەدۆزێتەوە بۆ تێگەیشتنی نزیکەی هەر دیاردەیەکی رەفتاری مرۆڤ، نەك بەتەنیا ئایین، بگرە زانست، فەلسەفە، مێژوو، ئاکار، رۆشنبیریی، سیاسەت و هەروەها سیکۆلۆجیاش. لەوەش زیاتر، کاتێك بە شێوەیەکی تایبەتی بایەخ بە ئایین بدرێت، شیکردنەوەکانی ئەو رێگا دەکەنەوە بۆ چەندان تیۆروانینی نوێ و جیاجیاو پیادەکردنی زۆرو زەوەند، دواجار لەناو ئەوانەدا، چواریان شایستەی ئەوەن لێرەدا ئاماژەیان پێبدەین.

## کۆمەڵگاو ئایین

وەك لە تویێی ئەم دەمەتەقێیەوە، دەرمانخست، کرۆکی تیۆروانینی دۆرکهاییم لە راگەیاندنەکەیدایە" ئایین بە شێوەیەکی دیار شتێکی کۆمەڵایەتییە"[41]. ئەو پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی کە گەرچی ئێمە هەمووومان وەکو تاك هەڵبژاردن لە ژیانی خۆماندا دەکەین، بەڵام ئێمە ئەو هەڵبژاردنانە لەناو چوارچێوەیەکی کاری کۆمەڵایەتییدا ئەنجام دەدەین، ئەوەی لە رۆژی لە دایکبوونەوە پێمان دراوە. "ئێمە بە زمانێك قسە دەکەین کە خۆمان دروستمان نەکردووە، ئەو ئامێرانە بەکاردەهێنین کە خۆمان دامان نەهێناون، داوای ئەو مافانە دەکەین کە نیمانن، سامانێکی زانین بۆ هەر نەوەیەك دەگوازرێتەوە کە خۆی بەدوایدا نەگەڕاوە"[42]. ئایین لە هەموو کەلتورەکاندا، شایستەترین بەشی ئەوەیە کە پێی دەوترێت سامانی کۆمەڵایەتی. خزمەتی کۆمەڵگا دەکات بەوەی هەر لە ساوایەتییەوە ئایدیاکان، سروتەکانیان پێشکەش دەکات، هەروەها هەستکردنە بەوەی لە توێی ئەوەوە رێنمایی ژیانی هەموو تاکێك دەکرێت. پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوە، لە بارودۆخی ئیستادا، دەمەتەقێ لەسەر"کاریگەریی کۆمەڵایەتی" لەسەر ئایین بووە بە شتێکی ئەوەندە رۆتینی کە وەك هەستێکی گشتیی لێهاتووە، هەمووان لەو بارەیەوە قسە دەکەن. بەڵام بۆئەوەی ببینین کە ئەم گۆشەنیگایە چەند ناوازەیە، ئەوا تەنیا پێویستیمان بەوە هەیە کە بیری خۆمانی بێنینەوە، کە تەنیا نیو سەدە

پێش دۆرکــهاییم تــایلۆر چــۆن دەربــارەی ئــایین نوسیویەتی. کاتێك ئەو بایەخ بە ئایینە بەراییەکان دەدات، ئــەو بــە تــەنیا باســی "تــاکی فەیلەســوفی کێویی" دەکات، بە تەنیا بیر لـە شێوازی ئەو تاکە دەکاتــەوە، لــە ئایدیاکــانی رۆح و خوداوەندەکــان. فرۆیدیــش بــە هــەمان شــێوە. بۆیــە ئــەو بــەدوای گرنگیی خێزان و کۆمــەڵگادا دەگــەرێت، هــەروەها چــەقی تێڕوانینیشــی لەســــەر کەســێتی تاکیشــە. هەرچۆنێك بێت تێڕوانینەکەی دۆرکهاییم جیاوازە. دۆرکهاییم نــەك هــەر تاکــە بیریــاری ســەردەمەکەی خۆیەتی کە دەڕوانێتە دەسەڵاتی "کۆمەڵایەتی" لـە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکو ئەو بە شێوەیەکی ناوازە لـە گرنگیــی ئــەوە تێدەگــات و دەیکــات بــە ســەرتۆپی لێکۆڵینەوەکەی.

## میتۆدی زانستی

دۆرکــهاییم شــانازییەکی گــەورەی پێدەبڕێــت بەوەی کە زانایە. هەروەك تیوریستەکانی سەرەتا، دەیویســت داتــا کۆبکاتـــەوە، بــەراوردی بکــات، بیپۆلێنێت، ئینجا گشتاندنی تێدا ئــەنجام بــدات، یــاخود یاساکانی دیاریی بکات، بۆئەوەی روونــی بکاتەوە. بە ڕێگایەکی دیاریکراو، دەست دەداتــە هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایــەتی. ئەو گریمانــە دەکــات کەکۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان لە سادەوە بەرەو ئاڵۆز پەرەدەســێنن. هــەروەها قــایل دەبێــت بــەوەی کــە باشترین خاڵ لێوەی دەست پێبکرێــت بریتیــە لــە کەلتوری سادەی ئەوانــەی پێیان دەوترێت خەڵکە بەراییـــەکان. بێشـــك ئـــەو حـــەزی لـــە ئایدیـــای هێڵکارییـــەکی دوورودرێـــژی پەرەســـەندنی مـــرۆڤ نییـــە. ئـــەو بەشـــی زۆری ئـــەم تێڕوانینـــە رەت دەکاتەوە، کاتێك لە فەلسەفەکەی ئۆگست کۆمتدا پێی دەگات. هــەروەها دیدەکــەی فرێزەریــش رەت دەکاتــەوە، کەپۆرترێتی رەوتی مرۆڤایــەتی ئامــادە دەکات، بە ســەقامگیریی لــە توێــی ســەردەمەکانی ئەفسون، ئــایین، زانســتەوە بــەرەو پێــش دەڕوات. هـــــەروەها لـــــە بەرامبـــــەری ئەنترۆپۆلۆلیجســـــتە بەریتانییەکاندا، ئــەم پێدادەگرێــت لەســەر ئــەوەی پێویستە میتۆدی بەراوردکاریی بەکارنــەهێنین بــۆ دۆزینـــەوەی کۆســـتمەکانی بـــاوەڕ لـــە جیـــهانی دەوروبەرمانـــەوەو پاشـــان لـــە دەرەوەی ژینگـــەی خۆیاندا، لەناو چەند هێڵکارییــەکی لێنەکۆڵراوەی پێشکەوتنی مێژووییدا، ریزیان بکــەین. ئەوە بــێ ســـوودە. لـــێرەدا فۆرمـــە ســـەرەتاییەکان وەکـــو مۆدیلێك خزمــەتمان دەکات. دەبێــت لەســەر تاکــە کۆمەڵگایــەك ســەنتەر بگریــن، بــە وریـــایی لێـــی بکۆڵینــەوە، بچینــە نــاو وردەکارییەکانــەوە. تــەنیا دوای ئــەوەی ئــەو کــارە وردە ئــەنجامدرا، ئینجــا تیوریستەکان دەتوانن چەند بەراوردێکی سنوردار بکـــەن لەگـــەڵ کۆمـــەڵگاکانی تـــردا، تەنانـــەت ئەوکاتەش، تەنیا ئەگەر ئەو کۆمەڵگایانە لە هەمان تــەرز و تایپ بن[43]. ئەو پێدادەگرێت، کە زانســتی راســتەقینە، بــە هێواشــی کاردەکــات ـ لــە چــەند نمونەیـــەکی کەمـــەوە کـــە بـــە وردیـــی لێیـــان کۆڵراوەتـــەوە، نـــەك لـــە خـــەرمانێك نمونـــەی هەڕەمەییەوە.

لە ساڵانی دوای جەنگی جیهانیی یەکەمەوە، ئەم خاڵــە گرنگەی میتۆدەکــەی دۆرکــهاییم خرایــە ناوجەرگــەی کایــەی ئەنترۆپۆلۆجییەوە، بەتایبــەتی

لە بەریتانیاو ئەمریكا. لە ئینگلتەرە، بە شێوەیەكی تایبەتی لەلایەنی تیوریستی كۆمەڵایەتی ئەی. ئار. رادكلیف ـ براون و ئەنترۆپۆلۆجیستی مەیدانیی برۆنیسلاڤ مالینۆڤسكییەوە پەرەی پێدرا، كە ئەمیان دەربارەی ئایین و سیماكانی تری كەلتورە بەراییەكانی باشوری پاسفیكەوە نوسیویەتی[44]. ئێستا، پرەنسیپی پشكنینی یەك دانە كۆمەڵگاو بەس، بە قووڵیی، پێش ئەوەی دەست بكرێت بە بەراوردكردن، بە شێوەیەكی بەرفراوان لە زانستی كۆمەڵایەتیدا سەلمێنراوە. وادەردەكەوێت كە كۆتایی هێنابێت بە ئومێدە گەورەكانی تایلۆرو فرێزەر و هاوكارەكانی تریان لە سەردەمی دێرینی ئەنترۆپۆلۆجیای ڤیكتۆرییدا.

## سروت و باوەڕ

دۆركهاییم دیسان لە مەسەلەی پرسیاری پەیوەندیی نێوانی سروتە ئاینییەكان و باوەڕدا، لە رێبازەكانی تایلۆرو فرێزەر جیادەبێتەوە. نزیكبوونەوە رۆشنبیرییەكانی ئەوان دەڵێن كە باوەڕەكان و ئایدیاكان دەربارەی جیهان، بریتین لە رەگەزە سەرەتاییەكانی ژیانی ئاینیی. نەریتە ئاینییەكان، كۆستم و سروتەكانیان، بە شتێكی ناوەندیی دادەنرێن، لە باوەڕەكانەوە دێن و پشتیان پێدەبەستن. وەك تێبینی كراوە، بەپێی ئەم تێڕوانینە، نەریتەكانی ئەو خەڵكەبەراییانە، كە لەگەڵ پادشا مردوەكانیاندا، خزمەتكارەكانیشیان دەخەنە چاڵەوە، لە باوەڕێكی پێشترەوە سەرهەڵدەدات، بەوەی دوای مردن، رۆحی پادشاكە پێویستیی بە رۆحی خزمەتكارەكانی دەبێت بۆئەوەی خزمەتی بكەن. بە شێوەیەكی لۆجیكییانە باوەڕەكە پێش سرووتەكە دێت، ئەو ئایدیایەی كە دەتوانرێت بوترێت بووەتە هۆی نەریتەكە[45]. لە بیركردنەوەی دۆركهاییمدا رێك تێڕوانینی پێچەوانە دێتە پیشەوە. بەلای ئەوەوە سروتەكانی ئایین لەپێشەوەن، ئەوانەن كە بنەڕەتین و بەڕاستیی ئەو باوەڕانە دەخوڵقێنن كە لەگەڵیاندا دێن. دەڵێت، ئەگەر دەربارەی ئایین شتێكی ئەبەدیی هەبێت، ئەوەیە كە كۆمەڵگا هەمیشە پێویستی بە سرووت، چالاكیی ئاهەنگسازانە هەیە بۆ نوێبوونەوەو گوێڕایەڵیكردن. لە توێی ئەوانەوە، بیری خەڵكی دەخرێتەوە كە هەمیشە گرووپ گرنگترە لە هەریەكێك لە تاكە ئەندامەكانی. بە پێچەوانەوە، باوەڕەكان، شتێكی زۆر ئەبەدیی نین. لەكاتێكدا وەزیفەی كۆمەڵایەتیی سروتە ئاینییەكان هەمیشە بە جێگیریی ماوەتەوە، ناواخنی رۆشنبیرییانەی باوەڕی ئاینیی، هەردەم قابیلی گۆڕان بوون. باوەڕەكان هەمیشە لایەنە تێڕامانییەكەی ئایین بوون. رەنگە بەكەڵكی ئەوەبێن كە مەسیحییەت لە جوولەكەیی یان هیندوسی جیابكەنەوە، بەڵام لە راستییدا، ئەو ئایدیا دیاریكراوانەی جەختی لەسەر دەكەن جیاوازییان كەمە، هەمیشە لە ئاینێكەوە بۆ ئاینێكی تر ئایدیاكان دەگۆڕێن، تەنانەت لە هەمان ئاینیشدا، لە سەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی تر، دەگۆڕێن. بەڵام هەمیشە ئاهەنگ و بۆنەكان پێویستن، ئەوانە سەرچاوەی راستەقینەی یەكێتیی كۆمەڵایەتین، هەروەها ئەوانە پێوەستە راستەقینەكانی ناو هەموو

کۆمەڵگایـەکن. ئەوانـە مانـای راسـتەقینەی ئـایین ئاوەڵا دەکەن.

## راڤەکردنی وەزیفەیی

مەسـەلەی سـروت دەمانباتـە نـاو دڵـی تیورییەکـەی دۆرکهاییمـەوە: راڤـەکردنی وەزیفەییانەی ئایین. دۆرکهاییمیش وەکو فرۆید، خۆی وادەبینێت کە نەک تەنیا تیۆرییەکی جیاواز ئامادە دەکات، بەڵکو تیورییـەک کـە چەشـنەکەی جیاوازە لەوانەی پێش خـۆی هـاتوون. ئـەو پێـی وایـە دەتوانێـت لـە راڤـەکردنی ئـاییندا بچێتـە ژێرەوەی شتەکانەوە. تایلۆرو فرێزەر هەوڵ دەدەن کـە ئـایین چـۆن دەردەکـەوێت ئـاوا راڤـەی بکـەن، ئەوانـە کۆمـەڵێکی زۆر یـان کـەمی ئـەو باوەڕانـە وەردەگرن کە خەڵکە ئاینداڕەکـان هەیانـە، ئینجا دەپرسـن ئـەم باوەڕانـە چـۆن ژیـان و کارەکانیـان لێکدەدەنـەوە. لـەم نزیکبوونـەوە رۆشـنبیرییەدا، ئایدیـاو باوەڕەکـان، لایەنـە تێرامانییـەکانی دۆرکـهاییم لـە ئـایین کلیلـی راڤـەکردنی کەلتوورەکانی تـرن. بۆ شـوێنکەوتووانی تـایلۆر، سروتێکی بەرایی هەستی ئـەوەمان لـەلا دروست دەکات کە دەزانین باراندروستکەرە هیندییەکان بە لاساییکردنەوەی هەورەگرمە بۆی هەیە گەردلوێك بخولقێنێت و رێژنەباران بنێرێت بۆ کێڵگەکانیان. لەوانەیە پرەنسیپی ئەفسونی لاساییکەرەوە بەلای ئیمـەوە شـتێکی پرووپـووچ بێـت، بـەڵام بـەلای خۆیەوە وانیە، کەواتە ئەمە لێکی دەداتەوە بۆچی ئـەوەندە نامۆییانـە رەفتـار دەکـات، کـە دەیکـات. هـەرچۆنێك بێـت دۆرکـهاییمیش دەیـەوێت پرسـیارێکی تـر بکـات. ئەگـەر ئێمـە رازی بوویـن بـەوەی ئـەو باوەڕانـە پڕوپووچـن، کەواتـە بۆچـی خەڵکی پێڕەوییان لێدەکەن؟ ئەگەر ئەو ئایدیایانە خورافیـاتی قۆڕیـش بـن، بێشـك بـە ئاسـانی لـەناو ناچن. بۆچی خۆیان رادەگرن؟

بـەلای دۆرکهاییمـەوە، دەشـێت وەڵامـی ئـەم مەتەلە لە یەك جێگادا بدۆزرێتـەوە: لـە نـاواخنی باوەڕەکـاندا نـا، لەوانەشـدا نـا کـە دەربـارەی خوداوەندەکان یاخود جیهان دەری دەبڕن، بەڵکو لـە وەزیفەکـەیاندا. لـەوەدا کـە لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە چـی دەکـەن، بـۆ ئەوانـەی بـە هۆیانـەوە دەژیـن. سروشـتی راسـتەقینەی ئـایین لەسـەر رووتەختەکـەوە نادۆزرێتـەوە، بـەڵکو لەژێرەوەی[46]. وەك ئەو تۆتەمیزمەی ئوسترالییەکان بە روونی پیشانی دەدەن، کلیلی ئایین لەناو ئەو ئاهەنگانەدایە کـە لـە توێـی ئەوانـەوە سـرووش دەبەخشرێت و دڵسۆزیی تاکەکان بۆ گرووپ نوێ دەکرێتەوە. ئەو سروتانە دەتوانن بە زۆریی وەکو پـاش بیرکردنەوەیـەك، پێویسـتیی چەشـنە سـیمبۆلیزمێك بخولقێنـن کـە شـێوەی چـەند ئایدیایـەك دەربـارەی پێشـینان و خوداوەندەکـان وەردەگرێـت. لـەوەش زیـاتر، ئەگـەر کۆمەڵگایـەك بەراستیی پێویستیی بەو سروتانە بێت بۆ مانەوەو گەشەکردن، ئەوا ئەوەی بەدوادا دێت کە هەرگیز کۆمەڵگایـەك بـەبێ ئـایین بوونـی نـابێت، یـاخود شتێکی تری هاوشێوە کە جێگەکەی پڕ بکاتەوە. بۆیە تەنانەت کاتێك کە ئایدیاکانی ئایین لەلایەنی هەندێکـەوە وەکـو شـتی پرووپـووچ و بێمانـا سەیریان دەکرێت، دەشێت رەفتاری ئاینیی زۆر بە

زیندوویی بمێنێتەوە لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا کە یاریدەی دەدەن و دەیپارێزن. دەتوانرێت ئایدیا ئاینییەکان بخرێنە بەرپرسیار، بەڵام سروتە ئاینییەکان، یاخود شتێکی تر کە زۆر ئالودەی بن، دەبێ بە جێگیریی بمێننەوە. کۆمەڵگا بەبێ ئاهەنگ ناتوانێت بێتە بوون، مانەوەی ئاینییش لێرەدایە.

## رەخنە

پێویست ناکات بڵێین، کە نزیکبوونەوە کۆمەڵایەتییە سەرسەختەکەی دۆرکهاییم دەمانخاتە بەردەمی رەسەنترین و قەشەنگترین تیوریی ئاینی. نەک وەک ئانیمیزمە تایلۆرییەکە، ئەوەی دۆرکهاییم هەوڵ دەدات پیشانی بدات کە چۆن رەگوریشەی رەفتاری ئاینیی زۆر لەوە قووڵتر رۆدەچێت لەوەی پێویستییەکی رۆشنبیرییانە بێت بۆ تێگەیشتنی چۆنیەتی کارکردنی جیهان. هەروەها بە پێچەوانەی تیوریی کەسایەتی فرۆید، لە هەموو مەودا بەرینەکەی خۆیدا، ئەو کاریگەرییە زۆرەی پێکهاتن دەنرخێنێت کە بونیادی کۆمەڵایەتی سەرفی دەکات، کاتێک خەڵکی رادەگەیەنن کە شتێک پیرۆزەو شتێکی تر پۆخڵە. ئینجا، بەراوردکردنی تیورییە سۆسیۆلۆجییەکەی دۆرکهاییم لەم رووانەوە، دەری دەخات کە ئەوانیتر چەند سنوردارن. چاوپێداخشێنەرەکانی زووی (فۆرمە سەرەتاییەکان) بە خێرایی تێبینی هەندێک لەو نارەحەتیانەیان کرد، هەروەها رەخنەگرە نوێیەکانیش پەلەیان نەکردوە لە چەند هێندە کردنەوەی نارەزاییەکان. رەخنەکان هەوڵیان داوە

لە دەوری سێ خاڵ کۆببنەوە: گریمانەکەی دۆرکهاییم لەمەڕ سروشتی ئاین، بەڵگە ئوسترالییەکانی، هەروەها بەرەنجامە چڕەکانی. لێرەدا دەچینە سەر ئەوانە.

## گریمانەکان

لەگەڵ دۆرکهاییمیشدا، وەک تیوریستەکانی تریشمان، زۆر پشت دەبەستین بەوەی ئەرخەمێدسی بیریاری گریکی پێی دەڵێت (*pousto*)، ئەوشوێنەی کە لە دەسپێکی مشتومڕەکەدا "لەسەری راوەستاوم". سەرنج بدە، لەم پەیوەندییەدا، پێناسەی ئاین لە لاپەڕە ئاوەڵاکانی فۆرمە سەرەتاییەکاندا، راکشاوە. پێمان وترا کە ئاین، لە هەموو کۆمەڵگاکاندا، رەگی لەناو جیاکردنەوە بنەڕەتییەکەی نێوان پیرۆزو پۆخڵدا داکوتاوە. بایەخی سەرەکیی سروتە ئاینییەکان بە یەکەمیانە، واتە لەگەڵ پیرۆزدا، کە پێویستە لەجیاتی پۆخڵ بهێڵرێتەوە. لەوەش زیاتر، پیرۆز هەمیشە بەستراوە بە روداوە کۆمەڵایەتییە مەزنەکانی هۆزەکە، لە کاتێکدا پۆخڵ بریتیە لە واقیعی شتە تایبەتییەکان. پێکگەیشتنی رەگەکان وەکو ئەو بنەچەیە کاردەکات کە بەپێی ئەو هەموو چوارچێوەی تیورییەکەی دۆرکهاییم دامەزرێنراوە. ئەگەر لە نزیکەوە تێی بڕوانین، بە دڵنیایی رۆڵی تەوەرەیی ئەم پێناسەیە لە تیورییەکەدا شتێک لە گرفتەکە دەخولقێنێت. هەروەها ئەگەر لە دەسپێکی گفتوگۆکەدا، ئەندێشەی پیرۆز دەکات کۆمەڵایەتی بێت، ئایا شتێکی تەواو ئاسان نییە ـ زۆر ئاسان کە بگەینە

ئەو بەرەنجامەی كە ئایین لەوە زیاتر نییە كە گوزارشت كردن بێت لە پێویستتییە كۆمەڵایەتییەكان؟ وا دیارە پرسیارەكە لەو شوێنەوە دەستپێدەكات كە دۆركهاییم دەیەوێت تەواو ببێت. ئەو دەنوسێت، پیرۆز بریتیە لە كۆمەڵایەتی، هەروەها ئاینیی پیرۆزە، بۆیە، ئاینیی كۆمەڵایەتییە[47]. بە دڵنیایی، دۆركهاییم تاكە تیوریست نییە كە ئاوەزی بەرەو خولقاندنی بازنەیەك دەڕوات، شتێكی لەو شێوەیەمان لە فرۆیدیشدا بینی، هەروەها خەڵكی تریش مەیلیان لەوەیە پێناسەی وا پێشكەش بكەن كە زۆر بەسانایی ئەو تیورییە بگرێتە خۆی كە بە هیوان داكۆكیی لێبكەن. بەڵام ڕێگای دۆركهاییم بۆ دەسكردن بە شیكردنەوە، زۆر نزیكە لەو شوێنەوە كە پێویستە تەواو ببێت، ئەمەش بە شێوەیەكی لۆجیكییانە، هۆیەكە بۆ هەندێك بایەخپێدان.

كاتێك بە بەرەنجامە ڕەتكەرەوەكەی پێناسەكانی تری دۆركهاییمدا دەچینەوە، ئەم كێشەیە گرفتی زیاتری لێدەكەوێتەوە. بۆ نمونە، ئەو پێمان دەڵێت كە نابێت پێناسەی ئایین وابكەین كە باوەڕبوونە بە جیهانی ژوورسروشتی، لەبەرئەوەی خەڵكە بەراییەكانی جیهان، كە بە روونی خەڵكێكی ئاییندارن، ئەم جۆرە چەمكەیان نییە. بەلای ئەوانەوە، هەموو روداوەكان وەكو یەك وان، جیهانێكی ژوورسروشتی بوونی نییە كە لە سروشتی جیاكرابێتەوە، بەڵكو تەنیا پیرۆز و كۆمەڵایەتی بوونیان هەیە، كە لە پۆخڵ و كەسیی جیادەبنەوە. بەڵام ژمارەیەك لە لێكۆڵەرەوان، چ لە رۆژانی دۆركهاییم خۆیداو هەتا ئەمڕۆش، بە بەڵگەوە پێدادەگرن لەسەرئەوەی كە ئەمە ئاواهی نییە. رەنگە خەڵكەبەراییەكان رێك چەمكەكانی ئێمەیان دەربارەی ژوورسروشتی نەبێت، بەڵام ئەوانە چەندان ئایدیایان هەیە دەربارەی جۆرەها روداوی ئەفسانەیی یان نائاسایی كە بە تەواویی هاوشێوەی چەمكە مۆدیرنەكانی ئێمەن. لە هەمان كاتیشدا، بە شێوەیەكی سەرنجڕاكێشانە، زۆرێك لەوانە لەهیچ بارێكدا هەوڵ نادەن پیرۆز لە پۆخڵ جیابكەنەوە، بەتایبەتی لەو ڕێگا پەتییەوە كە دۆركهاییم دەڵێت پێویستە بیكەن[48]. بایەخپێدانی وەك ئەمانە، كە بەوپەڕی توانایان هەوڵ دەدەن دژی بۆچوونەكانی دۆركهاییم، هەندێك بیرۆكەی تەقلیدیی دەربارەی ئایین بدۆزنەوە، كە تاڕادەیەك بتوانن دەسبەرداری پرسیارەكانی ژوورسروشتیو پیرۆز بن و بە شتی لاوەكی لەقەڵەمیان بدەن، بەڵام بەدبەختانە سەركەوتوو نەبوون. هەڵبژاردنی پێناسەكان لەلایەنی دۆركهاییمەوە، شتێكی سێنتەرییە لە تەواوی ستراتیجی لێكدانەوەكەیدا. ئەو لەسەر كەناری تیورییەكەی بە ئێمە ناگات، لەوشوێنەدا كە دەشێت بەبێ هیچ بەفیڕۆچوونێك مشتومالكردنەكان ئەنجام بدرێن.

### بەڵگە

دۆركهاییم بەپێچەوانەی تیوریستەكانی پێشووترەوە، جەخت دەكات كە خەسڵەتی گەورەی لێكۆڵینەوەكەی بریتیە لە بایەخدانی بە لێكۆڵینەوەی یەك دانە كەلتور بەتەنیا، كۆمەڵگا ئەسڵییەكانی ئوستڕالیا، هەروەها ئایینیشی لەو

ئاقارەدا لێکداوەتەوە. ئەو پشت دەبەستێت بە راپۆرتە ئەتنۆگرافییە زۆر ناسراوەکانی سپنسەرو گیلین، لەپاڵ تێڕوانینەکانی پیشووتریشدا، تیۆرییەکەی خۆی بە تۆکمەیی لەسەر ئەو بەڵگانە دەچەسپێنێت کە ئەوان پێشکەشیان دەکەن. بەهای زانستییانەی لێکۆڵینەوەیەکی وەها روون و رەتنەکراوەیە . بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوە لاوازییە ناوەکییەکەشیەتی. ئایا دەبێت عەقڵ بەهای ئەو راپۆرتانە، یاخود خوێندنەوەکەی دۆرکهاییم بخاتە بەر پرسیار کە تیۆرییەکەی ئەو ئاوا بە توندی نوساوە بە بەڵگە ئوسترالییەکانەوە، ئیتر چی لێدەمێنێتەوە؟ بە شێوەیەکی بەرچاو، شەش حەوتێك لە رەخنەکانی سەرەتا کە لە فۆرمە بەراییەکان گیران، ئەم خاڵەیان بە توندی هەڵگرتبۆوە. یەکەم سۆسیۆلۆجیستێك کە ناوی گاستۆن ریچاردە، کە پیشتر لەگەڵ دۆرکهاییمدا کاری کردبوو، بە وردی راپۆرتە ئوسترالییەکانی تاقیکردەوەو دەری خست کە چۆن لە چەند جێگایەکدا، دەتوانرێت بەڵگەکە تەواو بە پێچەوانەی بەرەنجامەکانی دۆرکهاییمەوە، بەڵگەکان بسەلمێنرێن. ریچارد، تاڕادەیەك بە شێوەیەکی قایلکەرانە، رایگەیاند کە بەشی زۆری تیۆرییەکەی دۆرکهاییم پێش ئەوەی سەیری راپۆرتە ئوسترالییەکان بکات، داڕێژراوە[49]. ئەمڕۆش هەندێك رەخنە پرسیار دەکەن ئایا تەنانەت راپۆرتە ئوسترالییەکانیش خۆیان بەتەواویی دروستن[50]. رەنگە زبرترین وشە دەربارەی ئەم بابەتە لەلایەنی ئارنۆڵد ڤان جینیبەوە بێت، ئەنترۆپۆلۆجیستی هۆڵەندیی ناسراو لەمەسەلەی ئەفریقیادا. لەپێداچوونەوەیەکی تۆکمەدا کە هەرزوو دوای بڵاوبوونەوەی فۆرمە بەراییەکان نوسراوە، دەنوسێت"لەماوەی دەساڵدا سەرلەبەری شیکردنەوەکەی بۆ ماددە ئوسترالییەکە بەتەواویی رەت دەکرێتەوە". ئینجا لەسەری دەڕوات" ئەمە گەورەترین کۆمەڵەی فاکتە ئەتنۆگرافییە بێکەڵکەکانە کە تائێستا من دیبێتم"[51]. ئەم وشانە زۆر پێشبینیکەرانە بوو. ئەمڕۆ زۆربەی بەڵگەکان و زۆرینەی ئەو لێکدانەوانەی دۆرکهاییم بۆ تۆتەمیزم کردوونی بە بەشێك لە تیۆرییەکەی خۆی، بە شێوەیەکی زۆر بەرفراوان رەتکراونەتەوە[52].

> **چۆن وەزیفەی سایکۆلۆجیی بەردی بناغەی تیۆرییەکەی فرۆییدە، وەزیفەی سۆسیۆلۆجییانەش بریتیە لە کلیلی میتۆدە راڤەکارەکەی دۆرکهاییم**

## كزرگەرایی

چۆن وەزیفەی سایکۆلۆجیی بەردی بناغەی تیۆرییەکەی فرۆییدە، وەزیفەی سۆسیۆلۆجییانەش بریتیە لە کلیلی میتۆدە راڤەکارەکەی دۆرکهاییم. بێشك لە هەستێکی دیاریکراودا، بەهای ئەم چەشنە نزیکبوونەوەیە گومانی تێدا نییە. لە راستیدا کێ دەتوانێت گومان

لەوە بکات، لەژێر رووتەختی شتەکانەوە، باوەڕ، سروتە ئاینییەکان زۆرجار هەندێك مەبەستی کۆمەڵایەتی بەئەنجام دەگەیەنن کە ڕەنگە باوەڕدارەکانیش خۆیان دەرکیان پێنەکەن و ئاگاداریان نەبن؟ کێ پێی خۆشە نکولیی لەوە بکات کە قەدداسی مردووەکان، کە بەهۆی ئەوەوە هانا دەبرێت بۆ خودا بۆئەوەی رۆحی مردووەکان لە دۆزەخ رزگار بکات، لای کاسۆلیکە بەدینەکان، لەژێر رووتەختی ئەو سروتەدا، لە هەمانکاتدا سروتێکی بەهێزی سەربەخۆیی گرووپ نوێ دەکرێتەوە؟ ئەم چەشنە خوێندنەوە کۆمەڵایەتییە وەزیفییانەی ئایین وا دەردەکەوێت سروشتی و گونجاو بن، کە چیتر کەس ئارەزووی ئەوەی نەبێت مشتومڕیان لەسەر بکات.

بەڵام تەنانەت ئەگەر هەمووان بەشێوەیەکی گشتی رازیی بن بەوەی ئایین و کۆمەڵگا بە شێوەیەکی وەزیفەیی پەیوەندییان پێکەوە هەیە یاخود پێکەوە لکاون، هێشتا پێویست دەکات هەرئێستا بپرسین ئەو پەیوەندییە چۆن کاردەکات. دۆرکهاییم هەمیشە لە دەمەتەقێکردنی ئەم مەسەلەیەدا، رایدەگەیاند کە کۆمەڵگا بایەخدەدات و دیاریی دەکات، لەکاتێکدا ئایین بایەخی پێدەدرێت و دیاریی دەکرێت. کۆمەڵگا کۆنترۆڵی کاردانەوەکانی ئایین دەکات. ئەو تێرادەمێنێت کە لەهەر نمونەیەکی ئوسترالییدا، دۆرکهاییم پێدادەگرێت کە کۆمەڵگا بە شێوەیەکی تۆکمەو بەدەسەلات شکڵی سروتە ئاینییەکان و باوەڕیش دیاریی دەکات، لەکاتێکدا هەرگیز نەبینراوە کە باوەڕە ئاینییەکان لەبەرامبەردا کاربکەنە سەرکۆمەڵگا. لەهەر نمونەیەکدا، بیرمان دەخرێتەوە کە هەمیشە بونیادی کۆمەڵگا راستەقینەیە، لەکاتێکدا کە ئایین بەشێوەیەکی سەرەکیی رووکەشە. وادیارە بەلایەنی کەمەوە ئەوە شتێکی ماقووڵە پرسیار بکەین بۆچی دەبێت ئەمە وابێت. یەك شت هەیە بوترێت لەپاڵ راگەیاندن و مەبەستەکانی تریدا، ئایین وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتیشی هەیە، ئەوە بەتەواویی شتێکی ترە ئەگەر بڵێین کە ئایین بەتەنیا وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە. وەك لە حاڵەتی فرۆیددا بینیمان "کزرگەرایی" زاراوەیەکی تیورییە بۆ ئەم فۆرمە درەی روونکردنەوەی وەزیفەیی. فرۆید ئایین والێکدەداتەوە کە هیچ نیە جگە لە رووکاری دەرەوە، کۆمەڵێك نیشانەی نیرۆسی کە بەهۆی برینی سایکۆلۆجییەوە دروست بوون، لەژێرەوە خۆیان مەڵاس داوە. ئاجێنداکەی دۆرکهاییمیش هاوشێوەیە، ئەو پێی وایە ئایین هیچ نیە جگە لەوەی کەفی سەر رووکاری دەرەوە بێت. خۆی وشەی هەڵچوونی بەکارهێناوە کە بە واقیعێکی کۆمەڵایەتی ژێرەوە ئەو کەفە لادەبرێت. بێگومان ئەو لەوەدا لە فرۆید جیادەبێتەوە کە ئەو زۆر زیاتر ناڕەزایە لەوەی لەم رووەوە دادوەریکردنێکی نێگەتیڤانە لەمەڕ ئایین بکات. فرۆید ئایین وەکو نیشانەی نەخۆشی دەبینێت، ئاماژەی پشێوییەکی دەروونیی. دۆرکهاییم ئەوەندە دڵنیا نیە، پێی وایە تەنانەت ئەوکاتەی باوەڕەکان هەڵەشەن، لەوانەیە بەلای هەندێ کۆمەڵگاوە، هێشتا نیشانەیەکی تۆخی تەندروستیی کۆمەڵایەتیی بێت.

سەربارى ئەم جياوازييە، تيۆرييەكەى دۆركهايميش، وەك تيۆرييەكەى فرۆيد، فيت بۆ قالبى وەزيفەگەرايى كزرگەرا دەبێت، ئامانجى ئەو بريتيە لەكورتكردنەوەى ئايين بۆ شتێكى جيا لەوەى كە بە رووكەش دەردەكەوێت. گەرچى لێكدانەوە وەزيفەييەكان، بە تێپەرينى كات سودمەنديى خۆيانيان سەلماندووە، پرسيارى دەربارەى ئەم چەشنە كزرگەراييەى وەزيفەييەكان، مەسەلەيەكى جياوازە كە دووبەرەكيى خستۆتە نێوانى تيوريستەكانى ئەمرۆوە. هەندێك ئەم چەشنە نزيكبوونەوانە پەسەند دەكەن و، لە تيوريستە كزرگەراكاندا مۆدێلێكى زۆر باشى ميتۆدێكى زانستيبيانەى تۆكمە دەدۆزنەوە[53]. هەندێكى تريش پێيان وايە ئەوانە يەك رەهەندن و لە بنەرەتدا چەواشەكەرن[54]. لەم پێوەستييەدا، دەبێت ئەوە شتێكى سەرسورهێنەر نەبێت كە زۆرينەى باوەرداره راستەقينەكانى ئايين، تيۆرييە كزرگەراييەكانى هەريەكە لە فرۆيدو دۆركهايميش بە شێوەيەكى گشتى وەك شتێكى قبوول نەكراو دەبينن. لە چاوى باوەرى ئاينيدا، ئەو خۆلێدانانە، كە رەنگە دەروازەيەك پێشكەش بكەن بۆ چوونە ژوورەوەى ديارەكانى باوەر، بەلام بە سادەيى خراپ لەوە حالێدەبن كە لە قوولايى و لە بنكەدا ئايين چيەو دەربارەى چيە. هەرچۆنێك بێت، ئەگەر واش بێت، ئەوا تێروانينەكانى فرۆيدو دۆركهايم، لە گوێى ئايندارەكاندا كەمتر زبرو توندن لە چاوى ئەوانەدا كە پێش ئەوان گوزارشتيان لێكردووە، يەكێك لەوانە شەرانگێزترين و كەللەرەقترينى هەر هەموو



فرۆيد

تيۆرييە كزرگەراكانە: مەبەست لە فەيلەسوفى سوسياليستى ئەلمان كارل ماركسە. تێروانينە رەق و شەرەكەرەكەى دەربارەى ئايين، ئەوەيە كە دواى ئەم باسە دەچينە سەرى.

## سەرچاوە

*SEVEN THEORIES OF RELIGION*

***By: Daniel L. Pals***

***Oxford University presses 1996***

***Pp 88 -123.***

## پەراوێز

-غەريزە *Instinct,* لە سايكۆلۆجياو گيانەوەرزانييدا، بريتيە لە خەسلەتێكى خۆرسكانەى كە لە چەشنە گيانەوەرێكى دياريكراودا هەن و شێوازێكى زۆر ئالۆزى رەفتار بەرێوەدەبەن، كە ئەندامانى ئەوچەشنە گيانەوەرە ئامادە دەكەن بۆ ئەوەى بەرامبەرى چەندان حالەتى جياجياى ناو ژينگەى سروشتيى كاردانەوەى جياجيايان هەبێت. نمونەى ئەم رەفتارانە خواردن، هاورێيەتى كردن، دايكوباوكييكردن، هەروەها گوزارشتكردن لە شەرەنگێزيى. ئەم رەفتارانە بەهۆى هێزەكانى ناو سروشتەوە پەرەيان پێدراوەو مشتومال كراون و لە

پرۆسەی پەرەسەندندا هەڵبژێردراون. ئەم رەفتارە غەریزەییانە زۆر گرنگن بۆ ئەوەی گیانەوەر لەگەڵ ژینگەیەکی تایبەتییدا خۆی رابهێنێت.

-چەمك *concept* بریتیە لە شتێك کە کەسێك بیری لێدەکاتەوە، یاخود رەنگە کەسێك بتوانێت ئەندێشەی بکات. *2.* ئایدیایەکی پەتییە یاخود رێنماییکردنی پرەنسیپێکی گشتییە، لەنمونەی ئەوەی دیاریی دەکات کە چۆن کەسێك یان کەلتورێك رەفتار دەکات، یاخود چۆن سروشت، واقیع، یان روداوەکان چۆن روودەدەن. *3.* بە کورتی چەمك بریتیە لە میتۆد، پیلان، یاخود تەرزی بەرهەمهێنانی هێڵکارییەك یان دیزاینێك.

-سۆسیۆلۆجیا *sociology* بریتییە لە لێکۆڵینەوەی زانستیی دەربارەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ، یاخود ژیانی گرووپ. لەگەڵ دیسپلینەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تریشدا تێکەڵاویی هەیە، لە وێنەی ئابوریی، زانستە سیاسییەکان، ئەنترۆپۆلۆجیا، لەگەڵ سایکۆلۆجیا، کە هەرهەموویان پێکەوە بایەخ دەدەن بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. سۆسیۆلۆجیستەکان لەو شێوازانە دەکۆڵنەوە کە بەهۆیانەوە بونیادە کۆمەڵایەتییەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، لە وێنەی چین، کۆمەڵ، دەسەڵات، لەگەڵ گرفتە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە وێنەی تاوان، خراپەکاریی لە کۆمەڵگادا.. کاردەکەنە سەر کۆمەڵگا.

-بەشی دووەمی ئەم بابەتە کە تایبەتە بە فرۆید لە زنجیرەی ژمارە حەوتی کتێبی گیرفانی دەزگای چاپەمەنی سەردەم بڵاو کراوەتەوە کە هەر خۆمان وەرمان گێراوە.

-ئیپینال *Èpinal,* شارێکە لە باکوری خۆرهەڵاتی فەرەنسا، پایتەختی ڤاسگێسەو، دەکەوێتە سەر روباری مۆسێل. ئەم شارە لە دێرێکەوە پەرەی سەندووە کە لە سدەی دەیەمی زاییندا بیناکراوە.

-رابی *Rabbi* وشەیەکی عیبرییە بە مانای سەروەری من، یان گەورەی من دێت، پلەیەکی ئاینییە دەدرێت بە گەورە سەروەری جولەکەکان لە یاسا ئاینییەکاندا. ئەم نازناوە دوابەدوای کێشمەکێشی نێوان قوتابخانە جولەکەییەکان بەکارهێنراوەو لە سەردەمی مەسیحەوە بەکاردەهێنرێت و، خودی مەسیحیش بە رابییەك لەقەڵەم دراوە. ئەم وشەیە نزیکایەتی هەیە لەگەڵ زاراوەی ( رب + ی = ربی) ی عەرەبییدا کە بە مانای خاوەنی من یان خودای من بەکاردەهێنرێت.

-نازانمێتی *Agnosticism* بریتیە لەو باوەڕەی کەدەڵێت من نازانم یەزدان یاخود بوونە رۆحییەکانی دیکە، بوونیان شیاوە یان مەحاڵە. وشەکە لە وشەی *agnostikos* ی یۆنانییەوە، وەرگیراوە کە ماناکەی نازانم دەگەیەنێت. ئەم وشەیە لە سەدەی نۆزدەدا هێنراوەتە ناو کەلتوری ئینگلیزییەوە، لەلایەنی تۆماس هێنری هیکسلی بایۆلۆجیستەوە. هەڵوێستی نازانمییانە جیاوازە لە هەریەکە لە باوەڕداریی کە ئەمیان جەخت دەکات لەسەر بوونی یەزدان و هێزە رۆحییەکان، هەروەها بێباوەڕییش، کە نکولییان لێدەکات.

-پەیمانگای بالای مامۆستایان *Ècole Normale Supérieure,* پەیمانگایەکی خوێندنی بالایە لە پاریس، لە ساڵی *1794*دا وەکو پەیمانگای مەشقپێدانی مامۆستایان دامەزرێنراوە. ئەمڕۆ، هەندێك

لە دەرچووانی ئەم پەیمانگایە دەبن بە مامۆستا، بەڵام زۆرینەیان خوێندنی زانکۆیی تەواو دەکەن، یان رووداوەکانە خزمەتی مەدەنی.

-ڤوندت، ولیەم ماکس *Wundt, Wilhelm Max* *(1832-1920),* ساکۆلۆجیستێکی ئەڵمانییە، بە شێوەیەکی گشتی بە دامەزرێنەری سایکۆلۆجیای زانستیی وەکو دیسپلینێکی سەربەخۆ، ناسراوە. هەروەها یەکەمین گۆڤاری سایکۆلۆجیاشی دامەزراندووە:" چەند لێکۆڵینەوەیەك لە فەلسەفەدا . *1881*".

-بۆردیۆ *Bordeaux* شارێکە لە باشووری خۆرئاوای فەرەنسا، پایتەختی ناوچەی جیرۆندە، دەکەوێتە سەر روباری جیرۆن. بۆردیۆ بەندەری سەرەکیی ناوچەکەیە، هەروەها کەناڵەکانی شارەکە دەبەستێتەوە بە دەریای ناوەڕاستەوە. شارەکە بە ڕاوە ماسی و بازرگانیی شەراب ناسراوە، هەروەها کارگەی گەورەی دروستکردنی پاپۆڕ و ئوتومبیلیشی تێدایە.

-مۆنتیسکیۆ، چارلس لویس دی سێکۆندت بارون دی لابریت ئێت دی *Montesquieu, Charles Louis de Secondat, Baron de la Brede et de (1689-1755)* نوسەرو یاسانا‌سی ناوداری فەرەنسەیە لە شاتۆ لابرێد لەدایك بووە، سەرەتا بەهۆی کتێبی نامە فارسییەکانەوە چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا کە ببێت بە نوسەر، ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبەکانی سەرەتای جولانەوەی رۆشنگەریی، لە ساڵی *1728*دا هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەکادیمیای فەرەنسی. پاشان لە ساڵی *1734* دا، کتێبی (چەند بیرێك دەربارەی هۆیەکانی سەرهەڵدان و رمانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی) نوسی، کە یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی سەرەتای

مێژووی فەلسەفە. سەرەکیترین کتێبی بریتیە لە رۆحی یاساکان *1748 . 1750*، کە لەو کتێبەدا شێوازە سەرەکییەکانی حکومەت (کۆماری، پادشایەتی، تاکڕەوی ستەمکارانە) دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، هەروەها باسی کاریگەریی جوگرافیاش دەکات لەسەر شێوازەکانی حکومەت لەناوچە جیاجیاکاندا.

-سان سیمۆن، کلۆد هینری دی رۆڤێری، کۆمت دی *Saint-Simon, Claude Henri de Rouvroy, Comte de (1760-1825),* سوسیالیستێکی فەرەنسییە، لە پاریس لەدایك بووە، لە تەمەنی پازدە ساڵییدا چووە بۆ فەرەنساو لە شۆڕشی ئەمریکییدا شەڕی کردووە. کە گەڕایەوە بۆ فەرەنسا ، دایە پاڵی شۆڕش و دەسبەرداری نازناوەکەی خۆی بوو. بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی سوسیالیزمی مۆدێرن دادەنرێت. نوسینەکانی دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی دەکەن کە لە لایەنی خەڵکەوە ببرێت بەڕێوە، زانست و پیشەسازیی بخرێنە خزمەتی هەموو کۆمەڵگاوە. باوەڕی وابوو کە بە پیشەسازیکردن هەرخۆشی ئەم زاراوەیەی داهێناوە (*industrialization*) کۆمەڵگا پێش دەخات و جەنگ و هەژاریی لەناو دەبات و دادپەروەریی بڵاو دەکاتەوە. هەروەها ئومێدیشی بەوە بوو کە مەسیحییەت ببێت بە سەرپەرشتیاری بەپیشەسازیی کردن. دوای مردنی قوتابییەکانی پەرەیان بە بۆچوونەکەی داو فەلسەفەی سان سیمۆنییان دامەزراند، دیارترین نوسراوی بریتیە لە مەسیحییەتی نوێ . *1825*.

-کۆمت، ئۆگست *Comte, Auguste (1798-1857)* فەیلەسوفێکی پۆزەتیفی فەرەنسییە، دامەزرێنەری زانستی سۆسیۆلۆجیا، کۆمەڵناسییە. دیارترین کتێبی بریتیە لە چەند وانەیەك لە

فەلسەفەی پۆزەتیفییدا، لە شەش بەرگدا *1835* ـ *1842*.

–تیۆلۆجیا *Theology* بریتیە لەو پێڕەوەی کە هەوڵ دەدات گوزارشت لە ناواخنی باوەڕە ئاینییەکان بکات، وەکو یەك پێکهاتەی یەکگرتووی بۆچوونەکان. تیۆلۆجیا مەودایەکی تەسکتری هەیە لەچاو باوەڕدا، چونکە وێڕای ئەوەی کە باوەڕ بریتیە لە سەرجەمی تێڕوانەکانی تاکەکەس، کە هەست و ئیرادەش دەگرێتەوە، تیۆلۆجیا هەوڵ دەدات، بە بەرجەستەکراویی گوزارشت لە توخمەکانی باوەڕ بکات کە بە شێوەیەکی راشکاو یان ناڕاشکاوانە لەناویدا هەن.

–رینان (جۆزێف) ئێرنست *Renan, (Joseph) Ernest (1823-1892)* فیلۆلۆجیست و مێژوونوسێکی فەرەنسییە، لە لاویدا پێڕەوی رۆمان کاسۆلیکی خوێندوە بۆ ئەوەی ببێت بە پیاوی ئایین. بەڵام دواتر لەگەڵ کەنیسەدا تێکچوو، زۆر بە وردیی ژیانی مەسیحی خوێندۆتەوەو مشتومڕێکی زۆری لە فەرەنسادا بەرپا کردووە، چونکە تێڕوانینێکی نائارسۆدۆکسییانەی هەبوو. تێڕوانینەکەی بەشی یەکەمی مێژووی رەگوڕیشەکانی مەسیحییەت پێکدەهێنێت کە هەشت بەرگەو لە ساڵی *1863* ـ *1883*دا بڵاوکراوەتەوە. لە ساڵی *1878*دا هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەکادیمیای فەرەنسی و پاشان لە ساڵی *1883*دا دەبێت بە بەڕێوەبەری کۆلیج دوفرانس و تا مردنی لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە. لە نوسینەکانی تری: یادەوەرییەکانی لاوییم ـ *1883*، مێژووی خەڵکی ئیسرائیل ـ پێنج بەرگە *1887* ـ *1893*، رینان بە شێوەیەکی عەقڵیی و هیومانیستانە خۆی لە ئایین داوەو دوایی دۆزینەوەکانی مێژووی بەکارهێناوە بۆ لێکۆڵینەوەکانی. ئەمڕۆ نوسینەکانی زیاتر لەبەر شێوازە ئەدەبییەکەی بایەخیان پێدەدرێت نەك لەبەر زانین و زانیارییەکانی.

–فیستول دی کۆلانگێس، نوما ـ دێنیس *Fustel de Coulanges, Numa-Denis (1830-1889)* مێژوو نووس و نوسەرێکی فەرەنسییە، لە پاریس لەدایك بووە، لە ساڵی *1850*دا چۆتە پەیمانگای باڵای مامۆستایان و پاشان لە ساڵی *1853*دا چۆتە قوتابخانەی فەرەنسی لە ئەسینا، یۆنان. لەوێ یەکەمین وتاری دەربارەی میژوو دورگەی خیۆسی یۆنانیی نوسیوە. لە ساڵی *1860* بانگ کراوە بۆ زانکۆی ستراسبورگ و لەوێ وانە مێژووییەکانی شۆرەتیان پەیدا کرد. لە ساڵی *1864*دا کتێبە نێودارەکەی چاپ کرد "شارە دێرینەکە" کە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارە لەنێوانی هەردوو کۆمەڵگای یۆنانی و رۆمانیدا. لە ساڵی *1880*دا دەبێتە رازگری پەیمانگای باڵای مامۆستایان و لە زانکۆی پاریسیش وانەی دەووتەوە. نێودارترین کتێبی بریتیە لە کتێبێکی شەش بەرگی دەربارەی مێژووی دامودەزگا دێرینەکانی فەرەنسا، لەنێوان ساڵانی *1875* ـ *1892*دا چاپکراوە.

–پیشەسازی، شۆڕشی *Industrial Revolution* بریتیە لە جێگرتنەوەیەکی بەرفراوانی ئیشی دەست و ماسولکە، بە ئیشی ئامێر، ئەمەش لە سەدەی هەژدەیەمەوە لە بەریتانیا دەستی پێکردووەو، هەتا ئەمڕۆش لە هەندێك ناوچەی سەرزەویی دا بەردەوامیی هەیەو تەواو نەبووە. شۆڕشی پیشەسازیی ، بەرەنجامی ژمارەیەکی زۆر گۆڕانکاریی بنچینەیی وپەیوەندیدار بوو، کە ئابوریی کشتوکاڵیی گواستەوە

بـۆ ئـابوریی پیشەسـازیی. زۆرینـەی گۆڕانكارییـە یەكسەرییەكان لە سروشتی بەرهەمـهێناندا روویـاندا: چـی بەرهـەم دەهـات، هـەروەها لـەكوێ و چـۆن، ئـەو شتانەی بەبڕێ كەم و لەناو ماڵ و دوكانەكاندا بەرهـەم دەهاتن، وایان لێهات لەناو كارگەكاندا بەرهەم بهێنرێن. بەرهـەمداریی و كاریگـەریی تـەكنیك بـە شـێوەیەكی زۆر دراماتیكی پـەرەیان سـەند، لـە بەشێكدا بریتی بـوو لـە ئەنجامی پیادەكردنی زانیارییە زانستییەكان و زانینـە پراكتیكییـەكان، لـە بەشـەكەی تریشـدا بـەرەنجامی كۆكردنـەوەی هـێزێكی كـاری زۆر بـوو لـە ناوچەیـەكی دیاریكراودا.

–فەرەنسـیی، شۆڕشـی *French Revolution* بریتیـە لـە گـەورەترین وەرچـەرخانی سیاسـی و كۆمەڵایەتی لە فەرەنسادا، ماوەی نێوان ساڵانی *1789* ـ *1799* ی خایاندووە. لە ماوەی شۆڕشەكەدا، فەرەنسا لە سیستمی شاهانەی رەهاوە، كە تێیدا پادشا خاوەنی هەموو شتێك بوو، گواستیەوە بۆ كۆماری تیوریی، كە تێیـدا هاونیشـتمانان ئـازادو یەكسـانن. كاریگـەریی شۆڕشی فەرەنسە زۆر بـەربڵاو بـوو، لـە دەریشـەوەو لـە ناویشـەوە، ئـەم شۆڕشـە بـە یـەكێك لـە رووداوە هـەرە گرنگەكانی مێژووی ئەوروپا لەقەڵەم دەدرێت. لە ماوەی شۆڕشـەكەدا سیسـتمی نـوێ لـەناو چـوو، چـەندان حكومـەتی تـر جێگـەیان گرتـەوە، گـەرچی هیـچ یـەكێك لەوانـە نـەیتوانی لـە چـوار سـاڵ زیـاتر بـەردەوام بێـت. دوای چەند دەستپێشخەریەك سیستمێكی پەرلـەمانی لە فەرەنسادا دامەزرا. ئەو دەسپێشخەریانە بریتی بوون لـە ئامـادەكردنی رەشنوسـی چـەندان مـاف و چـەند دەسـتورێكیش. هـەروەها دامـەزراندنی یەكسـانی یاسـایی هـەموو هاونیشـتمانیەكان، تاقیكردنـەوەی ئەزمونی دیموكراسیی، بردنی كەنیسە بۆناو دەوڵـەت، هـەروەها بیناكردنـەوەی ئیـدارەی دەوڵـەت و دارشتنەوەی كۆدی یاسا.

–ئەریستۆكراسـی *Aristocracy* وشـەیەكی یۆنانییـە پێكـهاتووە لـە دووبـەش: *aristos* بـە مانـای باش، لەگەڵ *kratos* بەمانای هێز. لە ئەسڵدا یەكێكە لە شێوازەكانی حكومـەت، كـە تێیدا دەسـەڵات دەكەوێتـە دەستی ژمارەیەكی كەمی خەڵكەوە. لێرەدا ئەم وشەیە بـەو مانایـە بـەكارهاتوە كـە چـەند كەسـێكی كـەم لەوساتەدا لـەبواری فیكردا باڵادەسـت بـوون و خۆیـان خاوەنی هەموو بڕیارە روناكبیرییەكان بوون.

–پرۆتستانتیزم *Protestantism,* یەكێكە لە سێ لقە سـەرەكییەكەی ئاینی مەسیحی، كـە دوانەكـەی تـر كاسۆلیك و ئارسۆدۆكسن. پرۆتسـتانتیزم لـە سـەدەی شـازدەیەمدا، وەكـو جوڵانەوەیـەكی ریفۆرمكـار لـەناو كەنیسـەی خۆراواییدا، دەسـتی پێكـردووە. مەبەسـتی سەرەكیشـی بریتـی بـوو لـە ژیاندنـەوەی دابونەریتـە رەسەنەكانی مەسیحییەت.

–كاسـۆلیك، كەنیسـەی رۆمـانیی *Roman Catholic Church,* بریتیە لە فراوانترین بەشی ئاینی مەسیحی، لەو مەسیحییانە پێكهاتووە كە ملكەچن بۆ دەسەڵاتی پاپای رۆما. وشەكە لە وشەی *katholikos* ی یۆنانییەوە هاتووە، كە مانای گـەردونیی یان جیهانیی دەگەیەنێت و هەر لـە سـەرەتاكانی ئاینی مەسیحییەوە بەكارهاتووە، ئەوكاتـەی كـە تاكـە كەنیسـەی مەسیحیی بووە.

–بودایـیزم *Buddhism* یەكێكـە لـە ئاینـە سەرەكییەكانی جیهان، لە باكوری هیندستانەوە سەری هـەڵداوەو لەسـەر بنـەمای ئامۆژگارییـەكانی سـیدهارتا

گوتاما *Siddhartha Gautama* دامەزراوە کە بە بوودا *Buddha* ناسراوە، کە ماناکەی مرۆڤە رۆشنەکەیە.

–مولەر (فریدریش) ماکس *Muller,(Friedrich) Max (1823 – 1900)* لێکۆڵەرێکی دێریننـاس و زمانەوانێکی ئەڵمانییە، هەروەها لێکۆڵەری میتۆلۆجیاو ئایینیشە. سەرەکیترین کاری بریتی بوو لە سەرپەرشتیکردنی کتێبە پیرۆزەکانی خۆرهەلاٌت کە لەماوەی نێوان سالاٌنی *1879 . 1904*دا، واتە سێ ساڵ دوای مردنیشی، لە پەنجاو یەك بەرگدا بلاٌوکراونەتەوە. لە سەرەتادا قوتابی زمانی سانسکریتی بوو، بەلاٌم رووی کردە خوێندنی بەراوردکاریی زمان، لە دەوروبەری ساڵی *1845*دا خووی دایە لێکۆڵینەوەی ئاڤێستای زەردەشت کە ئاینی دێرینی ئێرانی و کوردەکانە، ئەم لێکۆڵینەوەیە بەرەو بەراوردکرنی ئایینەکان بردی. کەوتە لێکۆڵینەوەی هێزە پیرۆزەکانی هیندیەکان کە بەناوی ڕگڤیداوە هاتبوو. دواتر دەبێت بە ئوستادی یاریدەدەری زمانی بەراوردکار لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. هەوڵی زۆری داوە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە هیندوو. ئەوروپییەکان بە شێوەیەکی بەراوردکارانە. سالاٌنی کۆتایی تەمەنی بە لێکۆلینەوەی بودایزم و فەلسەفەی هیندییەوە سەرف کردووە.

–تۆتەمیزم *Totemism* سیستمێکی ئالۆزی ئایدیا، سیمبۆڵ، چالاکییەکانە، لەسەر پەیوەندییەکی گریمانەکراو دامەزراوە، لە نێوانی تاکێك یان گروپێکی کۆمەلاٌیەتییدا، لەگەڵ بابەتێکی سروشتییدا کە وەکو تۆتەمێك ناسرابێت. رەنگە تۆتەم بریتی بێت لە باڵندەیەکی دیاریکراو، ئاژەڵێك، یاخود رووەکێك، یان دیاردەیەکی سروشتی، یانیش دیمەنێکی سروشتی، کە خودی گرووپەکە باوەڕیان وایە بە رێگایەك لە رێگاکان پەیوەندییان پێوەی هەیە. زاراوەی تۆتەم لە زمانی ئۆجیبواوە ورگیراوە کە یەکێکە لە زمانە رەسەنەکانی باکوری ئەمریکا.

–کەڵت *cult* بریتییە لە سیستمێك لە باوەڕە ئاینییەکان یان رۆحییەکان، کە بە زۆریی نارەسمیی و ناجێگیرن و لەلایەنی ئارسۆدۆکسییەکانەوە بە ویڵ و نادروست لەقەڵەم دەدرێن و بەزۆریی پێیان دەوترێت باوەڕە میللییەکان.

–تابۆ *Taboo* بریتییە لە قەدەغەکردنی شتێك کەسێك یاخود تەرزە رەفتارێك. لە تابۆ ئاینییەکاندا، شتە قەدەغەکراوەکە بە ناپاکژ یان پیرۆز لەقەڵەم دەدرێت، گریمانەکردنی تابۆکە بۆ ئەوەیە خۆیان لە هێزی شتەکە بپارێزن. قەدەغەکردنی خزمکوژی و هاوسورگرتن لەناو یەك گروپی خزمایەتییدا، نمونەی رەفتاری تابۆییانەن. هەندێك لە تابۆکان بە تەواویی سەر بە ئایین نین، بەڵکو زیاتر پێوەستن بە پەیوەندییە کۆمەلاٌیەتییەکانەوە.

–کزرگەرایی *reductionism* بریتییە لە شیکردنەوەی شتێك بۆ چەند رەگەزێکی سادەتر یاخود بۆ سیستمێکی رێك و پێك، بەتایبەتی بە مەبەستی روونکردنەوەو تێگەیشتنی. واتە بریتییە لە سادەکردنەوەی شتێکی ئالۆز. ئەم زاراوەیە لە بیری ئاینییشدا بەکاردێت بۆ ئەو تێڕوانینەی کە هەموو شتەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ یەك تاکە هۆی رەسەن، یان چەند هۆیەکی کەم.

## Notes

*I. Emile Durkheim. The Elementary Forms of the Religious Life, tr. Joseph Ward Swaim New York: The Macmillan Company, 1915), p. 419*

*"Durkheim: The Man, His Time, and His Intellectual Background," in Wolff, ed., Emile Durkheim, pp. 3-31; also Robert N. Bellah, "Introduction." in Bellah, ed., Emile Durkheim: Morality and Society: Selected ritings Chicago: University of Chicago Press. 1973), pp. Ix-Iv.*

*6. For Durkheim's own appreciation of the French sociological tradition in which he stood. see his "Sociology in France in the Nineteenth Century," tr. by Mark Traugott. in BeIlah, ed.. Emile Durkheim: Morality and Society. pp. 3-22.*

*7. On the importance of these thinkers to the development of Durkheim's thought, see Nisbet, Sociology of Durkheim. pp. 24-30.*

*8. Informative analyses of the theories Durkheim developed in this important early work can be found in Giddens. Durkheim. pp. 26-38: Lukes. Durkheim, pp. 137-78; Nisbet. Sociology of Durkheim. pp. 73-104; and Robert K. Merton. "Durkheim's ivision f abor n ociety," n Robert A. Nisbet. Eimile Durkheim: With Selected Essays (Engkwood Cliffs. Nj: Prentice-Hall. !965). pp. 105-12.*

*9. A thorough study of the Rules, exploring its argument. origins, and reception. is Mike Gane. On Durkheim's Rules of Sociological Method (London: Routledge. 1988).*

*10. On this distinction, see Gane. Durkheim's Rules. pp. 15-17.*

*Il. A still useful analysis of Durkheim's view of causation is Charles Elmer Gehlke. Emile Durkheim's Contribution to Sociological Theory (New York: AMS Press. (1915) 1968), pp. 58-92. Though Durkheim uses the term "function." in the way described here, the question of whether his sociology is "functionalist" in the sense ot belonging to one of the schools of modern sociology that were given this name is a*

*2. Durkheim was, of course, not the only contributor to the "sociologicaI revolution" n modern thinking. On the matter of Durkheim's influence, see Albert Salomon. Some spects f the Legacy of Durkheim," in Kurt H. Wolff. ed., Essays on Sociology and Philosophy: Durkheim. et al. with Appraisals of His Life and Thought (New York: Harper Torchbooks, [1960] 1964). pp. 247-66; also helpful, in the same volume, is Roscoe C. Hinkle, Jr., "Durkheim in American Sociology," pp. 267-95.*

*3. On the similarities between Freud and Durkheim, see Stjepan G. Mestrovic, Emile Durkheim and the Reformation of Sociology (Totowa. NJ: Rowman & Lit-tlefeldi. 988). pp. 99-102.*

*4. The authoritative recent biography of Durkheim is Steven Lukes, Emile Durkheim, is Life and Work: A Historical and Critical Study (New York: Harper & Row, 1972). Helpful brief introductions include Anthony Giddens, Emile Durkheim (New York: Viking Press. 1978); Kenneth Thompson. Emile Durkheim (London: Tavistock Publications, Ltd., 1982); and Robert Alun Jones, Emile Durkheim (beverly Hills. CA: Sage Publications, 1986). Especially good introductions to Durkheim's thought are Dominick LaCapra, Emile Durkheim: Sociologist and Philosopher Ithaca. Y: ornell niversity Press, 1972), and Robert Nisbet, The Sociology of Emile Durkheim (New York: Oxford University Press, 1974). An excellent study in depth is W. S. F. Pickering, Durkheim's Sociology of Religion: Themes and Theories London: outledge Kegan Paul, 1984).*

*5. On the cultural and intellectual milieu of France during the years of Durkheim's career, see the fascinating piece by Henri Peyre,*

*17.Durkheim. Elementary Forms, p. 47.*

*18.Durkheim. Elementary Forms. p. 44. Durkheim does not address an issue that would seem problematic for this view of magic; namely, that in the accounts Frazer and Tylor provide, it often has a decidedly communal rather than just personal dimension. Magical rites are often performed not just to heal individuals of sickness or cast out a demon, but to protect entire communities from harm or to ensure favorable weather for fields and crops that belong to all.*

*19.Durkheim. Elementary Forms. pp. 71 -86.*

*20.Durkheim. Elementary Forms. pp. 48-70.*

*21.Durkheim. Elementary Forms, p. 168.*

*22.Though Durkheim pays most attention to the work of Spencer and Gillen, he does give credit to several of these less well known figures who did similar research; see Elementary Forms. pp. 88-93. and 91. n. I. On his debt to the English and American "anthropological school." see Lukes, Emile Durkheim. pp. 450-53.*

*23.For this discussion see Durkheim. Elementary Forms, pp. 144-48.*

*24.Durkheim. Elementary Forms, p. 188.*

*25.On the totemic principle see LaCapra. Emile Durkheim, pp. 261-65.*

*26.Durkheim. Elementary Forms. p. 206; on this crucial linkage between the clan, the totem, and the totem symbol, with each as sacred, see Giddens. Emile Durkheim. p. 94.*

*27.See Alpert. "Durkheim's Functional Theory of Ritual." in Nisbet. Emile Durkheim: With Selected Essays. pp. 137-41.*

*28.Durkheim. Elementary Forms. p. 209.*

*29.Durkheim. Elementary Forms, pp. 218-19.*

*30.On this see Nisbet. Emile Durkheim: With Selected Essays. pp. 78-80.*

*31.Durkheim. Elementary Forms. p. 249.*

*complicated one. For a discussion that sees Durkheimian explanation as decidedly functionalist, see Harry Alpert. "Durkheim's Functional Theory of Ritual," in Nisbet, Emile Durkheim: With Selected Essays. pp. 137-41; for a discussion of those senses in which Durkheim can or and cannot be called a functionalist, see Albert Pierce, "Durkheim and Functionalism," in Wolff, ed., Essays on Sociology and Philosophy, pp. 154-69.*

*12.For discussions of Durkheim's theory of suicide see Lukes, Emile Durkheim. pp. 191-225; La Capra, Emile Durkheim. pp. 144-86; and Hanan C. Selvin, "Durkheim's uicide: urther Thoughts on a Methodological Classic." in Nisbet, Emile Durkheim: With Selected Essays, pp. 113-36.*

*13.On Durkheim as a political theorist, see Steve Fenton, Durkheim and Modern Sociology (Cambridge, England: Cambridge University Press, 1984), pp. 81-115; Giddens, Emile Durkheim, pp. 54-68: Thompson, Emile Durkheim. pp. 145-60; Nisbet, Sociology of Durkheim, pp. 128-55.*

*14. It was not published in its entirety until 1938; see Lukes, Emile Durkheim. pp. 379-91.*

*15.See Ernest Wallwork, Durkheim: Morality and Milieu (Cambridge. MA: Harvard niversity Press, 1972): Nisbet, Sociology of Durkheim, pp. 187-208; Robert Reiner. "Crime, Law and Deviance: The Durkheim Legacy," in Fenton, Durkheim and Modern Sociology. pp. 175-201; and Morris Ginsberg. "Durkheim's Ethical Theory." in Nisbet. Emile Durkheim: With Selected Essays, pp. 142-52.*

*16.Durkheim. Elementary Forms. p. 47. On the importance of this distinction, see Nisbet. Sociology of Durkheim. pp. 172-76.*

*York: Charles Scribner's Sons, 1975), pp. 175-76. 188.*

*45. On Frazer's intellectualism and the "ritualist school" which in England followed im nd reacted against his work. see Robert Ackerman. The Myth and Ritual School: J. G. Frazer and the Cambridge Ritualists (New York: Garland Publishing. 1991).*

*46. A careful discussion of causal. interpretive, and functional levels of explanation in Durkheim's work can be found in Lukes, Emile Durkheim. pp. 462-77.*

*47. See Thompson. Emile Durkheim. p. 136.*

*48. E. E. Evans-Pritchard. Theories of Primitive Religion. p. 65.*

*49. "Dogmatic Atheism in the Sociology of Religion." in W. S. F. Pickering. ed.. Durkheim on Religion. tr. by Jacqueline Redding (London: Routledge & Kegan Paul, 1975). pp. 228-76; first published in Revue d'histoire et de philosophie religieuse (1923).*

*50. W. E. H. Stanner. "Reflections on Durkheim and aboriginal Religion," in Pickering. ed., Durkheim on Religion. pp. 277-303.*

*SI. Arnold van Gennep. review of The Elementary Forms of the Religious Life, in Pickering, ed.. Durkheim on Religion, pp. 205-208; first published in Mercure de France (1913).*

*52. See in particular Stanner. "Reflections on Durkheim and aboriginal Religion," and A. A. Goldenweiser, review of The Elementary Forms of the Religious Life, both in Pickering, ed., Durkheim on Religion. pp. 277-303. 209-27. Goldenweiser's article was first published in American Anthropologist (1915).*

*53. See, for example, the writings of Donald Wiebe, especially "The Failure of Nerve in the Academic Study of Religion," Studies in Religion*

*32. Durkheim. Elementary Forms. pp. 280-81.*

*33. Kenneth Thompson. Emile Durkheim. pp. 138-39, cites the controversial work of Guy Swanson, The Birth of the Gods: The Origin of Primitive Beliefs (Ann Arbor. Ml: University of Michigan Press, 1960) as a recent attempt to develop this theme of Durkheim by showing. with the help of statistical analysis, a correlation between certain types of society and the presence of belief in a high god. For a close analysis of Swanson. see Ian Hamnett, "Durkheim and the Study of Religion," in Fenton, Durkheim and Modern Sociology, pp. 208-11.*

*34. On the importance of the cult and ritual to Durkheim's theory, see Nisbet. Sociology of Durkheim, pp. 176-84.*

*35. Durkheim, Elementary Forms, pp. 299-309.*

*36. Durkheim. Elementary Forms. pp. 309-14.*

*37. Durkheim, Elementary Forms. p. 347.*

*38. On this "causal" action of society in the creation of religion, see Lukes, Emile Durkheim, pp. 462-477. and Hamnett, "Durkheim and the Study of Religion," in Fenton. Durkheim and Modern Sociology, pp. 207-208.*

*39. Durkheim defines his use of this term in Elementary Forms. p. 389.*

*40. On Durkheim's influence in the United States, see Roscoe C. Hinkle, Durkheim n merican Sociology," in Wolff. ed.. Essays on Sociology & Philosophy,pp. 267-95; see also Nisbet, Sociology of Durkheim, pp. 55-61, 110-13, 210-Il.*

*41. Durkheim, Elementary Forms, p. 10.*

*42. Durkheim, Elementary Forms, p. 212.*

*43. Durkheim, Elementary Forms, p. 92; on this, see especially the comments by Nisbet, The Sociology of Emile Durkheim, pp. 69-72.*

*44. On these later anthropological theorists, see Eric Sharpe. Comparative Religion: istory New*

*Giddens. Anthony. Emile Durkheim. New York: Viking Press. 1978. An insightful, brief study by a leading contemporary sociological theorist.*

*Jones. Robert Alun. Emile Durkheim. Beverly Hills, Callf.: Sage Publications. 1986. An illuminating short study by a scholar familiar with Robertson Smith. Frazer. and other early interpreters of religion.*

*LaCapra. Dominick. Emile Durkheim: Sociologist and Philosopher. Ithaca. N.Y.: Cornell University Press. 1972. A substantial account of the full range of Durkheim's thought.*

*LuKes, Steven. Emile Durkheim. His Life and Work: A Historical and Critical Study. New York: Harper & Row. 1972. The definitive recent examination of Durkheim's life and thought.*

*Mestrovic, Stjepan G. Emile Durkheim and the Reformation of Sociology. Totowa. N.J.: Rowman & Littlefield, 1988. An assessment of Durkheim's role in creating the modern field of sociological inquiry.*

*Nisbet. Robert A. Emile Durkheim: With Selected Essays. Englewood Cliffs, N.J. : Prentice-Hall, 1965. A critical assessment with illuminating contributions from other authors on Durkheim's most important books and leading theories.*

*Nisbet, Robert. The Sociology of Emile Durkheirn. New York: Oxford University Press. 1974. Excellent on the historical context of Durkheim's work and on the social thinkers, especially in France, who preceded Durkheim and influenced his thought.*

*Pickering, W. S. F., ed. Durkheim on Religion. Translated by Jacqueline Redding. London: Routledge & Kegan Paul, 1975. Presents selections from Durkheim's original works on religion along with selected reviews by other scholars, including some f the very earliest assessments of The Elementary Forms.*

*Pickering, W. S. F. DurLJieim's Sociology of Religion: Themes and Theories.* London.

***13 (1984): 40 1-22; also the following works of Robert Segal: "In Defense of Reductionism," Journal of the American Academy of Religion 51 (March 1983): 97-124; Religion and the Social Ssciences: Essays on the Confrontation (Atlanta: Scholars Press, 1989); and Explaining aand Interpreting Religion: Essays on the Issue, Toronto Studies in Religion (New York: Peter Lang, 1992).***

***54. Daniel L. Pals, "Is Religion a Sui Generis Phenomenon?" Journal of the American Academy of Religion 55, 2 (1987): 260-82.***

## Suggestions for Further Reading

*Bellah. Robert N., ed. Emile Durkheim: Morality and Society: Selected Writings.*

*Chicago: University of Chicago Press. 1973. An instructive selection of Durkheim's ore mportant shorter writings, chosen and introduced by a leading American sociologist of religion.*

*Durkheim. Emile. The Elementary Forms of the Religious Life. Translated by Joseph Ward Swain. New York: The Macmillan Company, [1912] 1915.*

*Durkheim. Emile. The Division of Labor in Society. Translated by G. Simpson. Glencoe. Ill.: The Free Press, [1893] 1964.*

*Durkheim. Emile. The Rules of Sociological Method. Translated by S. A. Solovay and j. H. Mueller. Chicago: University of Chicago Press, [1895] 1938.*

*Durkheim. Emile. Suicide: A Study in Sociology. Translated by J. A. Spaulding and G. Simpson. London: Routledge & Kegan Paul, [1897] 1951.*

*Fenton, Steve, .ed: Durkheim and Modern Sociology. Cambridge, England: Cain-bridge University Press, 1984. Essays by recognized authorities who assess Durkheim's role and influence in the develop ment of contemporary sociological research.*

# فەلسەفە کۆچبەرییە

• عومەر مهیبل

▪ لە عەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

(ئەگەر پێتان وایە فەلسەفە بێسودە، فەلسەفەکاری مەکەن)

(جیاوازی و دووبارەبوونەوە)

لە وتارێکدا کە تێیدا میشێل فۆکۆ بە بۆنەی دەرچوونی دوو کتێبی هەرە گرنگی جیل دۆلۆز ئاهەنگ دەگێڕێت، هەردوو کتێبی (جیاوازی و دووبارەبوونەوە) و (هەست)، وتە ناودارەکەی خۆی دەڵێت: (ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم سەردەمە دەبێتە سەردەمێکی دۆلۆزی. سەردەمی دۆلۆز-ی بەو ڕۆحەی کە دژی هەموو بتگەرایی و هاوشێوەییەکە، هەڵگەڕاوە لە دژی سەمتی هزری دیسپلین کراوو فەلسەفەی ئیحتیرافی -ئەو فەلسەفەیەی تەنیا بۆ هزرڤان و فەلسەفەکارانە-، دۆلۆز-ی بە ژیان لەگەڵ شێتی و بانگەشەکردنی بۆ تێکشکاندنی چوارچێوەی عەقلانیەتی ئامێرگەرایی توند و ڕزگارکردنی مرۆڤی هاوسەردەم لە میرات و پاشماوەی ڕۆشنگەری کە مۆدێرنیزمی خۆرئاوایی بەرجەستە کراوە هەرە یەقینیەکانی خۆی لەسەر بونیادناوەو لە هەمووشیان گرنگتر ئەمانەن:

*1*)بڕواهێنان بەوەی جیهانی سروشتی ئەو جیهانە ڕاستەقینەیە کە دەبێت دەستی پێوە بگیرێت و ئەو یاسایانەش بدۆزرێنەوە کە لە سایەیەوە ڕێکدەخرێت، ئەوە لەپاڵ ئەوەی کەڵەکەبوونی مەعریفە دەبێت لە پێناو کۆنترۆڵکردنی سروشتدا بێت و داهاتەکانی سروشتیش لە خزمەتی مرۆڤدا بێت، چونکە چارەنوسی مرۆڤ لێرە لەسەر زەوی دیاری دەکرێت، نەوەکو لە جیهانی ئایدیاو بەها پێشینەییەکان.

2)بڕواهێنان بەوەی مرۆڤ مادەی سەرەکی و توخمی بنەڕەتی هەر پێشڤەچوون و کردەو چالاکییەکە، چونکە لەیەك کاتدا وەسیلەو مەبەستیشەو خاڵی سەرەکی کێشکردنە لەهەر کردەیەکی گریمانکراودا بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی پێوەندی نێوان خودو شتەکانی نێو جیهانی سروشتی.

3)بڕواهێنانێکی بێوێنە بە تواناو وزەکانی عەقڵ، چونکە عەقڵ بە جۆرێك درك بە ڕاستی و مەعریفە دەکات بە شێوەیەك ڕێگای پێدەدات ژیانی خۆی ڕێکبخات و شارستانیەت بونیاد بنێت. ئەو عەقڵە هەرچەندەی نهێنیەکانی سروشت و یاسا بنچینەییەکانی دەدۆزێتەوە، ئەوەندە زیاتر هەست بەوە دەکات کە لەژێر پاڵەپەستۆی ئایندەی نادیاردا دەرباز دەبێت.

چوونە نێو جیهانی ئاڵ و والای دۆلۆز سەرکێشییەکە ئەنجامەکەی مسۆگەر نیە، چونکە جگە لە شێوازی قورس و گرانی نوسینی، ئەوە زیاتر دوچاری سەرسوڕمان دێین کاتێك سەرنج دەدەینە ئەو بابەتانەی لەسەریان دەنوسێت، لە فەلسەفەوە بۆ ئەدەب، لە شانۆوە بۆ دەرونشیکاری و مۆسیقاو شیعر. نوسین لەم هەموو بوارە بە بەکارهێنانی ئاستی میتۆدی جیاواز لە نێوان دەرونشیکاری فەلسەفی ئەبستراکت و دەرونشیکاری پشت ئەستور بە ئەنجامەکانی دەرونشیکاری، ئەوە لەپاڵ شێوازێکی ئێستێتیکی و هونەری کە جۆرەها زاراوە و دەربڕینی هەستی تێدا بەکاردەهێنرێت. ئەوەش ئاڵ و والایی ئەم جیهانە گەورەتر دەکات و زیاتر ئاڵۆزی دەکات، ئەم ئاڵۆزیەش دەکرێت لە سایەی ئەم تێبینیەدا جەختی لەسەر بکرێتەوە:



دۆلۆز و گاتاری

ئەگەرچی لە ڕووی تیۆریەوە کتێب و وانەبێژی و وتار و دیمانەکانی دۆلۆز کەڵەکە بوون، بەڵام بە شێوەیەکی وا نەخوێندراونەتەوەو قسەیان لەسەر نەکراوە، وەکو ئەوەی لەگەڵ کارەکانی فۆکۆو دریدا ئەنجامدراوە، ئەگەرچی لە ڕووی جیهانبینیەوە لە یەکتریش نزیکن، ئەوە ئەگەر نەڵێین تێکهەڵکێشراون. کەواتە ئەوە مانای چیەو بۆچی دۆلۆز نەخوێندراوەتەوە؟ ریمۆن بیلۆر لە لێکۆڵینەوەیەکدا هەندێك سیمای سەرەکی ئەو مانایەمان پیشاندەدات و دەڵێت: (ئەم نوسینانە قورس و فرەو جیاوازن، لاسارن، ناتوانرێت بەردەوام پێشبینی ئەوە بکرێت کە چی لە ناوەخۆیاندا هەڵدەگرن، ئەو نوسینانە پێوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ پاشماوەی هەموو شتێکدا

هەیە (هزر، هونەر، زانستەکان، جەستەکان، ئاژەڵ،.. تاد). ئەوە لەلایەك، لە لایەکی تریشەوە بەردەوام پێش هەموو ئەو شتانە دەکەوێت کە دەسکاریان دەکات بە شێوەیەك وجودێکی سادە دەبێتە وجود لە سایەی ئەو هێزەوە، ئەوەش لەبەرئەوەی کاری یەکەمی فەلسەفە بریتیە لە داهێنانی چەمك و گریمانکردنی پانتایی لە نێوان ئەوەی هاتوەو ئەوەی کە دێت و دواتریش شوێنگە داکوتان لە ناوەوەی.

ئەگەر ئەم فرەیی و جیاوازیە بەربەستێکی میتۆدی بێت لەبەردەم خوێندنەوەو تێگەیشتن لە نوسینەکانی دۆلۆز، ئەوە لە بەرانبەردا فاکتەرێکی دەوڵەمەندی و بەپیتیشە کە وا دەکات کارەکان کراوەو نەرم و نیان بن، فرە دەروازە بن، کراوە بن بەسەر فاکتەرە هزریە جیاوازەکان، لەبری ئەوەی خۆیان لەنێو سەمتێکی فەلسەفی چەقبەستوو بەند بکەن کە ڕێگر بێت لەبەردەم بزاڤ و تواناکانی لەسەر دۆزینەوەی هەست و هەڵچونەکانی مرۆڤ لەنێو یەکەم لانکیدا. بۆیە هێزی سەرەکی نێو هزری دۆلۆز ئەو کێشکردنەیە کە لە نێوان ڕوداو و هزرەکان و ڕوداو و شوێن و ڕاگەیاندندا هەیە، کێشکردنێك لە پۆزیتیڤیزمەوە دەمانگوازێتەوە بۆ فینۆمینۆلۆژیا، لە فەلسەفەی مێژوەوە بۆ جیهان، بۆ جەستە، بۆ خوا، بۆ من، کێشکردنێك سیماو مۆرکی ئەو هزرە لەنێو ڕێگا پێچاوپێچەکان دەردەخات و سنوری بەیەکگەیشتنی نێوان من و ئەو ئەویترو نێوان من و جیهان لەنێو سەیرورەتی نزیکی و دووری وێنە دەکێشێت، کێشکردنێك کە بنەمایەکی بەپیت بۆ پێکهێنانی چەمکەکان و گەشەکردنیان پێکدەهێنێت، بەوەی کە ئەم چەمکانە ڕۆڵی سیستەمی پاڵپشتیو سەرەکی دەبینن و بزاڤکارێکی گرنگن لە هەموو کردەیەکی مەبەستگەرایی بۆ بەرهەمهێنانی مەعریفە لە سایەی سیستەمی زمانەوە، چونکە کولتوری مرۆڤ و کەڵەکەبوونی مەعریفە جیاجیاکانی و سروشتی تێڕوانینی بۆ واقیع دەستنیشانی مانای چەمکەکان دەکەن لە کاتی بەکارهێنانیاندا.

**کاری هەرە لە پێشینەی فەلسەفە لای دۆلۆز بریتیە لە داهێنان و داتاشینی چەمك**

بەم جۆرە کاری هەرە لە پێشینەی فەلسەفە لای دۆلۆز بریتیە لە داهێنان و داتاشینی چەمك، ئەوەش فرمانێکە فەلسەفە لە مەعریفەکانی تر جیادەکاتەوە، بەوەی کە لێکۆڵینەوەیەکی شۆڕشگێڕی جینالۆجیەو دەستبەرداری داهێنانی چەمك و چاندنی لەنێو کایەی مەعریفە جیاوازەکاندا نابێت. لەلای دۆلۆز چەمك ڕێگا لەوە دەگرێت هزرەکان ببن بە ڕاوبۆچوونی سادەو قسەیەکی تێپەڕ، چونکە هەموو چەمکێك بەو هێزە جیادەکرێتەوە کە لەنێو خۆیدا هەڵیدەگرێت و دوو ڕەهەندی سەرەکیشی هەیە، ئەوانیش ئیدراك و کارتێکەرەکانن.

ئیدراك بریتیە لە کۆمەڵێك هەست و پێوەندی و لای ئەو کەسەی هەستی پێدەکات پارێزگاری لە وجودی خۆی دەکات، بەڵام کارتێکەرەکان سۆزو

مەیل نین، بەڵکو سەیرورەیەکن لەو شتانە دەئالێن و تێپەڕدەکەن کە لێیان ڕەت دەبن و جیاواز دەبن. بۆیە ئەو شتە درك پێکراوو کارتێکەر و چەمکانە بریتین لە هێزی هاوسیٚ کە بەسەر یەکتریدا زالٚ نابن، بەڵکو لە هونەرەوە بەرەو فەلسەفە دەچن و لەویشەوە بە پێچەوانەوە دەگەڕێنەوە.

کردەی نوسین لای دۆلۆز –بەتایبەتیش لەنێو کتێبی جیاوازی و دووبارە بوونەوەدا– لە شێوەی هەوڵێکی دەگمەندایە بۆ بەرز ڕاگرتن و نرخاندنی ژیان و هەوڵێکە بۆ ڕزگارکردنی لەدەست ئەو شتانەی ژیانیان زیندانی کردوەو لە کارو چالاکی کەم دەکەنەوە، چونکە کردەی داهێنان بە مانا فراوانەکەی ناکاتە بەردەوامبوون، بەڵکو دەکاتە بەرەنگاربوونەوە، بەرەنگاربوونەوەی ئەو شتانەی ژیان دەکەنە ئیستیبتانیکی (أستبطان) تاکەکەسی و خەمی خودو لادانەکانی دەگێڕێتەوە یا دەیکاتە چیرۆك و ڕاڤەیەکی ئەبستراکت، ئەگەرچی خودی ئەبستراکت پێویستی بە ڕاڤەکردن هەیە، ئەوەش بە پێی ئەو وتەیەی کە دەڵێت چەمك مانایەکی گشتی و گشتگیری نیە، بەڵکو بریتیە لە کۆمەڵێك تاکگەرایی و تایبەتمەندی کە هەریەکێکیان لە پێناو ئەوەدا کاردەکات تاوەکو ئەویتر تێپەڕ بکات. مۆرکی فرەیی چەمکەکان و سەرهەڵدانیان لە شێوەی جیاجیا کە ڕەنگە لە ئەسڵدا دژ بە یەك و ناکۆك بن پالٚ بە جیل دۆلۆز–ەوە دەنێت بڕوای وابێت کە وێنەی هزرە، داهێنانی چەمکەکان ئاراستە دەکات، چونکە چەمکەکان لە دوولا لە ئاوێنەی هزر ئاوەژوو دەبنەوە، بۆیە ئەو زاراوانەی کە مەرجی ئاوەژووبوونەوەی چاوەڕوانکراویان تێدا نیە، لە پلەو پایەدا ناگەن بە پلەو پایەی چەمك، کەواتە ناتوانێت ئەو فرمانە جێبەجیٚ بکات کە لە بواری ئاراستەکردنی کردەی بونیادی هزرە فەلسەفیەکاندا لە سایەی ئامێری چەمکەکانەوە پێیدراوە.

ئا لێرەدا کردەی داهێنانی چەمك، تاوەکو نەڵێین داتاشینی، مەسەلەیەکی ئەوەندە سانا نیە کە خۆی وا نمایش بکات وەکو تەکنیکێکی پەتی لەبەردەم ئەو فەلسەفەکارەی کە لە چەندین شوێنی جیاجیادا بەکاری دێنێت، ئەو چەمکانە لەنێو (نوسینی فەلسەفیدا) وەکو ئەو کۆرپەیە دێنە دەر کە لە سکی دایکی دوای کۆمەڵێك لە ئێش و ژانی توند دێتەدەر، بۆ ئەوەی دواتر لە کۆتاییدا چەمك بە کامڵی و تەواوی دەربکەوێت پاش ئەوەی لەنێو منداڵدانی سیستەمێك لە هزر گەشە دەکات و پێدەگات، ئەو سیستەمە هزرییەی فەلسەفەکار دایدەمەزرێنێت.

هەڵەیە وا تێبگەین کە دەتوانین بەردەوام چەمکی نویٚ بەدەست بێنین وەکو ئەوەی لەنێو زاراوەکانی زمانی ئاساییدا هەیە لە ڕێگای شێوازی دەربڕینی ئاساییەوە دەتوانین تەولیفیان بکەین.

کاتێکیش دەپرسێت (فەلسەفە چیە؟) – کتێبەکەی دۆلۆز هەمان ناوی هەیە– ئەوە نایەوێت بێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، بەڵکو هەوڵدەدات لە پەنای ئەم پرسیارەوە هاوسێیەتی گریکیانەی مانای فەلسەفە بکات، بەوەی فەلسەفە حەزکردن و خۆشویستنی داناییە –حیکمەت– یا ناسین و زانینی پرنسیپە سەرەتاییەکانەو

سڕینەوەی ئەو وێنانەیە كە بە خەیاڵی ئێمەدا هەڵواسراون و ئاراستەی سەرمەدییەت و جیهانی ئایدیامان دەكات. چونكە فەلسەفە لە خۆشویستنی حیكمەتەوە دەگۆڕێت بۆ عەشق و خۆشەویستی، فەلسەفەكاری دوور لە خەڵك و دابڕاوو تەنیا، دەگۆڕێت بۆ گەڕۆكێك كە هەموو سەرزەوی دەبێتە بواری كاركردنی، بۆیە جیل دۆلۆز ناونراوە بە فەلسەفەكاری گەڕۆك و فەلسەفەكەشی ناونراوە بە جیۆفەلسەفە.

ئەو زاراوەیەی (جیۆ) ڕەنگە بە مانای زەوی بێت، یا ڕەنگە بە مانای جیۆلۆجیا بێت، یا مانای جوگرافیا بێت، خۆ دەشێت هەر هەموو مانایەكانی هەبێت، یا هیچ مانایەكیشی نەبێت. بەڵام ئەوەی لەنێو ئەم گۆڕانگاریانەدا دیارە ئەوەیە كە چەمكی فەلسەفە بە گشتی زیاتر فراوانتر و زیاتر كراوەتریش بوە، زیاتریش دودڵكارە. بە شێوەیەك دەتوانین بڵێین فەلسەفە ڕەنگە ببێتە هەموو شتێك، تەنیا فەلسەفە نەبێت، چونكە دڵنیابوون و یەقینی لە بەرامبەر وەڵامەكان، فەلسەفە دەكات بە ڕێنمایی و وەسیەت، بۆیە بەردەوام هەوڵدەدات ئەو شتانە بهەژێنێت كە خەڵك لەسەریان ڕێككەوتون و دروستكردنی ناوچەی نائارام لەنێو بونەوەردا بە شێوەیەك بەردەوام تۆوی پرسیار تێیدا لەدایك دەبێت و سەرهەڵدەدات.

دۆلۆز دێت بەوە دەستپێدەكات كە چەمك بخاتە ژێر پرسیار، ئالێرەوە دێت دەست دەكات بە نزیكبوونەوە لە ماهیەتی فەلسەفە، تێگەیشتنی سەرەتایی خۆی بۆ فەلسەفە كە پێی وانیە لەسەر داهێنانی چەمك و ژیان لەگەڵیدا بونیادنراوە، لەوەی كە فەلسەفەكار هاوڕێی چەمكەكانە، بەڵكو چەمكێكی بەهێز. فەلسەفە تەنیا هونەری پێكهێنان یا داهێنان یا دروستكردنی چەمك نیە، چونكە چەمكەكان شێوە یا دۆزینەوەی مادە نین. فەلسەفە

دۆلۆز دێت بەوە دەستپێدەكات كە چەمك بخاتە ژێر پرسیار، ئالێرەوە دێت دەست دەكات بە نزیكبوونەوە لە ماهیەتی فەلسەفە

لە شێوەی تونددا ئەو لقەیە كە بایەخ بە داهێنانی چەمك دەدات. لەگەڵ یەك تێبینی سادە ئەویش ئەوەیە كە سەرلەنوێ پرسیاركردنەوە لە بارەی چەمك دەبێت زەمەنی پرسیاركردن و شوێن و كەسەكان لەبەرچاو بگیرێت، چونكە چەمكەكان موفرەدات نین بۆ حەقیقەت بەو ڕادەیەی كە ئامراز یا كلیلن دەتوانن مامەڵە لەگەڵ كەش و هەوای ئەم حەقیقەتە بكەن، چەمك ئەو زاراوەیە لۆژیكی و ئەبستراكتە نیە، بەڵكو خاوەنی كەسایەتیەكی چەمكگەراییەو كاری ئەوەیە چەمك لەنێو زەوی تازەدا بڕوێنێت، ئەو دادەبەزێتە ئاستی ڕووداو، خۆ ڕەنگە ببێتە دیارترین ڕووداویش، چونكە ئەو بەوەندە ناوەستێت كە پێشكەش بكات، بەڵكو ئەوە دەست لە كردەی (ئیستیكناكردن)ی ئەوانی تریش وەردەدات، بە مانای ئەوەی چەمك خۆی بە دابڕاوی و جیا لە دەوروبەری هیچ بایەخێكی نیە،

چونكە ئەو لە سایەی دەستێوەردانی لە پێكهاتەی ئەوانی تردا دێت خۆی پێكدەهێنێت، بۆیە دەبینین دۆلۆز خۆی بەوە ماندو ناكات كە چەمك لە پێناو خودی خۆیدا داوا بكات، ئەوەش بە پشت بەستن بە وێناكردنی یەكەمی خۆی بۆ چەمك كە پێی وایە هیچ بابەتێكی نیەو خۆیشی بابەتی هیچ شتێكی تر نیە. ئەوە دروستكردنێكە پێویستی بە خاكێك- زەویەك هەیە، پێویستی بە كەسێكە بتوانێت لە سایەیەوە كاریگەری خۆی نمایش بكات، بۆیە شتێكی سادەو ساكار نیە، پێكهاتەیەكی گوتاری نیە سیمای بەدوایەكدا هاتن و گونجانی وەرگرتبێت، بەڵكو شتێكە بەردەوام لە جوڵەو بزاڤدایەو لە دووری هەر سێنتەرێكەوە بلاودەبێتەوە، ئەو دژی سێنتەر و دژی هەمەكییەتە بە مانا تەقلیدیەكەی، جگە لەوەش ئەو بە شێوازێكی سەرنج ڕاكێشیش بە دوای چەمكدا دەگەڕێت، لە جیاكردنەوەی نێوان چەمك و ناچەمك یا ئەو شتەی بە چەمك چوێنراوە. چونكە هەر جۆرە مەعریفەیەك خاوەنی سیستەمێكی چەمكگەراییەو هەر شێوەیەكیش لە بیركردنەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە. بۆ نمونە فەلسەفەكار بە چەمك بیر لە چەمك دەكاتەوە، زانا بیر لە وەزیفە دەكاتەوە و هونەرمەندیش لە هەست. لە دوایشدا چەمك مادام شتێكی داهێنراوو ئافرێدەكراوە، ئەوە دیارە سیمای داهێنەرەكەی خۆی یا ئەو فەلسەفەكارە هەڵدەگرێت كە دایڕشتوە، ئەوەش بەرەو ئەنجامێكی گرنگمان دەبات، بەشی یەكەمی ئەنجامەكە ئەوەیە كە هەموو فەلسەفەیەك ئەزمونێكی خودی و نایابەو هەرچەندە لە فۆرمی دەرەكیدا نزیك بێت لە فەلسەفەیەكی تر، بەلام دووبارە نابێتەوە. بەشی دوەمیش ئەوەیە كە قسەكردن لەبارەی ڕاستی یا ناڕاستی چەمكێك قسەیەكی بێمانایە، بێمانایە بلێین ئەو چەمكە حەقیقییە یا ناحەقیقییە، چونكە هەموو چەمكێك حەقیقەتی خۆی و شێوازی وجودی خۆی هەیە.

فەلسەفەكار لای دۆلۆز كۆچبەرێكەو نیشتیمانەكەی ئەو خاكە فراوانەیە، كەسێكە لەو شوێنە تاریكانە بێزار بوەو لەو چەمكانەش بێزار بوە كە بە درێژایی مێژووی فەلسەفە داتاشراون، فەلسەفەكار ئەو كەسەیە كە بەردەوام دەسبەرداری گەڕان و كۆچبەری نابێت، بە دوای ناوچەی بەپیتدا دەگەڕێت كە دەشێت تێیاندا چەمكەكان وەكو گژوگیا بڕوێندرێن. بۆیە جیل دۆلۆز ناونراوە بە فەلسەفەكاری كۆچبەرو فەلسەفەكەشی بەوە ناسراوە كە فەلسەفەی كۆچبەرو دەشتەكیە. بگرە ئەو بە دامەزرێنەری دەشتەكییاتی یا (ئەدەب و هونەری كۆچبەری- ئۆمادۆلۆژیا) دادەنرێت.

فەلسەفەكار كۆچبەرێكە پڕە لە هەستكردن بە نامۆیی لە خودی خۆی و زمان و نیشتیمانی، ئەو سێ كۆچ كێشی دەكەن: كۆچێك لەنێو مێژووی ڕابردووی گریكی و نیشتیمانی یەكەمی فەلسەفە -وەكو ئەوەی دۆلۆز پێی وایە. كۆچێكیش لەنێو چركەساتی ئێستای خۆرئاوا كە جڵەوی ئێستای فەلسەفەی بەدەستەوەیەو كۆچێكیش كە ناڕۆشن و ئاڵۆزە بەرەو ئایندە. كۆچێك ناوو شوێن و گەلەكەی نەزانراون، چونكە كردەی فەلسەفەكاری شتێك نیە كەس بتوانێت دەستی بەسەردابگرێت و كۆنترۆڵی بكات، بەڵكو لەبەردەم هەموو كەسێكدایە

کە توانای دەستپێشخەری و خۆتێخزاندنی هەبێت.

داهێنانی چەمك لای دۆلۆز بەردەوام گریمانی تێڕوانینێکی نەرم دەکات بۆ ئەزمون، تێڕوانینێکی جیاواز کە دەیخاتە نێو ڕەهەندی مەزهەبی نوێ وەکو ئەوەی ناوی دەنێت (ئەزمونگەرایی ترانسندتالی)، ئەوە بۆیە ئەزمونگەریە چونکە بەردەوام پەیوەستە بە (محایثة) و ترانسندتالیە، سەرەڕای ئەوەش کراوەیە بەسەر ناکۆتا (ناموتەناهی)دا، بەسەر سەدیم یا (کاوس).

داهێنانی چەمك بە شێوەیەکی ئینسکلۆپیدی لەنێو دەقی دۆلۆزدا بەرجەستە دەبێت، چونکە ئەو بە شێوەیەکی فەلسەفیانە مومارەسەی مافی بڕینی لێوارەکان و دەستێوەردان دەکات، بە شێوەیەك کە جۆرج باتای ئەگەرچی خاوەنی تیۆری بڕینە (الاختراق) بەم شێوەیە بیری لێنەکردۆتەوە.

ئەزمونگەرایی ترانسندتالی لای دۆلۆز خۆی لە دژکاری مەزهەبیاتی کلاسیکی تێپەڕ دەکات، ئەو مەزهەبیاتەی پڕە لە دژکاری فۆرمگەرایی بۆ ئەوەی بونیادی مەعریفەیەکی نوێ دابمەزرێنێت کە هەموو بەربەستە دروستکراوەکانی نێوان فۆرمی مەعریفەو ناوەڕۆکەکەی، نێوان خودێتی و بابەتگەرایی، ببڕێت. بەم شێوەیەش بەربەستی نێوان بە فەلسەفی بوون و بڵاوبوونەوەی بەسەر کایە هاوشێوەکانیشیدا ببڕێت. گەشتە هزریەکەی دۆلۆز ساناو ڕێك و گونجاو نەبوو، چونکە ئەو خۆی ویستی وابوو، وەکو چۆن لە پێش ئەو کیرکیگۆر ژیانە وجودیانە کورتەکەی خۆی لە گەڕانی بەردەوام بەدوای ئێش و ئازار و تلانەوەی بەردەوام بردەسەر، ژیانی دۆلۆز-یش کۆچبەری بوو لەنێو ئاقاری پەرش و بڵاوی هزرو بۆچونەکان، کراوە بوو بەسەر هەموو گریمانەیەکدا، بۆ ئەوەی بتوانێت مامەڵە لەگەڵ ئەم ئاقارە ڕەهایەدا بکات، ئەوە فەلسەفەیە کە لە نامۆبوونێکی بەردەوامدایە لەگەڵ زاراوە جەستەییەکەی خۆیدا، دێت لە شێوازە کۆن و کلاسیکیەکانی خۆی جیادەبێتەوە و دادەبڕێت و بە تەنیا تێکەڵی کاری دۆزینەوە دەبێت: دۆزینەوەیەك لە سایەی زمانەوە و لەنێو خودی زمانیشەوە، چونکە لەهەر چرکەیەکدا زمانێکی جیاوازی هەیە کە ڕەنگی ئەو چرکەساتە هەڵدەگرێت.

قوڵبوونەوە لە شیکارکردنی فەلسەفەی دۆلۆز، بەرەو ئەو پرسیارەمان دەبات: ئایا دۆلۆز هیچ چەمکێکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ چەمك لەو ڕوانگەیەوە کە چەمکەکان لوتکەی وتوێژی دورو درێژ و ئاڵۆزی خۆیەتی لەگەڵ مێژووی فەلسەفەدا؟ لەبەرئەوەی زۆر قسەکردن لەبارەی مەسەلەی چەمك بەم شێوەیە ئەبستراکتەی لای زۆر کەس ئاڵۆز دەبێت و هاوشێوەی پرنسیپی ناسنامە دەردەکەوێت، لەو ڕوانگەیەوە کە ئەم پرنسیپە نمونەی چوارچێوەیەکی تیۆرییە کە لێکۆڵینەوەی میتافیزیکی تەقلیدی لە دەوریدا دەخولایەوە. بەم شێوەیەش ئاسان نیە لەدەست دەرکەوتە فرەکانی دەرباز بین -بە تایبەتیش کە ئەو بە شێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەستی لۆژیکی ئەرستۆیی بوە- یەکێك لە دەرکەوتەکانیش ئەوەیە کە پرنسیپی ناسنامە بەرەو مەزهەبیەت و داخرانمان دەبات

بەسەر تاك و تەنیایی و جێگیریدا، بۆیە شکاندنی بۆتەقەی مەزهەبیەت و داخران پێویستی بەوەیە سەرلەنوێ خوێندنەوەیەکی گشتگیر بۆ مێژووی فەلسەفە ئەنجام بدرێت، ئەوەش ئەو کارە بوو کە دۆلۆز لەنێو کتێبەکانیدا کردی بە مەبەستی گەڵاڵەکردنی دەروازەی نوێ بۆ شیکارکردنی چەمك، دۆلۆز لە کانت-ەوە دەستی پێکرد بۆ نیچە، لە لایبنتز-ەوە بۆ برگسۆن، لە پۆل ریکۆر-ەوە بۆ فۆکۆی هاوڕێی، چەمکە سەرەکیەکانی وردوخاشکردوو کردی بە (چەمکۆکە-افاهیم) کە بە شێوەیەکی ڕیژەیی و بەش بەش دەردەکەون، ئەوەش تەواو پێچەوانەی بانگەشەکردنی خودی چەمکەکانە گوایە ڕەهاو هەمەکین، بەڵام پێوەندی دۆلۆز بە فۆکۆ تام و چێژێکی زۆر گەرم و گوڕ و تایبەتی هەیە، چونکە جگە لە هاوسێیەتی شوێنگەیی کە جۆرە هەستێکی بە نامۆبوون لەنێو کۆمەڵگاکانی خۆیاندا لا دروست کردوون و هەندێك کات خۆیان لەنێو داڵانەکانی ئەرشیفدا دەشاردەوە، بەڵام فۆکۆ تاکە فەلسەفەکارە کە لەنێو کتێبەکانی دۆلۆزدا کاری لەسەر کراوە، بۆیە فۆکۆ هات بەرهەمەکانی دۆلۆزی خوێندەوە، بۆ ئەوە نا کە تێیان بگات، بەڵکو بۆئەوەی لەنێو ئەم کتێبانەدا بە دوای خودی خۆیدا بگەڕێت، بە تایبەتیش لەنێو کتێبی ئەگەر بشێ ناوی بنێین -مەزهەبی- (جیاوازی و دووبارەبوونەوە)، چونکە لەنێو ئەم کتێبەدا گرنگترین وتە فەلسەفیەکانی دۆلۆز دەردەکەون کە لەنێو بونیادی پرۆژە فەلسەفیەکەیدا خستبویە ڕوو.


فۆکۆ

جگە لەوەش ئەم کتێبە -بەلایەنی کەم بە مەزەندەی ئێمە -ئۆرگانۆن-ی لێکۆڵینەوەی (جیاوازی)یە کە بە گشتی پانتاییەکی فراوان لەنێو ئاسۆی مەعریفەی فەرەنسی و عەرەبی داگیردەکات، چونکە ئەم کتێبە بەوە لە کتێبەکانی تری دۆلۆز جیادەکرێتەوە کە کتێبێکی تیۆری تیۆریزەکراوەو تێیدا پراکسیسی گەشت و کۆچبەرییە بۆهیمی و لەناکاوەکانی خۆی کردوە لەنێو چەمکەکانی خۆیدا، کەچی لەنێو کتێبەکانی تریدا بەتایبەتیش کتێبی (لۆژیکی هەست) پراکسیسی کۆمەڵێك پراکتیکی بێ سنور دەکات لەنێو جۆرەها بەرهەمی ئەدەبی و هونەری و فەلسەفی و هەندێکجار زانستیش لە پێناو دامەزراندنی بونیادی سیستەمێکی تایبەت بە چەمکەکانی خۆی.

ئەو مەسەلەیەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە دۆلۆز لەوکاتەی لە لوتکەی سەرقاڵی خۆیەتی بە هەڵوەشاندنەوەی تیۆری چەمکێك لە چەمکەکان، واز لەوە ناهێنێت سەرقاڵی دەقی کەسانی تر بێت و خۆی تێکەڵاویان بکات و پرسیاری فەلسەفی لەبارەیانەوە دابهێنێت، پرسیارێك لە لۆژیکەوە بەرەو زانست و وێنەکێشان و مۆسیقا، لەبەرئەوەی قورسترین و ئاڵۆزترین کار ئەوەیە کە پەیوەستە بە تۆمارکردنی جێکەوتی داهێنەرانەی هاوشان بە سیستەمی چەمکگەرایی ئاڵۆز بەو زاراوە

داتاشراوو وشکانەی کە خوێنەر زۆر بە زەحمەت و قورسی دەتوانێت ڕەمزەکانی بکاتەوە، ئەو ڕەمزانەی کە تێیدا شتی زانستی و ئایدیۆلۆژی و فەلسەفی و جوگرافی-یش بەیەکەوە کۆدەکاتەوەو ئاوێتەیان دەکات. یەکێك لە گرنگترین ئەم زاراوانە (جیۆفەلسەفە)یە کە چەمکێکی دۆلۆزی نوێ و فرە دەلالەتەو بە نیازی ئەوەیە بنچینەیەك بۆ ڕاڤەکردنێکی مێژوویی جیاواز بۆ پێوەندی داهێنانی چەمکگەرایی لە پێکهێنانی کولتور و شارستانیەتەکان دابنێت. بۆ پێوەندی پڕ لە دڵەڕاوکێی هەندێك لە چەمکەکان لەگەڵ یەکترداو تێکەڵاوبوونیان بە ڕادەیەك ئاڵۆز بوون، تەنانەت دۆلۆز بیروباوەڕی ئاینیش وا دەبینێت کە جۆرە هەڵوێستێکی نیمچە فەلسەفیانەیە کە ڕەنگە وێنەو چەمك ئاوێتەی یەکتری بکات.

ئەگەرچی دۆلۆز جیاوازی کرد لە نێوان کولتوری وێنەو کولتوری چەمکەکان، بەڵام لەبەر ئیشکالیەتی بابەتەکە بەرەو ئەوە نەچوو کە بە ئاشکرا لە یەکتریان جیابکاتەوە، چونکە شتە فەلسەفیەکان ڕەنگە هاوسێیەتی شتە ئاینیەکان بکەن، بەڵام دەبێت لێی دابڕێن، ئەوەش ئەو کارەیە کە یۆنانیەکان توانیان دایبهێنن و لەگەڵیدا بژین وەکو ئەوەی (جۆن بۆفری) لە کاتی شیکارکردنی چەمکی کەینونە لەلای هایدگەر ئاماژەی بۆ دەکات.

ئەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هایدگەر پێی وایە دەسپێشخەری فەلسەفیانە گرنگترین تایبەتمەندی گریکیە کە مێژووی بەرایی خۆرئاوا پێکدێنن، یا مێژووی دامەزرێنەری خۆرئاوان، بەوەش شارستانیەتەکانی تر لە مافی شانازی کردن بە خودی هزر بێبەش دەکات.

بەڵام گرنگیدانی دۆلۆز بە هایدگەر پێوەندی بەوەوە نیە کە ئەو دێت بەهانەی بزاڤی فەلسەفەی یۆنانی لە ڕێگای نهێنیەکانی پێدراوی زمانەوانی بەدەستەوە بدات، لەبەرئەوەی زمانی گریکی توانی هەندێك چرکەساتی کەینونە لە شێوەی چەمك پێکبهێنێت، بۆیە بوو بە زمانی کەینونە، واتا زمانی جێنشینبوونی کەینونە لەسەر زەوی یا خاك.



هایدگەر

چەمکی جیۆ فەلسەفە لای دۆلۆز ئیحالەی پێشڤەچوونی ئەو چەمکە هایدگەریەمان دەکات کە پێی وایە کەڵکی حەقیقی سەیرورەتی بونەوەر بریتیە لە گەیشتن بە جێنشینبوون یا ئیقامە، ئەوەش بەپێی هەندێك کردەی تەواوکاری وەکو: بونیادنان، نیشتەجێبوون، بیرکردنەوە. لەبەرئەوەی بونەوەر ناتوانێت بیربکاتەوە تەنیا ئەگەر مەرجی پێویستی ئەم بیرکردنەوەیە وەکو خاڵی دەستپێك و سەرەتا ڕەچاو نەکرێت، بە تایبەتیش جێگیربوون لە شوێنێکی دیاریکراو کە خودی ئەو شوێنە شوێنگەی کەینوونە بێت. لەگەڵ

ئەوەی دۆلۆز بایەخ بە پاشماوەی گریکی و خۆرئاوایی دەدات لە بواری داهێنان و داتاشینی چەمکدا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێی وایە ئەم پاشماوەیە مەرجی تەواوکاری مەعریفی جیۆفەلسەفی تێدا نیە وەکو ئەوەی خۆی لە سەرەتادا نیشانی کردبوو، لەبەرئەوەی یۆنانیەکان لەم ڕوەوە بایەخیان بە ماتماتیك داوەو لە لایەنی فەلسەفیشەوە بایەخیان بە ئایدیا داوە، واتا پانتایی مەعریفەی گریکی پانتاییەکی تیۆری تێڕامانکاری بوە، کەچی خۆرئاوا –واتا ئەوەی دەگاتەوە بە یۆنان بەڵام بەبێ یۆنانیەکان– چەمکی دەستکەوت، بەڵام نەیتوانی زەویەك– خاکێکی بۆ دیاری بکات تاوەکو لەسەری بنیشێتەوە، ئەوەش بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە: (ئێمە لەلای یۆنانیەکان جێگیر –جێنشین– دەبین، بەڵام لەبارەی ئەوەی کە شتێکیان نەبوو ئەو کاتەش لەو ئاستەدا نەبوون، ئەگەرچی ئێمە وامان لێکردن ئەوان سەرلەنوێ لەلای ئێمە جێنشین ببنەوە).

ئەوەش مانای وایە کە چەمك، ئەگەرچی لە ڕووی زەمەنیەوە کۆنە، بەڵام خولگە فەلسەفیەکەی تەواو نەکردوەو تا ئێستاش بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت شوێنێك بدۆزێتەوە تێیدا جێگیر بێت و گەلێکیش بدۆزێتەوە لە سایەیەوە خۆی بەرجەستە بکات.

خۆرئاوا ئەوکاتە داهێنانی چەمکی دۆزیەوە کە لە دەسەڵاتی پارادۆکسیی غەیبی ڕزگاری بوو، پاش ئەوەی سەرقاڵی پێکهێنانی چوارچێوە مەزنەکەی گەڵاڵەکردنی چەمکەکانی مۆدێرنێتی بوو، لەو ڕوانگەیەوە کە چەمکەکانی بزوێنەری میحوەری فەلسەفەن لەم قۆناغە هاوسەردەمەدا کە سەیرورەتە– ئەو پرۆژەیەی بە دوای شوێنێکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ بێت، بەم جۆرەش فەلسەفە دەبێتە نافەلسەفە، تاوەکو نافەلسەفەش ببێتە خاکی فەلسەفەو گەلی فەلسەفە.

دۆلۆز پێی وایە ئەوپەڕی کاری فەلسەفەکاری ئەوەیە کە مەزەنەیەکی سەیرورەتی هەبێت، ڕەنگە ئەم مەزەنە سەیرورەتیە خودی خۆی ڕوداوێکی مێژوویی بێت، ڕوداوی مێژوویی بە مانای کەڵەکەبونی ڕوداو نا، بەڵکو بەوەی کە لە خودی مێژوو تێپەڕ بکات، بەم مانایەش لە (ئەزمونگەرایی ترانسندتالی) نزیکترە، چونکە مێژوو نابێت بەو مەبەستە باڵایانە دیاری بکرێت کە یۆتۆپیا لەخۆدەگرن و ئایدیۆلۆژیاکان وا تێی دەڕوانن، سەیرورەت ڕووداوێکی بەردەوامیە کە مەبەستەکە لەنێو خودی خۆیدا هەڵدەگرێت.

(ئەزمونگەرایی ترانسندتالی) لەلای دۆلۆز سەرلەنوێ چاوخشاندنەوەیە بە مێژووگەرایی چەمك، واتا ئەو چوارچێوەیەی کە تێیدا بونیادی چەمکگەرایی دادەتاشرێت. بونیادێك کە لۆژیکێکی نوێ دادەمەزرێنێت، ئەویش لۆژیکی جیاوازیە. لۆژیکێك لەپێناو ئەوەدا کار دەکات کە بەو یەکتر بڕینە تەقلیدیەی نێوان هونەر و زانست و مێژوودا بچێتەوە، لەبەرئەوەی دۆلۆز لەسەر لێواری وێنەکێشانی تیۆری ئەم یەکتربڕینانە ناوەستێت، بەڵکو زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵدەدات فەلسەفە بخاتە نێو ئەم بابەتانەی باسمان کردن. تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەو بابەتانە خۆیان لە پشت شورای نهێنی و تایبەتمەندی پسپۆڕیش

بشارنەوە، بە تایبەتیش زانست، چونکە دۆلۆز پێی وایە ناکۆکی بنەڕەتی نێوان زانست و فەلسەفە –سەرەڕای ئەوەی لە فۆرمەوە لە یەکدی دوورن– لەوەدایە کە بایەخ بە یەك بابەت دەدەن، ئەویش چەمکی (کاوس) (سدیم)ە. زانست پێی وایە ئەوە ناسیستەمیە، تاوەکو نەڵێین ئاژاوە لە شێوە هزریەکەی، کەواتە یاسا زانستیەکان هەموو بایەخ و شەرعیەتی خۆیان لەنێو ئەم ئاژاوەیەدا وەدەست دێنن، ئەوە لە کاتێکدا فەلسەفە لە سدیم–دا شانۆیەکی کراوە بەدی دەکات بەسەر ناکۆتا بە هەموو سەرنج کێشکردن و لۆژیکە ئاڵۆزەکەیەوە.

لە کاتێکدا زانست تێیدا بەدوای هاوپشتی و مەرجەعیەتدا دەگەڕێت بە مەبەستی بە عەقلانی کردنی گۆڕان و کۆنترۆڵکردنی جوڵەکانی، ئەوە فەلسەفەیە کە هەوڵدەدات پارێزگاری لە خێرایی ناکۆتا بکات، بەبێ ئەوەی دەستبەرداری پنتی ئیرتیکازو جێگیر بێت بەو وەسفەی چرکەساتی ئەوەیە کە تێیدا چڕتر دەبێتەوە، نەوەکو بەرەو سکون، بە مانا سادەکەی بەرێت.

دۆلۆز بڕوای بەوە هەیە کە زانست لە نوێترین پێشڤەچوونە سەرنجراکێشەکانیدا ئێستا لێکۆڵینەوەکانی لەسەر لێواری وردی نێوان موتەناهی و ناموتەناهی–دا بەلادادێت، کەچی ئەو ناتوانێت دالە دیاریکراوەکان بەجێگیرکراوی بۆ شێوەی پێناسەکاری دەرەوەی هەموو چوارچێوەیەك بەکاربێنێت، ئا لێرەدا فەلسەفە دێت بەشداری لە دۆزینەوەی ئەو چەمکانە دەکات کە هاوشانی یا دژکاری دالە ماتماتیکیەکانن، چونکە ناتوانێت تەنیا بە پشت بەستن بە زمانە ماتماتیکیەکەی بیکات بە ڕەمز، ئەوەش لە واقیعدا مەلەسەیەکە زانستی نوێ لە هەنگاوەکانی بەرەو ناکۆتایی کە سەرلەنوێ یەکێتی هزری لە نێوان چەمکە فەلسەفیە گەردونیەکان و بە ڕەمزبووە ماتماتیکیەکان دەگێڕێتەوە، دەسەلمێنێت. کەچی شێوازی دۆلۆز لەو ئەزمونگەراییە نوێیەیدا کە بە شێوەیەکی فسیفسائی پەخشکراوە لەنێو نوسینە سەرەکیەکانیدا، بەو ڕادەیەی هەوڵی نزیکبوونەوە لە گۆڕان دەدات، ئەوەندە هەوڵی یەکخستنێکی دەسکردانەی نێوان چەمکی فەلسەفی و فرمانی زانستی نادات.

ڕەنگە بە هەڵەدا نەچووبین ئەگەر بڵێین کە لەنێو بونیادی فەلسەفیانەی دۆلۆزدا لایەنی فۆرمگەرایی زۆر لە ناوەڕۆکی ئەم بونیادە گرنگترە، ئەو پێی وایە گەورە فەلسەفەکاران –بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە دەینوسن– نوسەری زۆر بە توانان و خاوەنی شێوازێکی جوانی نوسینن، شێوازی نوسین بریتییە لە بزاڤی چەمك. ڕاستە ئەو لە دەرەوەی ڕستەکاندایە، بەڵام ڕستەکانیش هیچ کارێکیان نیە تەنیا ئەوەندە نەبێت کە ژیانێکی سەربەخۆی پێ ببەخشن. شێواز ئەوەیە زمان وای لێبکرێت زیاتر بەرگەی گۆڕان و کرانەوە بەسەر جیهانی دەرەکیدا بگرێت، فەلسەفە وەکو ڕۆمان وایە بەردەوام وامان لێدەکات پرسیار لە بارەی ڕوداوەکانەوە بکەین، لەگەڵ یەك جیاوازی بنچینەیی ئەویش ئەوەیە کەسایەتیەکان لێرەدا بریتین لە چەمك، لە سەرووی ئەمەو ئەوەشدا باڵاترین و پاکترین مەبەست لە نوسین بریتیە لە

ئازادکردنی ژیان لە دیاردەی سەرکوت کردن و داخران و وێنەکێشانی ڕێگاکانی ڕاکردن لەو نەسەقە جیاوازانەی کوت و پێوەندی دەکەن، لێرەدا شێوازی دەربڕینی نوسراو کە بریتیە لە زمان تەواوی ڕاستگۆیی خۆی بەدەست دێنێت وەکو ئامرازێکی بنچینەیی لە پێکهێنانی نەگونجانی زمانەوانی کە لە لایەك لە پێناو نوێکردنەوەی زیندەداری نەسەقە جێگیرەکان کاردەکات و لە لایەکی تریش لەسەر دروستکردنی ناوچەی نائارام لەلای مرۆڤدا کە وەکو چاوتێبڕینێکی ئایندەیی بۆ ئەوەی کە تەواوترە کاردەکات. دۆلۆز بەپێی وتەیەکی زۆر سادە سیستەمی هزری خۆی -چونکە زۆر توخمی داهێنەر لە خۆیەوە دەگرێت- بونیاد دەنێت، کە بریتیە لەوەی فەلسەفەکاری مەزن ئەو کەسەیە کە دەتوانێت خوێنەرەکانی خۆی بە پراکسیس کردنی فەلسەفە بە هەموو ئاڵۆزیەکانی و ڕۆچوونە خوار بەنێو قوڵایی ژیانی فەلسەفی بەو وەسفەی کە ئەوە ژیانێکە زیاتر پەیوەستی سروشتی خۆیانە ڕازی بکات.

بەم جۆرە هەر لە کتێبی (ئەزمونگەرایی و خودێتی)یەوە دەستی بە گەشتێکی زەحمەت و بەردەوام کرد بۆ گەڕان بە دوای میتۆدێکی نوێ کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بیخاتە نێو چەقی ئیشکالیەتە فەلسەفیەکان و جیاکاری ناخاوتن-ی نێوان چەمك و وێنەکەی، نێوان فەلسەفەو کردەی فەلسەفەکاری، نێوان فەلسەفەو مێژوەکەی، بسڕێتەوەو بەلاوە بنێت. جۆن ڕشمان-ی لێکۆڵەرەوە بەم شێوەیە باس لە مەسەلەکە دەکات:

(چۆن لە مێژووی فەلسەفە بچینە دەر؟ چۆن لەو فەلسەفە بونیادنراوە بچینە دەرەوەو نمونەی نوێ دابهێنین؟ ئەم گەڕانە بە دوای وێنەیەکی هزری جیاواز هەمان ئەو گەڕانەیە کە دۆلۆز لەنێو نوسینە جیاجیاکانیداو لە ڕێگای تەولیف کردنێکی زیرەکانەی نێوان کۆمەڵێك مەعریفەی وەکو نوسین و وێنە کێشان و سینەماو سیاسەتدا کردی، ئەگینا دەرچوون لە مێژووی فەلسەفە مانای چیە؟ ئایا ڕەتکردنەوەی فەلسەفەیە یا تێپەڕینە لێی؟ ئایا ڕەتکردنەوە مانای تێپەڕکردنە؟ دەرچوون لە مێژووی فەلسەفە بە پلەی یەکەم مانای ڕزگاربوونە لەو چەمکە هیگڵ-ی و هایدگەر-یەی فەلسەفە، لەبەرئەوەی ئەوان ڕاستەوخۆ دەمانگێڕنەوە بۆ کۆنترین وێناکردنی میتافیزیکی ئاڵۆز و زۆر زەحمەت ئەوەش بە پشت بەستن بە ئەنتۆلۆژیای گریکی کە بە ڕادەی سەرەکی لەبارەی تیۆری وجودە تا دەگاتە قۆناغی نوێی ئایدیالیزمی ڕەها، کە عەقڵ و مێژوو بە پیرۆز ڕادەگرێت.

کەچی ئەوەی زیاتر سەرنجی دۆلۆز کێش دەکات ئەو مەسەلەیە نیە کە پەیوەستە بە چارەنوسی نەسەقە فەلسەفیەکان و گۆڕانی بەردەوامیان -سەرەڕای بایەخی زۆریان- بەڵکو لە چوارچێوەدانی تاکەکەسانەی فەلسەفەکارانە بەو وەسفەی کە لاپەڕەی کراوەن بەسەر نادیارداو ئەو خاکە بەپیتەیە کە تۆی فەلسەفەکاران حەزدەکات تێیدا گەشە بکات. بەم جۆرە فەلسەفە وەکو مێژووی ڕووداوەکانی هزرو کردەکانی نامێنێتەوە، بەڵکو دەبێتە هەمان ڕوداو بە هەردوو ڕەهەندی

تایبەت و گشتی: تایبەت چونکە فەلسەفەکاران هەریەکەو تایبەتمەندی حیاوازی خۆی هەیە کە لە کەسێکی تری جیادەکاتەوە، گشتی لەبەرئەوەی ئەو تایبەتمەندیە تاکەکەسیانە تیۆری و چەمکی لێ بەرهەم دێت کە دەبن بە نەسەقی گشتی.

لەنێو کتێبی (لۆژیکی تا)دا دۆلۆز دەست بە نزیکبوونەوەیەکی نوێ دەکات کە نوێکردنەوەو پێشڤەبردنی میتۆدی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی ناکاتە کارو فرمانی هەرە لەپێشینەی ڕەهای خۆی، بەڵکو بایەخ بە لێکۆڵینەوە لە ماهیەتی پێوەندی بونیادنراوی نێوان مرۆڤی هزرڤان و جیهان یا شتەکان دەدات، نێوان مرۆڤ و جیهانی هزرەکان و چۆنیەتی چنینی پێوەندی نێوان بیرۆکەو شوێن (جوگرافیا)، بەوەش هەموو جیهان دەبێتە بابەتی ئیشکالیەت و عەمباری پرسیاری بەردەوام کە وەڵامی ئامادەکراویان دەست ناکەوێت. لەبەرئەوەی جوگرافیا (بەمانای شوێن) ئەگەرچی وادیارە کە لە سروشتێکی جیاوازە لەگەڵ سروشتی هزر (بە مانای فەلسەفە)، کەچی لای دۆلۆز توخمێکی پاڵپشت و گرنگە بۆ ئەم بیرۆکەیە، چونکە ناشێت هەر وێناکردنێك هەرچەندەی بەرەو ئاسمانیش هەڵفرێت، بەڵام لە کۆتاییدا دەبێت بگەرێتەوە سەر زەوی و بنیشێتەوەو جێگیر بێت تێیدا. ئەم ئەنجامە پاڵی بە دۆلۆز–ەوە نا (مێژووی هاوشێوەیی– مێژووی خودی) ڕەت بکاتەوە بەو وەسفەی کە مێژوێکی تیۆریەو بۆ هەموو جۆرە نامۆبوونێك و تێکەڵاویەك –تا نەڵێین ونبوون– کێشمان دەکات، نامۆبوونێك کە جیاوازی وەکو خاڵێکی دەوڵەمەندی گرنگی

هـزری ڕەت دەکاتەوە تاوەکو پرنسیپی نمونەگەرایی هاوشێوەیی بونیادنراو لەسەر یەك ڕوانینی نەسەقی دابمەزرێنێت. ئەو وێناکردن و مەزەندەیەی ڕەگوڕیشەی تا ئەوپەڕ ڕۆچوەتە نێو مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا، بە شێوەیەك وەکو ئەو نەخۆشیەیەی لێهاتوە کە چارەسەری نیە، لە ئەفلاتون–ەوە تاوەکو هیگڵ مرۆڤایەتی چەندین گێمی دورو درێژی بڕیوە لە سەرقاڵبوون بە گەڕان بەدوای حەقیقەتی ڕەهای ئەبستراکت وەکو باڵاترین جۆری مەعریفە.

لە بەشی دوەمی کتێبی (سەرمایەداری و دابڕان)دا کە لەژێر ناوی (لەدژی–ئۆدیب)ە، دۆلۆز بەردەوام دەبێت لە ڕەخنەی توندوتیژی خۆی بۆ هەموو ئەو شتانەی بەرەو نەسەقگەرایی و ئینفیلاقمان دەبەن، بەڵام ئەمجارەیان لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە، ئەویش گۆشەنیگاو تێڕوانینی دەرونشیکاریە، کە هەرچەندەی ژیانی مرۆڤ بەرەو ئاڵۆزی بڕوات زیاتر پێویستی پێدەبێت. گرنگی (لە دژی– ئۆدیب) لەلای دۆلۆز لەوەدایە کە شێوازێکە بۆ دۆزینەوەی خودو ئەویتر بەیەکەوە، میتۆدێکی ئازا لە ڕەخنەگرتن لە هەندێك لەو ئەنجامە بە پەلانەی کە ڕەوتی (فرۆیدی – مارکسی) لە سایەی ڕابەرەکەیەوە (هربرت مارکۆز) پێی گەیشتوە. ئەوەش بە پشت بەستنێکی زێدەڕۆیانە بە پێدراوەکانی دەرونشیکاری بەتایبەتیش ئەوەی کە پەیوەستە بە ڕۆڵی غەریزەی سێکسی لە گەڵاڵەکردنی چەمکی بزاڤی کۆمەڵایەتی و هەموو ئەو ململانێیەی نێوی کە بەهەر شێوەیەك بێت کار لەم بزاڤە دەکەن. لەگەڵ

ئەوەی (لەدژی-ئۆدیب) یەكپارچە ڕەخنەیە لە سەرجەم ئەو بەرهەمە تیۆریەی قۆناغی شەست و حەفتاكان، بەڵام لە كۆتاییدا ئەوەی لەیاد نەكردوە كە ئەم ڕەخنەیە بەو بونیادەو بەرهەمهێنەرانی و كەسەكانی ببەستێتەوە، وەكو بانگەشەیەك بۆ (كەسایەتی هزر) ئا لێرەوە ڕوبەڕوی سێ گروپ دەبێتەوە:

*1)*سیاسیەكان و خەباتگێرە ساختەچیەكان و تیرۆریستانی تیۆر، بە كورتی هەموو ئەوانەی كاریان تەنیا ئەوەیە پارێزگاری لە سیستەمی گشتی نەسەقی سیاسی بكەن، هەموو بیرۆكراتیەكانی شۆڕش و فەرمانبەرانی حەقیقەت.

*2)*تەكنیكارانی ئارەزومەند لەو شیكارگەرانەی كە گوێ بە هیچ شتێك نادەن تەنیا دامەزراندنی بونیادێكی نوێ نەبێت بۆ بە هەیكەلی كردنی مەسەلەی ئارەزو نەبێت، بە شێوەیەك وای لێبكرێت ببێتە پێداویستیەكی هەمیشەیی.

*3)*فاشیستە نوێیەكان، بگرە هەموو فاشیستەكان، بێگومان ئێمە لێرەدا مەبەستمان فاشیەتی هیتلەر یا مۆسۆلینی نیە، ئەوە مەسەلەیەكی مێژوویی زانراوە، بەڵكو مەبەستمان ئەو فاشیزمەیە كە لەنێو ناخی هەریەكێك لە ئێمەدا هەیە، كە بێئەوەی پێی بزانین كار لە خەیاڵ و هەڵسوكەوتمان دەكات، ئەوەش مانای وایە بۆ ئەوەی ئەم دەرگایەی ڕوبەڕوبوونەوە دابخرێت، دەبێت گۆڕانكاری لە شێوازی تەرتیب كردنی گوتە هزری و كۆمەڵایەتیەكان بكرێت، ئەوەش بە چەسپاندنی جیاوازی و ئازادكردنی بواری كردەی فەلسەفی و پراكسیسی سیاسی، هەروەها دەربازبوون لە كۆیلایەتی داخراو جا نەسەق یا سیستەم یا هەر شتێكی تر بێت.

> **فەلسەفەی دۆلۆز مەلەكردنێكی بەردەوام بوە لەنێو جیهانێكی دڕندەدا كە لۆژیكی نەسەق ڕەت دەكاتەوەو دڵنیابوون لە وەڵامەكانیش بەلاوە دەنێت**

فەلسەفەی دۆلۆز مەلەكردنێكی بەردەوام بوە لەنێو جیهانێكی دڕندەدا كە لۆژیكی نەسەق ڕەت دەكاتەوەو دڵنیابوون لە وەڵامەكانیش بەلاوە دەنێت، جیهانێك كە دەكرێت بۆ ناوی وەكو (كانت، بیكۆن، سپینۆزا، فرۆید، بیرگسۆن، كافكا، پرۆست، نیچە، فۆكۆ) كورت بكرێتەوە.

بەو ڕادەیەی فەلسەفەكەی دۆلۆز برین و ڕەتبوون بوو لە هزری بەشێكیان، بەڵام لە بارەی ئەوان و لەنێو ئەواندا بوو، چوونە نێو قوڵایی جیهانی شاراوەو نادیاری ئەوان بوو، چوونە نێو هزرە كارپێكراوەكانیان، بە لایەنی كەم وەكو ئەوەی خۆی پێی وایە، یەكێك لە سەیرترین ئەم هزرانەشی ئەوەیە كە لە كتێبێكدا دەربارەی نیچە نوسیویەتی، تێیدا لەوە ئاگادارمان دەكاتەوە كە لە كاتی شیكاركردندا ناتوانین لەنێو فەلسەفەكەی نیچەدا لە مەبەستە حەقیقیەكانی تێبگەین، ئەگەر خۆمان لەم بیروباوەڕانە لانەدەین -ئەگەرچی بیروباوەڕی باویشن-:

-بڕواکردن بەوەی فەلسەفەی هێز لای نیچە مانای (ئارەزوکردن لە بالادەستی) یا ئارەزوی موڵکداریێتی کردنی هێزە.

-بڕوامان وابێت کە بە بەختەکان - بەهێزەکان- لەنێو سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا بەرجەستەکاری چەمکی مرۆڤی بەهێزن وەکو ئەوەی ئەو خەیاڵی دەکات.

-بڕوامان وابێت مەبەستی نیچە لە گەڕانەوەی ئەبەدی ئەو چەمکە کۆنەیە کە لای گریکی و هیندی و بابلیەکاندا هەبوە، یا مەبەست نوێبونەوەی سەردەمی زەمەنی نێوان ماوەیەك و ماوەیەکی ترە، یا گەڕانەوەی ئەویتر بێت، یانیش گەڕانەوە بێت بۆ ئەویتر.

-بڕوامان وابێت کە نوسینە دواییەکانی نیچە پڕە لە شێتی.

ئەم نزیکبوونەوە سەیرە ڕەنگە تا ڕادەیەکی زۆر سروشتی ئەو ڕێگرە بونیادیانەمان نیشان بدات کە ڕێگا لەو کەسە دەگرن کە لە هزرو فەلسەفەکەی دۆلۆز دەکۆڵێتەوە، ئەو ئاستەنگانە بوونە ڕێگر لەبەردەم دواکەوتنی بڵاوبوونەوەی هزر و فەلسەفەکەی لەنێو ئەوروپادا، بەڵام چەند ساڵی ڕابردوو دەستکرا بە لێکۆڵینەوە لە هزرە زەئبەقیەکەو بەرهەمە ڕاستەقینەکانی دۆلۆز، بە تایبەتیش دوای ئەم وتە ناودارەی فۆکۆ کە لە سەرەتای ئەم وتارەدا ئاماژەمان بۆ کرد، ئەوەبوو لە بەریتانیاوە بۆ ئەڵمانیاو لە ئیتالیاوە بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو ژاپۆن، دەستکرا بە وەرگێڕانی کتێبەکانی و چەندین لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییش یەك لە دوای یەك لەبارەی ئەم نوسینانەوە سەریان هەڵدا.

## چەند سەرنج و ڕونکردنەوەیەك

*چەمکۆکە، یەکەیەکی بچوکە لەنێو چەمکدا، بە مانای ئەوەی هەر چەمکێك لە کۆمەڵێك چەمکۆکە پێکدێت کە لە کۆتاییدا یەك چەمك پێکدەهێنن.

*هەڵوێستی دۆلۆز لەبارەی ڕەخنەگرتن لە میتافیزیکیای ئامادەگی زۆر لە هەڵوێستی جاك دریدا نزیکە، چونکە لە ئەنجامدا هەردوکیان دژایەتی میتافیزیکیا دەکەن.

*کتێبەکانی دۆلۆز ئەمانەن: (فەلسەفە چیە؟ -بە هاوکاری فیلیکس گوتاری (..)، دەسەلات و مەعریفە (..)، نیچەو فەلسەفە (*1962*)، نیچە (*1965*)، فەلسەفەی ڕەخنەیی لای کانت (*1963*)، سپینۆزاو کێشەی دەربڕین (*1968*)، فۆکۆ (*1986*)، لۆژیکی تا (..)، ئەزمونگەرایی و خودێتی (*1953*)، جیاوازی و دووبارە بوونەوە (*1968*)، لۆژیکی هەست (*1973*)، لە دژی -ئۆدیب- بە هاوکاری فیلیکس گوتاری (*1972*)، وێنەو جوڵە (..)، جگە لە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەو وتاری تر).

*جیل دۆلۆز لە ساڵی (*1925*) لەدایکبوەو مامۆستا بوە لە زانکۆی هەشتەمی پاریس و لە ساڵی (*1996*) خۆی کوشتوە.

## سەرچاوە

مجلة (نزوى) العدد *26*.

# فەلسەفەی خۆرئاوا لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا

• هاشم سالْح

▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## -کەسایەتی و ڕێبازە فەلسەفیەکان-

پڕکێشی کردنی ئەوەی دەتوانم تەواوی ئاقارە فەلسەفیەکانی خۆرئاوا لە یەك وتاردا بخەمەڕوو، لە خۆبایی بوون و بێ‌چاوڕوویییە.. لەبەرئەوەی کارێکی لەوجۆرە پێویستی بە چەندین کتێب و بەشداریکردنی چەندین پسپۆڕو لێکۆڵیار هەیە. بەڵام من لێرەدا تەنها چەند کەسایەتی و ڕێبازێکی فیکری بەرچاو دەخەم کە لە چەند ساڵی ڕابردودا گرنگیان پێدراوەو جێگای باس و خواس بوون.. لە میانەی تەنها کێشەیەکی سەرەکیشەوە بایەخیان پێ دەدەم کە ئەوان پێیەوە سەرقاڵ بوون، ئەویش بریتیە لە کێشەو قەیرانی ئەقڵ لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا.

بێگومان قەیرانی ئەقڵ دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیست نەك تەنها بۆ کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە. ئەقڵی خۆرئاوا تا جەنگی یەکەمی جیهانی ئەقڵێکی باڵادەست و لە خۆی دڵنیابوو، بەڵام لەوە بەدواوە گورزێکی کوشندەی بەرکەوت و لە جێی خۆی ترازا، ئەمەش وایلێکرد خۆیی و دەسکەوتەکانی بخرێنە ژێر پرسیارەوە. تا ئەوکاتەو بە درێژایی سەدەی نۆزدە ئەقڵی خۆرئاوا پێی وابوو بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچێت و سەردەمی جەنگ و برسیەتی و بەربەریەت ڕۆیشت و بڕانەوە، بەڵام لە ناکاو ئەو قاسابخانە ترسناکە قەوما کە ملیۆنەها مرۆڤ لە فەرەنساو ئەڵەمانیاو تەواوی ئەوروپادا بوونە قوربانی. هاوکات ئەو جەنگە بوە مایەی شۆکێکی دەرونی قوڵ بۆ هەموو ئەوانەی لە ژیاندا مابوون، ئیتر ئەوانە هیچ متمانەیەکیان بە ژیان و پێشکەوتن و شارستانیەت نەما.

وەك دەزانرێت بۆ یەكەمین جار لە مێژوودا بۆردومانی فڕۆكە لە ماوەی جەنگی یەكەمی جیهانیدا بەكارهێنرا، هەروەها بۆ یەكەمین جار چەكی كیمیایی تاقیكرایەوە و ماڵوێرانییەكی گەورەی وای لێكەوتەوە ئەستەمە هەروا زوو لە یادەوەریدا بسڕێتەوە.

ئەم مەرگەساتانە خەڵكیان خستە سەر كەڵكەڵەی ئەوەی بپرسن و بڵێن: جاران لەوە تێدەگەیشتین كە بۆچی خەڵكی لەناو خۆیاندا بەشەڕ دەهاتن و یەكتریان دەكوشت، چونكە ئەوكات هێشتا دواكەوتوو بوون و گیرۆدەی دەمارگیری ئاینی بوون و ڕوناكی ئەقڵ بەرچاوی ڕۆشن نەكردبوون، بەڵام ئێستا نازانین بۆچی بە شێوەیەكی درێژتر ئەو كارە دەكەن؟ بە تایبەت دوای ئەوەی ئەوروپا پێشكەوتوو، توانی بە هۆی زانست و تەكنۆلۆژیاوە كۆنترۆڵی سروشت بكات.. لە ڕۆژگار و سەردەمی دەمارگیری ئاینی و دادگاكانی پشكنین هاتینە دەرێ و پێمان وابوو ئیتر بە یەكجارەكی لە دەست قەتڵ و عام و خۆپەرستی و شەڕوشۆڕ قوتار بووین.. "پۆل ڤالێری" شاعیر دوای تەواوبونی جەنگی جیهانی یەكەم و لە ساڵی *1919* بە توڕەییەكەوە تەعبیری لەم هەستە كردوە، ئەوەتا لە جێگایەكدا دەنوسێت و دەڵێت: (شتەكان ڕون و ئاشكران نە بەزەیی تێدایەو نە هاوسۆزی. لەم شەڕەدا هەزارەها گەنجی نوسەر و هونەرمەند تیاچون و وەهمی كلتوری ئەوروپیش نەما. هاوكات بۆشمان دەركەوت كە كلتور دەستەوستانە لە ڕزگاركردنی بچوكترین شت. شكۆمەندی زانستیش لەڕوی ئەخلاقییەوە خراپ تێكشكا، لەبەرئەوەی پراكتیزەكردنە تەكنۆلۆژیەكانی زۆر بە ئاسانی بوە مایەی كوژرانی ملیۆنەها كەس. بۆیە ئێستا زانست لەبری ئەوەی وەكی شەرەف و شكۆمەندی شارستانی ئەوروپی سەیری بكرێت، بۆتە پەڵەیەكی شەرمەزاری بە ناوچەوانیەوە[1]).

ئەستەمە ڕۆشنگەرەكانی ئێمە لە هۆكارەكانی ئەم قەیرانە (مەبەستم قەیرانی ئەقڵ و ئەقڵانیەتە) حاڵی بن، چونكە ئێمە لەبەرئەوەی لە وڵاتانی خۆماندا لە پێناو سەركەوتنی ئەقڵ و دەربازبوون لە كۆت و بەندی ئەقڵی تیۆلۆژی تەقلیدی كاردەكەین، مەزەندەی ئەوە ناكەین دوای سەركەوتنی زانست و ئەقڵ ڕوبەڕوی قەیرانێكی نوێ ببینەوە!.. بەڵكو پێشبینی دەكەین دوای سەركەوتنی ڕۆشنگەری تێكڕای كێشەكانمان بە یەكجار چارەسەر بكرێت، بەڵام بێئاگاین لەوەی كە مێژوو تراژیدیەو ڕەنگە بە یەك جوڵەی سەیرو چاوەڕواننەكراو هەڵگەڕێتەوە و بە ئاڕاستەی پێچەوانە بگەڕێت. هەروەها ئەوەش نازانین كە مرۆڤایەتی لە ناخی خۆیدا ڤایرۆسی خۆكوژی یان وێرانكردنی خۆی هەڵگرتوە.. گەروا نەبێت ئەی چۆن بزانین كە بۆچی مرۆڤی ئەوروپی لە ترۆپكی شكۆمەندی و شارستانیەتدا، ساڵی *1914* و لە ناكاو دوچاری شەڕێكی بێئامان بوو؟

ئەمانەی لای خوارەوە ئەو پرسیارانەیە كە لەو كاتەدا ڕۆشنبیرانی ئەوروپا لە خۆیانیان كرد.. داخۆ ئەقڵانیەت لە بەرەكانی جەنگدا مرد، چون مردنی ملیۆنەها ئەفسەرو سەربازی ئەوروپی؟ یاخود پرۆژەی ڕۆشنگەری لە جەنگی بەناوبانگی

(فردان)دا کە لە نێوان ئەڵمانیاو فەرەنسادا ڕویدا، هەرەسی هێنا؟ یان بۆچی لێرەو لەوێ ئەو نەتەوە خاوەن شارستانیانە لە پێناو پارچە زەویەکدا کەوتنە وێزەی یەکتری؟ ئەی کەواتە سودو قازانجی ئەقڵ و ئەقڵانیەت چیە، گەر ڕێگا لە کاری سەرەڕۆیی و ڕەفتاری بەربەریانە نەگرێت؟ ئایا ئەقڵ دەکەوێتە قەیرانەوە و وەردەگۆڕێت بۆ ڕوە دژەکەی خۆی: واتە بۆ دێوانەیی؟

کاتێك فەیلەسوفەکان ئەم پرسیارانەیان ئاڕاستەی ئەقڵانیەتی خۆرئاوا دەکرد (ئەو ئەقڵانیەتەی بوە مایەی کارەسات و ماڵوێرانی) بە تەنها نەبوون، بەڵکو هونەرمەندانیش لای خۆیانەوە چونەوە بەگژ ئەقڵ و ئەقڵانیەتدا. لەم سەروبەندەدا ساڵی *1916* و لە شاری (زیورخ)، لەسەر دەستی "ماکس ئارنست" و "تریستان تزارا" و "مارسێل شام" و چەند کەسێکی تر، بزوتنەوەی دادائیزم هاتەئارا. ئەم بزوتنەوەیە هەر تەنها بەگژ کۆتوبەندی هونەری ئەکادیمی و کلاسیکیدا نەچووەوە، بەڵکو هاوکات لە دژی درۆزنە بەهاکانی شارستانیەتی خۆرئاواش ڕاپەڕی.. چونکە ئەم شارستانیەتە سەرەڕای شکۆبەخشینی زۆری بە ڕۆشنگەری، کەچی ڕێگاشی بەوە دا کە جگەرکۆشەکانی خۆی ڕەوانەی شەڕگەو قەسابخانەکان بکات. ئەم فانتازیا وێرانکەرەی دادائیزم کاریگەری لەسەر ئەدەب و بە شێوەیەکی گشتیش لەسەر هونەر بەجێهێشت و بزوتنەوەیەکی گەورەترو گرنگتری لێکەوتەوە کە ئەویش بزوتنەوەی سوریالیزم بوو. سوریالیزم گرنگی بەو هێزە شاردراوەو شەڕانگێزانە دەدا کە کۆنترۆڵی ناخودئاگایان دەکرد. لەو کاتەداشدا "سیگمۆند فرۆید" دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمە ڕەشبینەکانی سەبارەت بە ئایندەی شارستانیەتی خۆرئاوا. هەروەها باسیشی لە (تاناتۆس) دەکردو پێی وابوو ئەم غەریزەیە لە ناخی مرۆڤدا هەیە (ئیتر تاکەکەسی بێت یان گروپ) و هانمان دەدات بۆ ئەوەی حەز لە خۆکوشتن و وێرانکردنی خۆمان بکەینەوە. "فرۆید" لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا هەردوو کتێبە سەرەکیەکەی خۆی (ئایندەی وەهم- *1927*) و (نیگەرانی ژیار- *1930*)[2]ی بڵاوکردەوە.

بەڵام سەرەڕای وەحشیگەرێتی جەنگی یەکەمی جیهانی و تراژیدیاکانی هەندێك فەیلەسوف هەر دەستبەرداری پرۆژەی ڕۆشنگەری نەبوون، بە تایبەتی (فەلسەفەی کانتیزم) کە ترۆپکی ڕۆشنگەری بوو.. دەتوانین قوتابخانەی "ماربۆرگ" کە "ئەرنست کاسیرەر" ڕێبەرایەتی دەکرد بە نمونەی ئەوە بهێنینەوە. "کاسیرەر" ناچار بوو لەگەڵ "مارتن هایدگەر"دا کە دژ بە فەلسەفەی ئەقڵانیەت بوو ڕوبەڕوو بێتەوە، ئەم ڕوبەڕو بوونەوە فەلسەفیەشیان لە شاری دافۆسی سویسرا بەڕێوەچوو، جەماوەرێکی زۆریش لە فەیلەسوف و ڕۆشنبیران ئامادەی بوون. ئەم سیمینارە گەورەیەی نێوان "کاسیرەر" و "هایدگەر" لە *17* مارتەوە بۆ *6* نیسانی *1929* بەردەوام بوو[3].

"هایدگەر" لەوێدا کەوتە پەلاماردانی کەلەپوری ڕۆشنگەری کە قوتابخانەی نیوکانتیزم

و لــــە ریـــــزی پێشەوەشــــیاندا "کاســـــیرەر" نوێنەرایــەتیان دەکـــردو راســـت و رەوان وتـــی: پێویسـتە هـەموو ئەوانـە تێکوپێك بدەیـن کـە تـا ئەمڕۆ بنـەماکانی میتافیزیکـای خۆرئاوایـان پێك هێنـــاوە: واتـــە (ڕۆح و لۆژیـــك و ئـــەقڵ)!.. لـــە بەرامبـەردا "کاسیرەر" زۆر خاکیانـە کەوتـە قسـەو ئەوەی بـەلاوە پەسـەندتر بـوو کـە بـە شـێوەیەکی رەخنەگرانــە چــاو بــە فەلسـەفەی (کـــانتیزم)دا بخشـێنرێتەوە، ئەویش بە مەبەستی رزگـارکردنی ئـەقڵ و درێــژەدان بــە دیـالۆگ و گفتوگـۆ. بـەلاّم "مـارتن هایدگـەر" بـە رق و توندیەکـەوە کەوتـە وەلاّمدانــەوەو وتـــی: (تەنـــها چارەســـەر ئەوەیـــە دەســـتبەرداری ئـــەو ترادســـیۆنە ئەقلاّنیــە بــین کــە لــە ســەدەی هــەژدەوە -واتــە لــە ساتەوەختی کانتــــــــەوە- بالاّدەســــــــتە بەسـەرمانەوە). ئەوانـەی ئامـادەی دیدارەکــە بــوون پێیــان وابـــوو "هایدگـەر" بـراوە بـوەو ئیـتر لـەو کاتەشــەوە بــوە قارەمــانی نوێــی فەلسەفەی ئەڵەمانی.

بـــەمجۆرەو لــــە کایـــەی فەلسـەفیدا ئاقـاری نـا -ئـەقلاّنی بەسـەر ئاقـاری ئـەقلاّنیدا سـەرکەوت.. ئەمـەش لـە واقیعـداو بـە شێوەیەکی عەمەلی لە رێی هاتنە سەر کاری نازیزم و فاشـیزم و سـەرلەنوێ وێرانبونـی ئـەوروپا لـە مـاوەی دوەم جـەنگی جیـهانیدا بەرجەسـتە بـوو. لـەپای ئەمـەدا جـەنگێکی نوێ لـە دژی ئەقلاّنیـەتی خۆرئـاوا بـــەرپا بـــوو، بـــەلاّم ئـــەمجارەیان بـــە سـەرکردایەتی قوتابخانـەی فرانکفـۆرت بـوو. ئـەم قوتابخانەیـــە دەســـتی کـــرد بـــە گـــەورەترین دادگـــایکردنی ئـــەقڵی خۆرئـــاواو هـــەموو ئـــەو تاوانانەی بۆ دوەم جار لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ئەنجامدران. سەردەستەی ئەم قوتابخانە فەلسەفیە تازەیەش "هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ" بوون. ئەم دوو بیریارە لە ماوەی دوەم جەنگی جیهانی و لە ترسی جەورو ستەمی نازیـەکان، ناچـار بـوون ئەڵـەمانیا جێبهێڵن و روبکەنە ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

سـاڵی *1947* کتێبێکـی گرنگیـان بـە نـاوی (دیالــەکتیکی رۆشـــنگەری) یـــان (دیالـــەکتیکی ئەقڵ)[4] بلاّوکردەوە. ئەوان لەو کتێبەدا مەبەستیان لـە رۆشنگەری تەنها ئـەو بزاوتـە نەبوو کە لـە سـەدەی هەژدەهـەمدا سـەری هـەڵداو بریتـی بـوو لـە هێرشێکی گەورەی ئـەقڵ بۆ سـەر ترادسـیۆنی تـەقلیدی مەسـیحی، بەڵکو مەبەستیان بـە شـێوەیەکی گشتی ئەو بزاوتە بوو کە هـەر لە سەردەمی یۆنانی کۆنـەوە هـاتبوە ئاراو بووبوە مایـەی ئـەوەی ئـەقڵ کۆنـــتڕۆڵی ســـەرجەم ژیـــانی کۆمەلاّیـەتی و کلتـوری خۆرئـاوا بکـات. بـەمجۆرە قوتابخانـــەی فرانکفـــۆرت دەســـتی کـــرد بـــە تاوتوێکردنی مێژووی ئەقڵ، هەر لە "ئەفلاتون"ەوە تا جەنگی دوەمی جیهانی!

> قوتابخانەی فرانکفۆرت دەستی کرد بە تاوتوێکردنی مێژووی ئەقڵ، هەر لە "ئەفلاتون"ەوە تا جەنگی دوەمی جیهانی!

"هۆرکهایمـــەر" و "ئـــادۆرنۆ" دەیانپرســـی: بۆچی شارستانیەتی ئەوروپی بای دایەوە بـەلای بەربەریەتدا، لە کاتێکدا کە بە ئەوجی پێشکەوتنی

مـــادی گەیشـــتبوو؟ بۆچـــی لـــە شـــەڕێكی وا خوێناوییەوە گلا، لـە كاتێكدا هـەموو ئـەو ئامرازو توانسـتانەی لەبەردەسـتدا بـوو بـۆ بەدیـهێنانی كامـــەرانی و خۆشـــگوزەرانی؟ چـــۆن چۆنـــی پێشكەوتن هەڵگەڕایەوە و بوو بە دواكەوتن و ئەقڵ هەڵگەڕایەوە بۆ پێچەوانەكەی خۆی؟ وەڵامیشیان بۆ ئەم پرسیارە ئەوە بوو كە: ئەقڵ و دژەكەی (واتە ئەفسانە) وەكی ئێمە پێمان وایە بەو ڕادەیە لێك جیا نین، بەڵكو گرێدراوی یەكن. ئەویش لە میانەی ئەو پەیوەندیە دیالەكتیكیەی بە درێژایی مێـژوو بەردەوامە.

ڕاســتە ئـەقڵ ئەوكاتــە لــەدایكبوو كــە لــە میتۆلۆژیـا قوتـاری بـوو، بـەڵام دواتـر ناچـار بـوو وەرگۆڕێ و خۆشی ببێتە ئەفسانەیەك، بۆ ئـەوەی بە شێوەیەكی باش دژایەتی ئەفسانە بكات. بەڵام چۆن چۆنی ئەقڵ خۆیشی بوو بە ئەفسانە؟

دەرهـــەق بـــەم پرســـیارە هەریـــەك لـــە "هۆركهایمـــــەر" و "ئـــــادۆرنۆ" بـــــەمجۆرە وەڵامدەدەنـــەوەو دەڵێـــن: ئەفســـانە ئەقڵانیـــەكان ئاڵۆزی و نادیاریەكی ترسناك و تۆقێنەریان هەیە، یەكێك لەوانە ئەو باوەڕە تازەیەیە بەهێزو توانای بێسنوری زانست و تەكنۆلۆژیاو هەروەها بڕوابوون بە خەسڵەتی ناكۆتـایی و ڕەهـای پێشـكەوتن كـە بەرهـــەمی دەســـتی زانســـت و تەكنۆلۆژیایەیـــە.. ئەفسانەی مۆدێرنەش كتومت ئـا لێرەدایـە و وەك بینیشمان ئەفسانەیەكە بە ئەقڵ پەردەپۆش كراوە. ئـەم قەناعەتـە خۆراواییـە هاوشـانی ئـەو هـەوڵ و تەقەللایانەیە كە مرۆڤ لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسـەوە بـە خـــەرجیان دەدا بـــۆ ئـــەوەی دەســـت بەســـەر سروشتدا بگرێت و ببێتە ئاغای سروشت، وەكی ئەوەی "دیكارت"ی ڕابـەری ئەقڵانیـەتی خۆرئـاوا باسی لێدەكرد.

بەڵام ئەم سەركەوتنەی مۆدێرنـەی ئـەورووپی بەدەسـتی هێنـا، لـە بەرامبـەردا بـاجێكی گـەورەو گرانی بە مرۆڤ دا: ئەویش تێئاوەر بوون بوو، بە واتای تێئاوارەبوونی مرۆڤی لە دنیای پیشەسازی و تـــەكنۆلۆژیادا.. بـــۆ نمونـــە زانســـتی بابـــەتی ساردوسڕ هەر بە تەنها بەسەر ئەو پەیوەندیانەدا پراكتیـزە ناكرێت كە لە نێوان مرۆڤ و سروشـت یاخود مرۆڤ و جیهاندا هەیە، بەڵكو هاوكات ئەو پەیوەندیانـەش دەگرێتـەوە كـە لـە نێـوان خـودی مرۆڤەكانیشـدا هەیـە. هـەژمونی تـەكنۆلۆژیا لـە دەوڵەتی مۆدێرندا بەرجەستە دەبێت و بەشتبوونی كەینونـەی كۆمەڵایـەتی لێدەكەوێتـەوە. هـەروەها ژیانی ڕۆژانەش لە لایەن ئیدارەیەكی تۆلیتاریەوە (كە نە سیمای دیـارەو نـە نـاوی هەیـە) كۆنتـرۆڵ دەكرێت، واتە هـەموو شـتێك لـە پشـتی پـەردەوە یاخود لە ڕێی دەستنان بە دوگمەیەكدا دەخرێتە گەڕ، ئەمە فۆرمی تازەی سستمی سەرمایەداری و تەكنۆلۆژی پێشكەوتوە.



هۆركهایمەر

"هۆرکهایمەر" و "ئادۆرنۆ" پێیان وایە جیاوازی نێوان دیموکراسی ئەمریکی و فاشیزمی "هیتلەر" لە رووی چەندایەتیەوەیە نەك چۆنایەتی، چونکە لە سستمی سەرمایەداریدا یەك مەبەست و ئامانج هەیە، ئەویش تێکشکاندنی فیکر و کۆنترۆڵکردنی ئینسانە بۆ ئەوەی وەکی مێگەل مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. بۆیە بە بڕوای ئەوان ئەوەی بەرپرسیارە لە بەلارێدا بردنی جیهانی خۆرئاوا لە سەدەی بیستەمدا "پۆزەتیڤزم"ە، واتە هەژمونی زانستی بابەتی ساردوسڕ بەسەر مرۆڤ و شتەکانەوە لەو لادانە بەرپرسیارە. چونکە زانستی تەکنۆلۆژی بێ دڵ و بێ گیانەو مەبەستیشی تەنها قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایەیە. ئەم ڕەخنەگرتنە لە ئەقلانیەتی خۆرئاوا تەواوی مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا دەگرێتەوە هەر لە (دیکارتەوە تا دەگاتە کانت و هیگڵ و برتراند راسل و.. هتد)، بەرپرسیاری یەکەمیش لە فۆرمەلە بوونی ئەم ئەقڵە تەکنۆلۆژی و زانستیە ساردوسڕە "دیکارت"[5]ە.

بەلام ئایا ئەمە مانای وایە کە دەبێت دەستبەرداری ئەقڵ و ئەقلانیەت بین؟ ئەڵبەتە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەنەخێر وەلام دەدەنەوەو پێیان وایە سەرەڕای هەموو ئەوانەی کە رویدا پێویستە ئەقڵ لەچنگی پۆزەتڤیزمی سەرمایەداری قوتاربکەین، لەبەرئەوەی ئەمە فۆرمێکی شێواوو گەندەڵی ئەقڵی ئەوروپیە. لەبەر ئەمەشە قوتابخانەی فرانکفۆرت داوای ئەوە دەکات کە ڕەگەزە مەعریفیە پاك و بێگەردەکانی ئەقڵ لەپاشماوەو ڕەگەزە ئەفسانیەکان جیابکرێتەوە.

بە کورتیەکەی ئەقڵی خۆرئاوا پێویستی بە هەڵسەنگاندن و ڕەخنەلێگرتن هەیە، لە پێناو تازەکردنەوەی یاخود ڕاستکردنەوەی ئەو لادان و بەلارێداچونەی بوە مایەی کارەسات و تراژیدیای هەردوو جەنگی جیهانی لێکەوتەوە.

هەموو ئەوەی باسم لێکردو بەرلەوەی بچمە سەر بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم وتارەم، هەوڵدەدەم لێرەدا لە چەند ڕستەیەکدا کورتی بکەمەوە. بەر لە ساڵی *1920* یان بڵێین بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی کەس بە بیریدا نەدەهات ڕەخنە لە ئەقڵی خۆرئاوا بگیرێت. لەبەرئەوەی ئەم ئەقڵە سیفەتی ئەوەی بەخۆی بەخشی بوو کە هەرگیز هەڵەناکات، بە تایبەت دوای ئەو هەموو سەرکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژیە سەرسوڕهێنەرەی بەدەستی هێنا.

ئەقڵی ڕۆشنگەری لە رووی گرنگی و مەشروعیەتەوە جێگای ئاینی مەسیحی گرتەوە، یان با بڵێین ئەقڵی زانستی نوێ شوێنی ئەقڵی تیۆلۆژی کۆنی گرتەوەو بەڵێنی ئەوەی دا بە ئینسانی ئەوروپی کە هیواو ئومێدەکانی لە پێشکەوتن و کامەرانی و خۆشگوزەرانی مادی لەسەر ئەم زەویە بۆ بەدی بهێنێت. بێگومان لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا زۆر لەم شتانەی بۆ فەراهەم کرد، هەر بۆیە مرۆڤی ئەوروپی بڕواو متمانەی پێهێناو لە بەرامبەریشدا دەستبەرداری ئەقڵی ئاینی مەسیحی بوو کە بە درێژایی چەندین سەدە دەسەلاتی بەسەریدا هەبوو.. کەواتە ڕەخنەگرتن لە ئەقڵ یاخود گومانکردن و پرسیارکردن لە ئەقڵ

یەکێکە لەو خەسڵەتانەی تایبەتە بە سەدەی بیستەم.

ئەگەر تراژیدیای هەر دوو جەنگی جیهانی و جەنگە کۆلۆنیالیە قێزەونەکان و هێرۆشیماو .. و.. و نەبوایە، ئەوا کەس نەیدەوێرا ڕەخنە ئاراستەی ئەقڵ بکات. هەر کەسێکیش ئەوەی بکردایە بە شێت و سەرگەردانیان دەدایە قەڵەم. بۆیە پێویستە قەیرانی ئەقڵ و ئەقڵانیەتی خۆرئاوا لەم چوارچێوە گشتی و فراوانەدا سەیربکەین.

لێرە بەدواوە دێمە سەر سێیەم قۆناغی ڕەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا کە بە بڕوای من گرنگترین و ترسناکترین قۆناغە. کەسایەتیە فەلسەفیە دیارو ناسراوەکانی ئەم قۆناغە بریتین لە "فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز" لە لایەک و "هابرماس" و گروپەکەی لەلایەکی ترەوە. بێگومان ئەم کێشەی نێوان لایەنگرانی "فۆکۆ" و لایەنگرانی "هابرماس" تا ئێستاش لە ڕێی فەیلەسوفە گەنجەکانەوە بەردەوامە، بە تایبەتی "لۆك ڤێری" کە تازە لە فەرەنسادا ئەستێرەی بەختی لە درەوشانەوەدایەو خەریکە ناودەردەکات.

"میشیل فۆکۆ" گەورەترین هەوڵی خستەگەڕ بۆ ڕەخنە گرتن لە ئەقڵی خۆرئاواو ئاشکراکردنی پەیوەندیەکانی نێوان مەعریفەو دەسەڵات.. "فۆکۆ" سەلماندی ئەم ئەقڵە بەو ئەندازەیە پاك و بێگەرد نیە کە خۆیمان پێ نیشان دەدات و سەرلەبەریشی مەعریفە نیە وەك باسی دەکات، بەڵکو دەستی لەگەڵ مومارەسەکردنی هێزو هەیمەنەو چەوساندنەوەو خۆسەپاندندا تێکەڵکردوە و شان بە شانی ئەوان دەڕوات. واتە ئەقڵی مۆدێرن لە ساتەوەختێکدا لە ئەقڵێکی ڕۆشنگەرەوە کە سەرقاڵی پەیبردن بە نهێنیەکان بوە، هەڵگەڕاوەتەوەو بۆتە ئەقڵێکی دیسپۆتیزمی و تەماحی ئەوەی هەیە تەواوی ئاستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە قالبدات و کۆنترۆڵیان بکات.

> "میشیل فۆکۆ" گەورەترین هەوڵی خستەگەڕ بۆ ڕەخنە گرتن لە ئەقڵی خۆرئاواو ئاشکراکردنی پەیوەندیەکانی نێوان مەعریفەو دەسەڵات..

لێرەدا "میشێل فۆکۆ" لەگەڵ قوتابخانەی فرانکفۆرتدا (ئەمان بەر لە فۆکۆ کەوتنە ڕەخنەکردنی لادان و هەلپەرستیەکانی ئەقڵی خۆرئاوا) یەکدەگرێتەوە.. دواتر "فۆکۆ" لە جێگەیەکدا باس لەوە دەکات کە گەر بهاتبایە و پێشتر ئاگاداری تیۆریاکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بوایە، ئەوا پێویستی بەوە نەدەبوو هەموو ئەو شتانە بنوسێت کە نوسیونی. "فۆکۆ" لە یەك کاتدا بەداخەو بەداخیش نیە لەوەی درەنگ وەختێ بە تیۆریاکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئاشنابوە، لەبەرئەوەی بێئاگایی لەو تیۆریا ڕەخنەییانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت وای لێکردوە بە شێوازی تایبەتی خۆی بگاتە هەمان سەرەنجام، ئەمەش بۆ خۆی شتێکی ئیجابیە و فەرامۆش ناکرێت. بەڵام بابزانین ئەو شتە چیە کە "فۆکۆ" لە تیۆریا

ڕەخنەییەکەی قوتابخانەی فرانکفۆرت سودی لێبینیوە؟ ئەوەی "فۆکۆ" سودی لێبینیوە، ئەم بیرۆکە سەرەکییەی لای خوارەوەیە:

ئاشکراکردنی ئەو کاریگەریانەی دەسەڵات کە پەیوەندیدارن بە پراکتیزەکردنی ئەقڵانیەتێك کە لە سەدەی شازدە بەدواوە خەملی. ئێمە پێمان وابوو ئەقڵ تەواو پاك و بێگەردەو پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە نیە، کەچی بۆمان دەرکەوت کە ئەویش لای خۆیەوە دەسەڵات بەرهەم دێنێت و هەندێ جاریش دەسەڵاتی دیسپۆتیزمی دروست دەکات. فەیلەسوفی گەورەی فەرەنسا پێی وایە کە چارەنوسی ئابوری و کۆمەڵایەتی و مێژووی و کلتوری و زانستی گەلانی خۆرئاوا، بە شێوەیەکی توند پەیوەست بوون بە فۆرمەلەبوونی ئەم شێوەیە لە شێوەکانی ئەقڵانیەت.

"فۆکۆ" لەم بارەیەوە بە ئاشکرا دەنوسێت و دەڵێت: (چۆن دەتوانین ئەم ئەقڵانیەتە لە میکانیزم و ئاراستەو تەکنیك و کاریگەریەکانی دەسەڵات جیابکەینەوە؟ مەبەستم ئەو دەسەڵاتەیە کە هاوشانی ئەقڵی خۆرئاوا بوەو زۆر بە زەحمەت نەبێت ناتوانین بچینە ژێر باریەوە، چونکە پێکهاتەیەکی ستەمگەری ئەوتۆ پێکدێنێ کە وابەستەی کۆمەڵگا خۆرئاواییە سەرمایەداریەکان و ڕەنگە خۆرهەڵاتیە سۆشیالیستیەکانیش بێت.

لێرەوە دەتوانین بگەینە ئەوەی کە بەڵێن و پەیمانەکانی ڕۆشنگەری بۆ گەیشتن بە ئازادی لە ڕێگای کارپێکردنی ئەقڵەوە پێچەوانە کەوتەوە. واتە بەکاربردنی ئەقڵ لە خۆرئاوادا وەکی ڕابردوو مژدە و بەڵێنی ئازادی پێ نیە. ئەمەش ئەو کێشە سەرەکیەیە کە ئەمڕۆ ڕوبەڕومان دەبێتەوەو هەمووشمان لە ئاستیدا دەستەوستانین. لەم ڕووەوە دەمەوێت بڵێم ئەو کێشانەی هەنوکە ڕوبەڕویان دەبینەوە، پێشتر و لەلایەن قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە بە شێوەیەکی جوان و سەرسوڕهێنەر خراوەتەڕوو)[6]. دواجار "فۆکۆ" دەگاتە ئەوەی بڵێت ئەقڵ لەیەك کاتدا ستەمکاری و ڕۆشنگەریشە، ئەقڵی ڕۆشنگەری وەك چۆن ئازادیەکانی خوڵقاند ئاوەهاش کۆت و زنجیریشی دروستکرد.

دواتر دەبینین چۆن چۆنی "یۆرگن هابرماس" و خوێندکارە فەرەنسیەکانی وەك "لۆك ڤێری"، لەسەر ئەم مەسەلەیە هێرش دەکەنە سەر "فۆکۆ" و بە نائەقڵانی و ئاشوبگەرایی تاوانباری دەکەن و تەنانەت ئەم کارەی بە هەوڵێك بۆ تێکوپێکدانی مۆدێرنەو دەستکەوتەکانی حساب دەکەن. بەڵام "فۆکۆ" ڕێ بەم ڕەخنانە دەگرێت و ئامادەباشی تەواو وەردەگرێت، ئەوەتا دەڵێت: (ئایا دەبێت ئەقڵ دادگایی بکەین؟ بە ڕای من ئەمە شتێکی کرچ و بێمانایە. یەکەم/ لەبەرئەوەی مەسەلەکە تەنها مەسەلەی ئیدانەکردن و بێگوناهی نیشاندانی ئەقڵ نیە، مێژوو مێژوەو ئەوەی ڕویداوە تیایدا دەبێت هەوڵی تێگەیشتنی بدەین نەك بڕیاری بەسەردا بدەین.. دوەم/ شتێکی بێمانایە کە ئەقڵ وەکی جەمسەرێکی دژ بە نائەقڵ سەیر بکەین. سێیەم/ کارێکی لەم جۆرە ناچارمان دەکات بەوەی ڕۆڵێکی هەڕەمەکی و بێتاقەتکەر ببینین کە بریتیە لە جیاکردنەوەی خەڵك بۆ دوو دەستە، دەستەیەکیان لەگەڵ ئەقڵانیەت و

دەستەیەكیشیان دژ بە ئەقڵانیەت. من پێموایە ئەوەی گرنگە ئەوەیە دەست بكەین بە شرۆڤەكردنی ئەم جۆرە لە ئەقڵانیەت كە تەنها تایبەتە بە كلتوری تازەی ئێمەو پێشتر لە ئارەدا نەبوە، مەبەستم لەو ئەقڵانیەتەیە كە لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا هاتە ئارا.. ئەمەش ئەو كارەیە كە هەندێك لە ئەندامانی قوتابخانەی فرانكفۆرت پێی هەستان، بەڵام مەبەستی من تاوتوێكردنی بەرهەمە گرنگ و بەهادارەكانی ئەوان نیە، بەڵكو دەمەوێت جۆرێك لە ڕاڤەكردنی جیاواز پێشكەش بكەم سەبارەت بەو پەیوەندیانەی لە نێوان ئەقڵانیەت و دەسەڵاتدا هەیە)[7].

لە شوێنێكی تردا "فۆكۆ" بەرپەرچی ڕەخنەكانی "هابرماس" دەداتەوەو دەڵێت: (هابرماس ئەمەكدار نیە بەرامبەر بە قوتابخانەی فرانكفۆرت، ئەگەرچی دواین نوێنەری ڕەسمی ئەوانیشە. بۆیە دەتوانین بڵێین هابرماس لە ئاراستەی فیكری ئەوان لایداوە و بۆچونەكانی لەگەڵ ئەواندا ناتەبایە. ئەو دەیەوێت ڕوگیرم كات و ناچارم كات بەوەی كە دەبێت یان ئەقڵانیەت هەڵبژێرم یان ئەوەتا تاوانبارم دەكات بە نائەقڵانیەت! واتە مەبەستی ئەوەیە ڕێگیرم لێبكات كە هیچ ڕەخنەیەك ئاراستەی ئەقڵ یان هیچ پرسیارێكی ڕەخنەگرانە لە مێژووی ئەقڵانیەت بكەم، ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێین مەحاڵە بتوانین بە شێوەیەكی ئەقڵانی ڕەخنە لە ئەقڵانیەت بگرین!).

با ئێستا بزانین هەڵوێستی "هابرماس" چیە؟



زۆر بە كورتی دەڵێم ئەو هاوڕایە لەگەڵ ئەو بۆچونەی "فۆكۆ"دا كە باس لە داڕمانی دیدگای كلاسیكی بۆ ئەقڵی خۆرئاوا دەكات، چونكە هیچ كەسێك بڕوای بە بونی ئەقڵێكی مەزن نەماوە كە هەڵە نەكات و لەسەرو هەموو ڕەخنە گرتنێكەوە بێت، بۆ نمونە وەكی ئەوەی "هیگڵ" یاخود "كانت" پێیان وابوو.. نەخێر دوای هەموو ئەوە ماجەرایەی كە ڕویدا ئەفسانەی ئەقڵی ڕۆشنگەری تێكشكاو كاڵبوەوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانەش هێشتا "هابرماس" پێی وایە كە دەكرێت ئایدیای ئەقڵ و ئەقڵانیەت ڕزگار بكەین.. بەڵام ئەمە چۆن چۆنی دەكرێت؟

ئەو پێی وایە كارێكی وا لە ڕێی خستنەڕووی تێڕوانینێكی خاكیانە بەڵام چالاك و كارا بۆ ئەقڵ دەكرێت، چونكە بە بۆچونی "هابرماس" ئەقڵ شتێكی جەوهەرگەرا نیە كە لە ناو شتەكان و لەناو جیهاندا ئامادەیی هەبێت، بەڵكو بۆتە سیفەتێك كە گوزارشتی لە كەسەكان و ئەو وتەزایانە پێ دەكات كە خواستی توانایەكی دیاریكراویان هەیە جا ئیتر ئەو توانایە تایبەت بێت بە حەقیقەت یان ڕێكی و ڕاستی یان ڕاستگۆیی. بۆ نمونە دەڵێین ڕەفتار و هەڵسوكەوتی ئەو كەسە ئەقڵانیە یان دەڵێین ناوەڕۆكی ئەم كتێبە ئەقڵانیە یاخود نائەقڵانیە. كەواتە ئەقڵ گۆڕاوە بۆ ئەقڵانیەت، واتە بۆتە سیفەیەك و بەو كەسانەوە دەلكێت كە ئەو خەسڵەتەیان تێدایە.. بەمجۆرە ئەقڵ لە كەشكەڵانی

فەلـەك و میسـاليەتە یۆتۆبیەکـەی خۆی هێنرایـە خـواریٚ، بـۆ ئـەوەی تەنها ببێتـە پرۆسـەیەکی ئیجرائـی کـە ئامـانجی گەیشـتن بێـت بـە مەبەستێکی تایبەت و دیاریکراو لـە کایەیـەك لـە کایـەکاندا[8]. واتـە "هابرمـاس" ئـەقلٚ دێنێتـە نـاو کۆمەڵگـە یـاخود دەیخاتـە نـاو چوارچێوەی ئەو پرۆسەی کۆمنیکا شـێونخوازیەی لـە هـەموو کۆمەڵگاکاندا هەیە. هەر لەبەر ئەمەشە کە باس لـە پرۆسـەی ئـاڵۆگۆڕکردن یـان ئەقڵیـەتی کۆمنیکـا شێونخوازی دەکات.



دێریدا

لەسەر هەموو ئاستەکانی کۆمەڵ پەیوەندی و دیالۆگ لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا هەیەو لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانن بگەنە ڕێکەوتن و دۆزینەوەی خـاڵی هاوبـەش کـە پێکـەوە کۆیـان دەکاتـەوە و گیروگرفتەکانیان بۆ چارەسەر دەکـات، بـۆ نمونـە بڕوانە (دانوستاندنی نێوان کرێکارو خاوەن کار لە کۆمەڵگـە سـەرمایەداریە پێشـکەوتوەکاندا، یـان دانوستانی نێوان مامۆستا و خوێندکار و تەنانـەت لـە نێـوان بـاوك و کـوڕ یـاخود لـە نێـوان کڕیـارو فرۆشیارو.. هتد). "هابرماس" پێی وایە لە زمـانی دیالۆگ و دانوستاندا بڕێك ئەقلانیـەتی شـاردراوە هەیـە، هـەر ئەمەشـە دەبێتـە مایـەی لێـك نزیـك خستنەوەی هەڵوێستەکان و دۆزینەوەی ڕێگاچارە بـۆ کێشـەو ناکۆکیـەکان.. بـەڵام نـەیارەکانی "هابرماس" وەك "دولـۆز و دێریداو جان فرانسوا لیوتارد" گومان لەم هیومانیزمە گەشبینە دەکـەن کە لـە تیۆریا فەلسـەفیەکەی ئـەودا هەیـە. ئەوانـە دەپرسـن: ئایـا بـە ڕاست ئینسانەکان دەیانەوێت لەناو خۆیـاندا ڕێـك بکـەون و کـۆك و تەبابن؟

"دێریدا" ئەم ئاڕاستە کارکردنـەی "هابرمـاس" بـە جۆرێـك لـە بـەخوداکردنی زانسـت یـاخود گەڕانـەوە بـۆ میتافیزیکـای زانسـت دەداتە قەڵەم.. ئەم گەڕانەوەیەش بە ناچـاری لـەژێر کاریگـەری پۆزەتڤیزمدایـە، ئـەو پۆزەتڤیزمەی پێویستە خۆمانی لیٚ بەدوور بگرین.

"هابرماس" لە وەڵامی ئەوانەدا دەڵێت: (من زیـاتر گرنگـی بـە کۆدەنگـی دەدەم، نـەك بـەو جیاوازیـەی ئـەوان باسـی دەکـەن). هـەروەها ئـەو دەیـەوێت لـەوان زیـاتر متمانـە بـە سروشـتی مرۆڤایـەتی و ئـەقڵی ڕۆشـنگەری بکـات. تەنانـەت "هابرمـاس" فەیلەسـوفانی فەرەنسـایی وەك "میشـێل فۆکـۆ و جـاك دێریـداو جـان فرانسـوا لیوتـارد و جیلٚ دیلـۆز" بەوە تاوانبـار دەکـات کـە ئەوانـە ئانارشـیزمن و دەیانـەوێت مۆدێرنـە لەناوبەرن و دەستبەجیٚ داخلٚ بە قۆناغی پۆست-مۆدێرنە بىن، بەڵام ئەو بۆ خۆی دەیەوێت داکۆکی لـە پـرۆژەی مۆدێرنـە یـاخود پـرۆژەی ڕۆشـنگەری بکـات، پـاش دەسـتپێداهێنانی و چاکردنـەوەی کـەموکوڕی و لادانـەکانی. بـە کورتیەکـەی "هابرمـاس" ئـەو فەیلەسـوفە فەرەنسـایانەی لـە سەرەوە ناومان هێنان بەوە تاوانبار دەکات کە لە شوێنکەوتوانی "فردریك نیچە"ن و نائەقلانین، لە

بەرامبەردا خۆی لایەنگری "ئەمانوێل کانت"ە و ئەقڵانیە.

"کانت" ئەو فەیلەسوفەیە کە بۆ یەکەمین جارو لە ڕێی بڵاوکردنەوەی کتێبە سەرەکیەکانیەوە، بنەماکانی پرۆژەی مۆدێرنەی دارشت و لەم ڕووەوە دەکرێت تێکستە بەناوبانگەکەی (ڕۆشنگەری چیە؟) بە یەکەمین گوتاری فەلسەفەی مۆدێرنە بدرێتە قەڵەم بەر لە "هیگڵ"[9]. بەمجۆرە کێشەیەك لە نێوان فەیلەسوفە ئەڵەمانیەکان و فەیلەسوفە فەرەنسیەکاندا دروست بوو لەسەر مەسەلەیەکی جەوهەری، ئەویش هەڵسەنگاندنی ئەزمونی مۆدێرنەی ئەوروپیە لە سەردەمی ڕۆشنگەریەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، بۆ ئەوەی بزانن سەرەنجامی پرۆژەی مۆدێرنە سلبی بوە یان ئیجابی؟ "هابرماس" لای خۆیەوە پێی وایە بە گشتی سەرەنجامی پرۆژەی مۆدێرنە (سەرەڕای هەمو ئەو کارەسات و تراژیدیانەشی ڕویاندا) ئیجابی و لەبارە.. بەڵام هەرچی فەیلەسوفە فەرەنسیایەکانە ڕەشبینن و زۆرتر لایەنی سلبی تیا دەبینن وەك لایەنی ئیجابی.. هەرچەندە "فۆکۆ" لە دوارۆژەکانی ژیانیدا و بە ئیعترافی "هابرماس" خۆی، دوای هەراو ئاژاوەیەکی زۆر گەڕایەوە لای مۆدێرنەو ڕۆشنگەری[10]، بەڵام دەبێت بزانین کە ئەو لە سەرەتاکانیدا کەسێکی تەواو "نیچەویی" بوو دەیویست هەموو ئەو شتانەی مۆدێرنە بونیادی ناون تێکوپێك بدات. هەرچی "دێریدا"شە ئەوا هەموو تەمەنی لە لێکشیتاڵکردنی میتافیزیکای خۆرئاوا (واتە ئەقڵانیەتی خۆرئاوا)دا بەسەر بردو "جێڵ دولۆز"یش بە هەمان شێوە.

بەمجۆرە دەبینین کە مەسەلەی ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنەو هەڵسەنگاندنی ئەزمونی مێژوویی مۆدێرنە، گرنگترین کێشەی فەلسەفی خۆرئاوا بوە لە سی ساڵی ڕابردوودا.. هەرچەندە لە ساڵی *1945* تا ساتەوەختی لە دنیا دەرچونی "میشێل فۆکۆ" لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا تێڕوانینی سلبیانە بۆ مۆدێرنە باڵادەست بوو، بەڵام لەوە بەدواوە تێڕوانینی ئیجابی هاتە ئاراو شوێنی تێڕوانینی پێشوی گرتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دواجار "هابرماس" بەسەر "فۆکۆ"دا سەرکەوت، سەرکەوتنیشی هاوکاتی هەرەسی کۆمۆنیزم و (*1989*) سەرکەوتنی لیبرالیزمی دیموکراسی خۆرئاوا بوو.

> **"کانت" ئەو فەیلەسوفەیە کە بۆ یەکەمین جارو لە ڕێی بڵاوکردنەوەی کتێبە سەرەکیەکانیەوە، بنەماکانی پرۆژەی مۆدێرنەی دارشت و لەم ڕووەوە دەکرێت تێکستە بەناوبانگەکەی (ڕۆشنگەری چیە؟) بە یەکەمین گوتاری فەلسەفەی مۆدێرنە بدرێتە قەڵەم بەر لە "هیگڵ"**

وەك دەشزانرێت "فۆکۆیاما" زۆر بەم سەرکەوتنە دڵخۆش بوو پێی وابوو کە ئەمە کۆتایی مێژوە، بەڵام "ژاك دێریدا" لە کتێبەکەیدا

(تارماییەکانی مارکس) زۆر بە توندی کەوتە بەرپەرچدانەوەی تێزەی کۆتایی مێژوو[11].

"دێریدا" پێی وایە کە (تارمایی مارکس) بەسەر سەری خۆرئاوای سەرمایەداریەوەیەو سەرەڕای سەرکەوتنی خۆرئاوا بەسەر کۆمۆنیزمدا هێشتا ئەو تارماییە نەڕەویوەتەوە، هاوکات پێی وایە کە دیموکراسیەتی لیبرالی تا ئێستاش وەکی سستمێکی سیاسی لە بەشێکی گەورەی جیهاندا نەچەسپیوەو کاری پێناکرێت، جگە لەوەی کە ئەم سیستمە بە تەنها ناتوانێت کێشەکانی هەژاری و بێکاری نەك هەر لە ولاتانی جیهانی سێهەمدا بەڵکو لەناو خۆرئاوا خۆشیدا چارەسەر بکات.

مۆدێرنە توێژێکی گەورەو بەرفراوانی لە پەراوێزکەوتوان و بێکاران دروست کرد، بۆیە جێی خۆیەتی گەر بگەڕێینەوە لای "مارکس" و ئەو ئاسۆیانەی ئەو کردینەوە، پاشان لە ڕێی "مارکس"یشەوە بگەڕێینەوە لای ڕوە ئیجابیەکەی کەلەپوری ڕۆشنگەری. بەمجۆرە دەبینین "دێریدا"ش ناچار بوو بگەڕێتەوە لای ڕۆشنگەری پاش ئەوەی تەمەنی خۆی لە هەڵوەشاندنەوەی ئەقڵی خۆرئاوادا سەرف کرد.. لەم چەند ساڵەی دوایدا هێرشێکی توند کرایە سەر "ژاك دێریدا و میشێل فۆکۆ و جیل دۆلۆز"، ئەم هێرشانەش لەلایەن فەیلەسوفە لاوە تازە پێگەیشتوەکانەوە بوو، بە تایبەتی "لوك ڤێری". "ڤێری" ساڵی *1984* کتێبێکی بلاوکردەوە و تیایدا بە توندی هێرشی کردبوە سەر فەلسەفەی "فۆکۆ و دێریداو دۆلۆزو بۆردیۆو لاکان"، واتە شالاوی کردبوە سەر هەموو ئەوانەی لە ماوەی سەردەمی بونیادگەریدا (*1960–1980*) گۆڕەپانی ڕۆشنبیری فەرەنسیان کۆنترۆڵ کردبوو. "ڤێری" ئەو فەیلەسوفانەی بەوە تاوانبار کرد کە دژایەتی هەموو بەهاکانی شارستانیەتی نوێی خۆرئاوا دەکەن، وەك: (هیومانیزم و مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی و ئەقلانیەت..).. هاوکات بۆ ئەوەی دەستیان توندتر لەسەر دابگرێت پەنا بۆ "هابرماس" دەبات و ڕەخنەی ئەوەیان لێدەگرێت کە ئەوان ڕقیان لە هەموو مشتومڕێکی ئازاد و دیموکراسیانەیە کە ببێتە مایەی ڕێکەوتن و کۆدەنگی هاولاتیان یاخود بیانگەیەنێتە ئەوەی بڕیاری ڕاست و دروست بدەن. لە لایەکی ترەوە "ڤێری" سەرکۆنەی زۆری "فۆکۆ" و هاوڕێکانی دەکات، بەوەی تەئکید لەسەر جیاوازی دەکەنەوە و ئیعترافیش بە هیچ بەهایەکی گەردونی ناکەن کە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بشێت. لێرەوە نائەقلانیەتە نیچەویەکەیان و ڕقی زۆریان لە بەها گەردونیەکانی فەلسەفەی ڕۆشنگەری دەخاتەڕوو[12].

> "دێریدا" پێی وایە کە (تارمایی مارکس) بەسەر سەری خۆرئاوای سەرمایەداریەوەیەو سەرەڕای سەرکەوتنی خۆرئاوا بەسەر کۆمۆنیزمدا هێشتا ئەو تارماییە نەڕەویوەتەوە

بەهۆی ئەو ڕەخنە توندانەی ئاڕاستەی "فۆکۆ" و هاوڕێکانی کرا، ئیتر خەڵکی بەرەبەرە لە فەلسەفە ڕادیکالیەکەیان کشانەوە، چونکە ڕەخنەکانی ئەوان بە ڕادەیەك بوو کە هێندەی

نەمابوو دەسكەوتە زۆر ئیجابیەكانی مۆدێرنە و لە رێـزی پێشەوەشـیاندا دەوڵـەتی مـاف و یاسـا لەناوبەرێت.

بەمجۆرە لە كۆتاییەكانی سەدەی بیسـتەمدا جـارێكی تـر "هابرمـاس" بەسـەر "فۆكـۆ"داو "كانت" بەسەر "نیچە"دا سەركەوت، بـەڵام ئەمـە بەو مانایە نایەت كە كێشەكە یـەكلایی بۆتـەوە.. چونكە مێژوو لە ناخیدا ئەقڵانیەت و نائەقڵانیـەتی حەشـارداوەو هـەندێك جـار بێدەنـگ و خـامۆش دەبێت و هەندێ جاریش هەڵدەچێ و دەتەقێتەوە.. دواجار دەبێت ئەوەش بڵێین كـە: ئـەو تاوانانـەی بـەناوی مۆدێرنـەی خۆرئـاواوە لـە قۆنـاغی كۆلۆنیـالیزمدا ئـەنجامدران بۆچونـەكانی "فۆكـۆ" زیاتر دەسـەلمێنن، نـەك تێزەكـانی "هابرمـاس" و "لۆك ڤێری" و.. هتد.

## پەراوێزەكان


*1-Paul Valery: Variete 1, Paris Gallimard, 1924.*

*2*–چاپی فەرەنسی ئەم دوو كتێبەی "فرۆید" ئەمانەن:

*1-Freud: L'Avenir d'ine illusion. P.U.F. 1991.*

*-Freud: Malaese dans la civilisation, P. U. F. 1992.*

*3-Ernist Cassirer, Martin Heidgger: D'ebat Sur to Kantisme at la Philo Sphie (Davos, mars, 1929). Paris, 1972.*

*4*–ناونیشـانی كتێبەكـەی "ئـادۆرنۆ" بـە فەرەنسـی (دیالـەكتیكی ئەقڵـە)، بـەڵام ناونیشـانی ئەڵەمانیەكـەی (دیالەكتیكی رۆشنگەریە).

*-Horkheimer ast Adorno: La dialactiq ue de la raison, Paris, Gallimard, 1983.*

*5*–بـۆ زیـاتر ئاگـاردبون لـە تیۆریـای قوتابخانـەی فرانكفۆرت بڕوانە كتێبەكەی كریستیان دولا كامبانیە: مێژوی فەلسـەفە لـە سـەدەی بیسـتدا– پـاریس، سـوی، *1995*. ل ل *224– 223.*

*-Christian Dalcampagne: Histoire de la Philosophie au xxe Siecle. Seuil, Paris, 1995. PP. 224-223.*

*6-Didier Eribon: Michel Foucault et Ses Coutem Porains. Paris, fayard, 1994. PP. 300-301.*

*7-Hubert Dreytus et Paul Rabinow: Michel Foucault, un Parcours Philoso Phique, Gallimard, 1984. P. 300.*

*8-Les E'tudes philosophiques: Octo bre- December 1986 Bernard Walden tels: Division ou dispersion de la raison" Unde: bat enter Habernas et Fouca Ult.*

*9-Jurgen Haber mas: Le discours Philos ophique dela moder Uite, Galle mard. Paris, 1988.*

*10-Jurgen Haber mas: Unetleche daus le Colus dutemps Presnt, Critique, agut- September. 1986, PP. 794-799.*

*11*–بڕوانـە كتێبەكـەی "ژاك دێریـدا" تارماییـەكانی ماركس.

*-Jacques Derreda: Spectres de Marx. Galilee, 1993.*

*12-Lue Ferry et Alain Renaut: Lapen See 68. Essai Sur L'anti- humanis ue Cpitem Porain. Gallemard, 1985. PP. 162-164-.*


## سەرچاوە

البحرين الثقافية– العدد *23*– يناير *2000.*

# دیموکراسی و مافی مرۆڤ

• ڕامین جەهانبەگلو

▪ لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

## *1*-بیرکردنەوە سەبارەت بە مافی مرۆڤ:

زیاتر لە دوو سەد ساڵ پاش بڵاوکردنەوەی جاڕنامەی مافی مرۆڤ و هاووڵاتی لە *1789*دا لە فەرەنساو، چل و هەشت ساڵ پاش مۆرکردنی جاڕنامەی جیهانیی مافی مرۆڤ لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا، مەسەلەی مافی مرۆڤ بەردەوام وەکو یەکێك لەو مەسەلانەی کۆمەڵگای مرۆیی ماوەتەوە کە وروژێنەرو ئاڵۆزن. بۆ ڕاستیی ئەمەش دەتوانین بڕوانینە زۆربەی وڵاتانی ئەمڕۆی جیهان کە چۆن ڕێز لەو مافانە ناگرن و خۆیانی لە قەرە نادەن. سیاسەتی تەحەممول







نەکردن و دڕندەیی و تاساندن لەمڕۆدا؛ ڕوخسارێکی جیهانیی بەخۆوە گرتوە. ڕۆژ نیە کەسێك؛ لەبەر بیروباوەڕی سیاسی یان ئاینی جیاوازی، یان لەبەر نەژادو ڕەگەزو کەلتوری جیاوازی؛ زیندانی نەکرێ، یاخود ئازار نەدرێ و نەکوژرێ. بەرامبەر بەم ڕاستیە ترسناکە؛ پەنابردنە بەر ترس و نائومێدی و سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی ئاگری ڕق و کینە، بوارێك بۆ وەڵامدانەوەی مەسەلەی مافی مرۆڤ و بیرکردنەوە لە ناوەڕۆکی ئەو مەسەلەیە ناهێڵێتەوە. لە کاتێکا ئەمڕۆ خستنەڕووی مەسەلەی مافی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی هەلومەرجە

پێویستەکان، بۆ بیرکردنەوە لێی؛ وەکو هەوڵ و تەقەللایەکە بۆ تێگەیشتن و گۆڕینی دۆخی مرۆیی. بەدەربڕینێکی دی، بیرکردنەوە لە مافی مرۆڤ بە مانای بیرکردنەوە لە بێگوناهیی ئادەمیزاد نیە، بەڵکو تێڕامانە سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان سیاسەت و ماف لە ڕێی مەحکومبوونێکەوە، کە هەروەکو سارتەر دەڵێت؛ سەرچاوەی ئازادیی مرۆڤە.

### 2-فەلسەفەی مافی مرۆڤ:

بە سوک تەماشاکردنی مافی مرۆڤ و ئەفەرۆزکردنی؛ واتە پێشێلکردنی کەرامەت و شایستەیی مرۆڤ و دابەزاندنی لە ئاستی ئاقڵ (یا "خاوەن ئەقڵ")ەوە بۆ "مەعقول". بەمجۆرە ڕوشاندنی مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ کەمکردنەوەیە لە یونیڤێرسالێتیی چەمکی مرۆڤ لە ڕێی سیستمێکی بەهایی لۆجیکێکی سیاسیەوە، کە تەوەری سەرەکیی بیرکردنەوەی خۆی لە باوەڕهێنان بە پرنسیپی ئەقڵێکی سەروو ئادەمیزاددا دەبینێتەوە، کە حاڵەتێکی پێویست و جەبریش بەخۆیەوە دەگرێت. لەم پەیوەندیەدا دەتوانین ستەمی میتافیزیکیانەی ئایدیۆلۆژیا لەوەدا ببینینەوە کە ئەو وەکو زەرورەتێکی مێژوویی لە پێش زەمینەی داهێنانی تاکە کەسیەوە دێت، (کە ئەم زەرورەتە مێژووییەش بە جۆرێك لە جۆران زەرورەتی بوونی ئەزەلی خۆی لە مێژوودا ڕادەگەیەنێت). ئەم باڵادەستیەی میتافیزیکای بابەتی لە ناواخنی ئەقڵگەراییەکی مێژوویی -ئامرازیو، دیوەکەی تری میتافیزیکای خودگەرایی ڕێبازی مرۆگەرایی (هیومانیزم)دا، وەکو نرخ دانەنانێکە بۆ تاکێتیی تاکەکەس بەوپێیەی بنچینەی بڕیاردانی ئازادانەی کۆمەڵگایە. لەوێشەوە کە فەلسەفەی مافی مرۆڤ لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە لەگەڵ ڕێبازی هیومانیزمدا، بۆیە پشتیوانیکردن لە تاکێتیی تاکەکەس بەرامبەر بە پرنسیپی ئەقڵی دۆگمایی ئایدیۆلۆژیا جۆراوجۆرەکان (کە وەکو ئامانجێك ناڕواننە مرۆڤ، بەڵکو وەکو وەسیلەیەك بۆ بەرەوپێشبردنی لۆجیکی خۆیان) کۆڵەکەو بنەمای سیاسەتی مافی مرۆڤ پێکدەهێنێت.

بەمجۆرە، هزرو گوتاری مافی مرۆڤ لەسەر بناغەی بەرهەڵستیەکی شارستانیانە دژ بە هزری تۆتالیتار و کارو کردەوە دەزگاییەکانی لە کۆمەڵگادا؛ دامەزراوە. ئەم بەرهەڵستیەش کە لە هەمانکاتدا چ لە گوتارو چ لە کرداریدا پەیڕەوی لە توندوتیژی ناکات، لە ناوخۆیدا ڕەخنەو هەڵسەنگاندن سەبارەتی بە تیۆرەی ئەقڵگەرایی پێویستیی مێژوو لە ڕووی خستنەڕووی داهێنانی تاکە کەسیانە و مافناسیانە لە کۆمەڵگادا؛ هەڵدەگرێت. بە جۆرێکی دی بیڵێین؛ فەلسەفەی مافی مرۆڤ، وەکو هزرێکی پەیوەست بە ڕەتکردنەوەی توندوتیژی و بەرهەڵستەیەکی مەدەنیانە لە کۆمەڵگادا؛ لە ڕێی دیاریکردنی بەهای مرۆڤەوە "لە خۆیداو بۆ خۆی" (واتە مرۆڤێك کە مانای سیاسیی خۆی لەو کۆمەڵگادا بە هۆی کرداری داهێنانی حقوقیانەی سەربەخۆیانەی خۆیەوە دەدۆزێتەوە)، پلەوپایەی هاوڵاتێتیی بکەری فەردی؛ بە پەیوەندیی لەگەڵ ئازادیی

تەواوی ئەودا لەبەرچاو دەگرێت. لەوێوە کە فەرد بەرامبەر بە یاسا پلەوپایەی هاوڵاتێتیی خۆی بەدەست دێنێت؛ لە هەمانکاتدا ئەم فەردە هاووڵاتیە خۆی بابەتی یاساو هەر خۆشی بکەری کۆمەڵایەتیەتی. بەمجۆرە، فەرد (یان تاکەکەس) پێناسەی هاووڵاتی و سنوری کاری سەربەخۆیانەی خۆی لە سنورێکی یاسایی وەهادا دەبینێتەوە کە وەکو هاووڵاتیەك لە خولقاندن و گۆڕینیدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت.

کەواتە سیستمی یاسا، نەزم و بەردەوامیی خۆی؛ هەم لە مانای گشتیی خۆی و هەم لە ڕێزگرتنی هاووڵاتیاندا دەبینێتەوە.

مافەکانی مرۆڤیش وەکو سیستمێکی بەهایی حقوقی؛ مانای تەواوەتیی خۆی لە گشتگیرێتیەکدا دەبینێتەوە کە پێی دەوترێ مرۆڤایەتی. مافەکانی مرۆڤ؛ مافی بکەرێکی گشتگیرو جیهانیە. بکەری گشتگیریش، وەکو بابەتی مافەکانی مرۆڤ، ئادەمیزادە لە پلەی فەردیەت (یان تاکێتی)ی خۆیدا. لەم ڕووەوە، مافی مرۆڤ، مافی ئادەمیزادە وەکو تاکەکەس. لێرەشدا مەبەست لە تاکەکەس ئاماژەکردن نیە بۆ کەسێکی دیاریکراو، بەڵکو باس لە بکەرێکی مرۆییە کە ئەرستۆ پێی دەڵێت زوئون پۆلتیکۆن (واتە بوونەوەری زیندووی بە دەزگایی بوو لە کۆمەڵگادا) کە بە ڕای ئەو باڵاترین تایبەتمەندیی ئەم بوونەوەرە لە توانای گوتنیدا -زوئوف گومون ئیکون (بە مانای بوونەوەری زیندووی قسەکەر)- کورتدەبێتەوە. بە واتایەکی دی، بکەری مرۆیی بە تەنها لە پەنا هاوڕەگەزەکانی خۆیدا دەتوانێ باڵاترین شێوەی ژیان- وەکو تاکەکەسێك و لە بواری گوتندا- بەدەستبێنێت. لەم ڕووەشەوە دەتوانین تاکەکەس بە خولقاوی کۆمەڵگاو تاکێتی (فەردیەت)یش بە بەرەنجامی بەرزی مێژوویی مرۆیی لە قەڵەم بدەین. تاکەکەس خۆی، وەکو بونیادێك لە کۆمەڵگادا، خولقێنەرو ڕووخێنەری کۆمەڵێك بونیادی کۆمەڵایەتیی ترە، کە بە هۆی سروشتی کۆمەڵایەتیی خۆیەوە دەیانهێنێتە ئاراوە. بونیاد (یان بنچینە)ی سەرەکی و سەنتەریی کۆمەڵگاش کە مرۆڤەکان لە سەرچاوەکەیدا جێگیر دەبن، بنچینەی یاسایە. ئێستا با بزانین یاسا چیە؟

> **یاسا ئەنجامی کارکردی ئەقڵی مرۆییە لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا.**

### 3-پێگەی تاکەکەس لە یاسادا:

دەشێ یەکێك لە جوانترین ماناکانی چەمکی یاسا لای مۆنتسکیۆ ببینینەوە کە دەڵێت: "یاسا، بە شێوەیەکی گشتی، ئەقڵێکی مرۆییە، کە بەسەر تەواوی خەڵکی زەویدا فەرمانڕەوایە".

بە واتایەکی دی ئەگەر بمانەوێ قسەکەی مۆنتسکیۆ دەرك بکەین، دەڵێین کە یاسا ئەنجامی کارکردی ئەقڵی مرۆییە لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا. کارکردی ئەقڵی مرۆیی واتە هەڵسەنگاندنی ئەقڵێکی کردەیی کە دیاریکەری سنورەکانی یاسادانانی تاکەکانی کۆمەڵگایە وەکو تاکگەلێکی سەربەخۆ. بەمجۆرە، هەڵبژاردنی تاکەکانی کۆمەڵگا بە هۆی یاسایەکەوە دیاریدەکرێ کە خۆی

ئەنجامی هەڵبژاردنی ئازادی ئەوانە، بەم پێیە یاسا گشتێکی جیاو دابڕاو نیە لە ئیرادەی ئەندامانی کۆمەڵگا، بەڵکو گشتێکە کە لە پەیوەندی لەگەڵیدا هەر تاکێکی کۆمەڵگا خۆی وەکو بکەرێکی حقوقی دەناسێنێت. کەواتە دەتوانین بڵێین کە گشتێتی یاسای دەستبەری سەربەخۆیی تاکەکەسە لە کۆمەڵگاداو دیاریکەری سنوورەکانێتی.

لە ڕاستیدا، بنەڕەتی یاساکەش لە پەیوەندیدا لەگەڵ گشتێتیدا دیاریدەکرێ. لەبەرئەوەی گەر ئەو یاسایەی بەپێی خواستی تاکەکەسێك، یان تاقە ڕێکخراوێك یا حیزبێك و یان گروپێکی کۆمەڵایەتی و بە پێچەوانەی خواستی هەموو تاکەکانی کۆمەڵ دابڕێژرێ، پرنسیپی حقوقی‌ی خۆی نابێت. چونکە وەکو ئەفلاتونیش دەڵێت "ئەو یاسایانەی کە لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندیی کەمینەیەك دادەنرێن، شایستەی ئەوەنین پێیان بوترێ یاسا، بەڵکو ئەوانە دەستوری حیزبن و ئەو مافانەی لەسەر بناغەی ئەو جۆرە یاسایانەش دامەزراون جگە لە لاف و گەزاف هیچی دی نین". بە واتایەکی دی، بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی گشت تاکەکانی کۆمەڵە کە یاسا دەبێتە مایەی خستنەڕووی سروشتی گەوهەریی خۆی و بنەمای حقوقیی خۆی (کە ئەنجامی پەیوەندیی ئازادو سەربەخۆی تاکەکانی کۆمەڵە لەگەڵ یەکدا) بەدەست دەهێنێت، خولقاندنی دیموکراسی و گۆڕانی فیکری و بنەڕەتیشی لەسەر ئاستی کۆمەڵگا؛ پەیوەستە بە مانەوەی ئەو پەیوەندییە ئازادو سەربەخۆیەی کە ئەندامەکانی کۆمەڵگایەك لە سای یاسادا لەگەڵ یەکدا دەیبەستن. بەڵام باسکردن لە پەیوەندیی ئازادو سەربەخۆیانەی تاکەکانی کۆمەڵگاش، بەرەو باسی پێداویستیی بوونی ئاکار (ئەخلاق)مان دەبات لە بواری بوونی کۆمەڵایەتیدا.

## 4-لە ئەرکی ئاکارییەوە تا مافە مەدەنیەکان:

دەسوەردانی ئاکار لە کۆمەڵگادا وەکو دامەزراندنی ئەقڵانیی ئەرکە مرۆییەکانە لە شێوەی مافی مەدەنیدا. لەوێشەوە کە ماهیەتی ئەم مافانە لە ڕێی ماهیەتی ئەرکە مرۆییەکانەوە دیاریدەکرێ، بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە بنەمای یاسا، لە فراوانی و لە پەیوەندیدا بە قەڵەمڕەوی ئاکارەوە، شێوەی کۆمەڵایەتی خۆی بەدەستدەهێنێت. ئەگەر ئێمە ئەوەمان پێ قبوڵ بێت کە ئامانجی ئەم ئەرکە مرۆییانەو سنوری کارکردیان بە هۆی ئەقڵی کردەیی مرۆڤەوە دیاریدەکرێ، ئەوکات دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە کاتی دامەزراندنی بنچینەییشیاندا لە کۆمەڵگادا (لە شێوەی مافە مەدەنیەکاندا) دیسانەوە ئامانجیان دەکەوێتەوە ناو سنوری کاری ئەقڵانیی ڕاستەوخۆی ئەندامانی کۆمەڵگە (بەو سیفەتەی لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا هاوڵاتین). لەم ڕووەوە، مافە مەدەنیەکان وەکو بنەمایەکی کۆمەڵایەتی، ئەنجامی کارکردی ئەو بنچینەو ئەرکە سیاسیانەن کە هاوڵاتیان بە ڕێکەوتن و لە کاری ئەقڵانیی ئازادی خۆیاندا، ماهیەت و سنوریان دیاریدەکەن.

ئێستاش با بزانین هاوولاتی كێیە؟ هاوولاتی لە یەك كاتدا بابەت و بكەری مافە مەدەنیەكانە، كە لە سەرێكەوە بە داهێنانی ئەم مافانە بواری هەڵبژاردنە كۆمەلایەتیەكانی خۆی دیاریدەكات و، لە سەرێكی تریشەوە بەرێزگرتن لەو مافانە بۆ هێشتنەوەی بونیادی كۆمەڵگای مەدەنی و پێگەی هاوولاتێتیی خۆی هەوڵدەدات. بەلام هاوولاتی، وەكو ئەندامێك لە كۆمەڵگای مەدەنیدا، بكەرێكی گشتی (كلی) نیە. ئەو بە تەنها وەك بكەرێكی مرۆیی نەك وەك هاوولاتیەكی كۆمەڵگای مەدەنی؛ ئەو گشتێتیە بەدەستدێنێت. لەم رووەوە ناتوانین مافەكانی مرۆڤ بە مافە مەدەنیەكانی تاكەكانی كۆمەڵگایەك بزانین. بەلام فەوتانی كۆمەڵگای مەدەنی، فەوتانی مافەكانی مرۆڤیشی بەدوادا دێت. لە كاتێكدا تاكەكەس بە لەدەستدانی پێگەی هاوولاتێتیی خۆی لە كۆمەڵگادا، پێگەی خۆی وەك مرۆڤێك لەدەست نادات. (بە پێچەوانەی تیۆرەكەی ئێدمۆند بریك لە كتێبی "چەند تێرامانێك سەبارەت شۆرش لە فەرەنسادا").

بەمجۆرە، دەكرێ پشتیوانی لە مافە مرۆییەكانی تاكەكەسێك بكرێ، لە دەرەوەی چوارچێوەی یاساكانی كۆمەڵگایەك (واتە وەكو وەكو بكەرێكی مرۆیی نەك هاوولاتیەك) بەلام پێشێلكردنی مافە مرۆییەكانی تاكەكەسێك هاوكات لەگەڵ رێزگرتن لە مافە مەدەنیەكانی، شتێكی ئەستەمە، لەبەرئەوەی تاكەكەس تەنها كاتێك هاوولاتیە كە بەر لە هەموو شتێك وەكو مرۆڤێك مافە سەرەتاییەكانی هەبێت. هەر بۆیە بوونی مرۆڤایەتی بەڵگەی بوونی مەدەنیەت نیە، بەو جۆرەی كە رێزگرتن لە مافەكانی مرۆڤ مەرجی پێویستی سەقامگیربوون و بەردەوامیی مافە مەدەنیەكانە لە كۆمەڵگادا.

> **هاوولاتی لە یەك كاتدا بابەت و بكەری مافە مەدەنیەكانە**

### 5-دیموكراسی و مافەكانی مرۆڤ:

دیموكراسی، وەكو تاقە بنەمایەكی سیاسیی كۆمەڵگای مرۆیی كە لەسەر بناغەی رێزگرتن لە دوو پرنسیپی تاكێتی (فەردیەت) و داهێنانی سەربەخۆیانەی تاكەكانی كۆمەڵگا دامەزراوە، رەگوڕیشەی وا لە فەلسەفەی مافەكانی مرۆڤداو قاڵبی حقوقیشی وا لە مافە مەدەنیەكانی هاوولاتیاندا. لەوەشەوە كە فەلسەفەی مافەكانی مرۆڤ، گەوهەری خۆی لە پرنسیپی داهێنانی مرۆییدا دەبینێتەوە لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا، بەم پێیە هزری مافەكانی مرۆڤ لەناو مەنتیقی هیچ ئایدیۆلۆجیایەكدا گیرناخوات لەبەرئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێكی داهێنەرو سەربەخۆیە، ئەمە وەكو داننانە بەوەدا كە ئەستەمە سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەكی هەتاهەتایی لەناو سیستەمە ئایدیۆلۆژیە داخراوەكاندا دیاری بكرێ. هەر بۆیە فەلسەفەی مافی مرۆڤ بە تەنها بناغەی كۆمەڵگایەكە كە ماهیەتێكی نائایدیۆلۆژیی هەبێت. بە واتایەكی دی، ئەو كۆمەڵگایەی كە مەرجی بوونی خۆی لە جۆرە دوالیزمێكی مانەویدا ببینێتەوەو بە تەنها بەشێك لە مرۆڤایەتی بە

ئامـانجی مـەنتیقی خـۆی دابنێـت، بـەپێی ئـەو پێناسـەیەمان ئەمـە نەفیکردنەوەیـەکی کردەیـی مافەکانی مرۆڤە. خەباتکردنیش دژ بەو دوالیزمە لـە شێوەی بەرەنگارییـەکدا کـە پشتبەسـتوە بـە مافەکانی مرۆڤ؛ دژ بە توندوتیـژی و نـەفیکردنی ئـازادی و ناعەدالـەتی و نایەکسـانی لـە ئاسـت یاسـادا، لـە هـەمانکاتدا خەباتـە لـە پێنـاوی خولقاندنی بناغەیـەکی سیاسـیی دیموکراتـدا کـە سەلماندنی کردەیـی مافـەکانی مرۆڤـە. بـەمجۆرە، وەختێ کە قسـە لەسـەر فەلسـەفەی مافی مرۆڤ و هەلومەرجـەکانی وەدیـهاتنی دەکـرێ لـە دامەزراوێکی دیموکراتدا، دەتوانین بڵێین کە هەر هزرێکی دیموکرات بەر لە هەموو شتێك هزرێکە سـەبارەت بـە مافـەکانی مـرۆڤ کـە یەکـەمین و دواهەمین سەنگەری ئازادی مرۆڤەکانە.

## سەرچاوە

مدرنها، رامین جهانبگلو، چاپ اول 9 نشر مرکز، تهران.

97



# چاو پیاخشانێك بە شۆڕشی زماناسیی (چۆمسكی) دا

▪ مەهدی سەبزەواری
▪ لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح

(نوام چۆمسكی)[1] شیكاری هەڵكەوتووی بابەتە رامیاری و كۆمەڵایەتیەكان، یەكێكە لە بەناوبانگترین ڕەخنەگرانی سیاسەتەكانی دەرەوەی ئەمەریكا، فەیلەسوف، ماتماتیكزان و بە تایبەت زمانناسی خاوەن بیروڕای زانستی دەروننناسی سەردەمە.

(چۆمسكی) بە هۆی هەزری فراوانی و جۆراوجۆری كارەكانی، لە ریزی چەند رۆشنبیرێكی ناوداری جیهانەو لەسەر بنەمای دوایین لێكۆڵینەوەكان لە ساڵی (*1980* تا *1992*ز) لە نێوان خاوەن بیروڕاكانی دنیا كە ناویان لە كتێب و سەرچاوە جۆراوجۆرەكانی زانستە مرۆییەكاندا هاتوە، ناوی لە پلەی هەشتەمدایە: (ماركس، لینین، شكسپیر، ئەرەستۆ، كتێبی پیرۆز، ئەفلاتون، فرۆید، چۆمسكی، هیگل، سیسیرو). (كتێبی پی ئاترو ل *15*).

ئەم بابەتەی ئێستا دەیخوێننەوە وەرگێران و پوختەی لە چەند بەشێكی كتێبی "ڕەخنەو پشكنینی بیروڕاو نوسینەكانی چۆمسكی"دا وەرگیراوە كە نوسینی (روبیرت ئیسكالا و دانیەل پرگین)ە و (كارلوس پی ئاترو) پێشەكی كتێبەكەی نوسیوە.

ئەم كتێبە بە بۆنەی شیكردنەوەی چۆنیەتی دروست بوونی بیروڕای چۆمسكی لە بواری زمانناسی و كاریگەری شوێن و مەرجی ژیانی لەسەر جۆری بیركردنەوەی، بایەخێكی زۆری هەیە، بۆیە لە وەرگێڕانی ئەم بابەتەدا، تەنیا سەرنجی ئەو بابەتانە دراوە كە پێوەندی بەوانەوە هەیە. بەهەرحاڵ ئارەزومەندان دەتوانن بۆ ئاشنایی پەیداكردنیان دەربارەی



چۆمسكی

بیروڕاو شێوەی بیرکردنەوەی (چۆمسکی) دەربارەی زمانناسی و بوارەکانی تریشدا، بەو کتێب و نوسین و بابەتانە بچنەوە کە دەربارەی جێدەست و هزری (چۆمسکی)دا نوسراون.

## شۆڕشی زمانناسی چۆمسکی

(چۆمسکی) چالاکیەکانی لە زمانناسیدا بە مەبەستی پێکهێنانی گۆڕانکاری و شۆڕش لەو بەشەدا دەست پێنەکردوە.

(چۆمسکی) لێکۆڵەرێکی گەنج بوو و دەربارەی پرسیارە سەرەکیەکانی لەو بوارەدا پشکنینی دەکرد. چونکە زۆربەی وەڵامەکان لە جیاتی ڕێگاچارە، کێشەکەیان دوو ئەوەندە دەکردەوە.

زیاتر لە (*50*) ساڵ پرسیارێکی سەرەکی هزری زمانناسانی داگیرکردبوو کە: "زمان چیە؟" و تەنیا زمانناسێك کە ئەو پرسیارەی بە سادەیی و ئاشکرایی پرسی، "فردینان دوسوسور"[2] بوو کە لە تەمەنی (*21*) ساڵیدا و لە ساڵی (*1878*ز)دا کتێبێکی دەربارەی زمان بڵاوکردەوە. (دوسوسور) دوای ئەو کتێبە، ئیتر کتێبێکی تری نەنوسی و پاش مردنی لە ساڵی (*1913*ز)دا ژمارەیەك لە خوێندکارەکانی یاداشت و نوسین و وتارەکانیان کۆکردەوەو لە کتێبێکدا بە ناوی (وانەکانی زمانناسی گشتی)[3] بە ناوی (سوسور) بڵاویان کردەوە. کتێبێك کە بونیاتنەری زمانناسی نوێ بوو.

بە ڕای (سوسور) زمان، پەیوەندی نێوان بیروهزری مرۆڤ و ئەو دەنگانەیە کە دەریدەکات.

بە ڕای (سوسور) بیرکردنەوە (مدلول)[4] و دەنگیش (دال)[5]ەو، لە ڕێگای نیشانەی زمانیەوە[6]، پەیوەندیان دروست دەبێت.

(سوسور) دەیگوت: خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە دەربارەی زمان، لە ڕێگای خوێندنەوەی نیشانەکانی زمانەوە ئەنجام دەدرێت، خوێندنەوەیەك نە بە شێوەی مێژوویی و نە بە شێوەی بەرانبەری، بەڵکو خوێندنەوەیەك دەربارەی زمانێکی تایبەت لە کات و شوێن و سەردەمێکی تایبەتدا بێت.

(سوسور) بۆ ئاسانکاری لەو کارەدا، لە نێوان زمان[7] و گوفتاردا[8]، جیاوازییەکی پێك هێنا. بە ڕای ئەو بیروبۆچوون و، بڕواو هزری کولتوریی زمانی تایبەت لە قۆناغێکی تایبەتدا، بە یەکەوە کۆدەبنەوەو زمان دروست دەکەن، کە پەیوەندی لەگەڵ گوفتاردا، نیشانەی زمانی دەستنیشان دەکرێت.

**لە ئەمەریکادا، زمانناسی نوێی بونیاتگەرا، لە سەرەتاوە وەکو ئامرازێك بۆ مرۆڤناسی پێشنیارکراو**

لە ئەمەریکادا، زمانناسی نوێی بونیاتگەرا، لە سەرەتاوە وەکو ئامرازێك بۆ مرۆڤناسی پێشنیارکراو "لیونارد بلومفیلد"[9] لێکۆڵەرو مامۆستای واژەناسی زمانی ئەڵمانی لە زانکۆی (شیکاگۆ) بوو بە هۆی سەربەخۆیی ئەم بەشە لە ئەمەریکادا. ئەمڕۆ کتێبی (بلومفلید) کە ناوی (زمان، *1933*)ە، وەکو کاریگەری بنەمایی و

کلاسیکی قوتابخانەی زمانناسی لە ئەمەریکادا سەرنج دەدرێت.

ڕۆڵی (بلومفیلد) لەبەرەو پێشبردنی ئەم بەشە، بە وتەی یەکێك لە مێژونوسان ئەمەیە کە: "بلومفیلد ئەو بەشەی کرد بە زانست". بە ڕای (بلومفیلد)، نمونەکانی دەنگی زمانێك، بە شێوەیەکی (سیستماتیك) دەگۆڕدرێت و تەنیا ڕێگای وەدەستهێنانی ئەو گۆڕانکاریانە، (شێوەیەکی ڕێکوپێك لە ڕوال)[10]ەو، بۆ وەدەستهێنانی (ڕوالی شیاو) پێویستە هەموو ئەو هۆکارانەی زمانی نین، بخرێتە لاوە.

(بلومفلید) خۆی بە (میکانیست) دەزانی و بەڕای ئەو هەر شتێك پەیوەندی لەگەڵ زەین و بیرو چالاکیەکانی زەیندا هەبوو، بابەتێکی گونجاو نەبوو بۆ زمانناسی.

زمانناسی وەسفگەرای ئەمریکی تەنیا گوفتاری (سوسور) واتە (*Parole*) یان خوێندبوەوەو بە هیچ شێوەیەك سەرنجی زمانیان نەدەدا.

بەهەرحاڵ زمانناسی وەسفگەرا یان بونیاتگەرای ئەمریکا، کۆمیتەیەکی سەربەخۆ و کاریگەربوو تا ئەو کاتەی چۆمسکی هات و هەمووی تێکدا.

جیاوازی سەرەکی نێوان چۆمسکی و زمانناسانی پێش سەردەمی خۆی جگە لە هەموو بابەتە هونەرییەکان، دژایەتی کردنی تەواوی یەکتر بوو لەسەر چییەتی و بەهای زەیندا.

مانای زمانناسی بونیاتخواز لای زمانناسان وابوو: "دەنگی گوفتارێ کە مرۆڤ لەژێر کاریگەری فاکتەرە تایبەتیەکاندا دروستی دەکات"، لە حاڵێکدا کە چۆمسکی، زمان وەکو ئامرازێك بۆ دەربڕینی ئازادانەی بیرو ئەندێشەو، وەڵامێك بۆ پێگەی خۆی دەزانێت و، بە قسەی چۆمسکی، ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ڕستەگەلێك دروست دەکەین کە لەوانەیە تا ئێستا بەکارمان نەهێنابێت و هەروەها لەو ڕستانەش تێدەگەین کە تا ئێستا نەمانبیستوون.

بە واتایەکی تر، کەڵك وەرگرتنی ڕۆژانەو بەردەوامی ئێمە لە زمان، داهێنەرانەیە. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە ڕوانگەی مەکتەبی بونیاتخوازی زمانناسیەوە، توانای ئێمە لە دروستکردن و تێگەیشتنی ڕستە نوێیەکان لە ڕێگای بیروڕای جۆراوجۆری ڕەفتاری و میکانیکیدا، شیاوی لەسەر وەستانە.

واتە ئێمە هەر لە تەمەنی منداڵیەوە بەپێی شێوەی پەروەردەبوونمان فێری وەڵامدانەوەی فاکتەرە دیاریکراوەکان دەبین یان فێردەبین چۆن خووڕەوشتی دیاریکراومان لە بەکارهێنانی زماندا هەبێت و، ڕستە نوێیەکان لە ڕێگای پێوانەکردنیان لەگەڵ ڕستە کۆنەکاندا، دروست بکەین.

بە ڕای چۆمسکی، کەڵك وەرگرتنی خولقێنەرانە لە زمان، سازگاری لەگەڵ سنوری دەستنیشانکراوی میکانیکدا نیە.

لایەنی خولقێنەرانەی زمان کە لە توانای زەینی هەر مرۆڤێکدا شاراوەیەو، جگە لە بزوێنەرە تایبەتیەکانی دەرونی و لەسەر بنەمای پێگە نوێیەکاندا، تازەو نوێ خوازانەیەو

دەبێتە هۆی لەدایکبوونی بیرو وێنەی تازە لە زەینماندا.

لە ڕاستیدا مانای داهێنانی بیری زمان لەوەدایە کە دروستبوونی بیرو هەست و سۆزەکان و سەرهەڵدانیان لە ڕێگای زمانەوە ئەنجام دەدرێت، لە لایەکی ترەوە ئەو پرۆسەیەی کە بیرکردنەوە لە بونیادە ئەبستراکتە (انتزاعی) زەینیەکان دروست دەکات، لەگەڵ ئەوەی کە بیرکردنەوە دەگۆڕێت بە زمانی گوتار جیاوازیان هەیە.

مانای ئەم قسەیە ئەوەیە کە ئامرازی هەست و سۆزو بیرکردنەوەکانمان، کۆپیەکی تەواوی زمان نیە.

بە ڕای چۆمسکی، پێویستە لێکۆڵینەوەی زمان، زەینخوازانە)[11] بێت، چونکە ئەگەر وا نەبێت تەنیا قۆرخ دەبێت لەسەر شێوەی ئاسایی و دەرەوەی کارەکەو ئەمەیش باسێکی کەمی زمانە.

بە وتەی چۆمسکی، ئەم مەسەلەیە وەکو شاخێکی سەهۆڵ وایە کە ئێمە تەنیا ڕوی دەرەوەی دەبینین، بەلام لە ژێرەوە، بنەمایەکی ئاڵۆز و پڕبایەخ هەیە.

هەرچەندە پێش چۆمسکی، جیاوازی نێوان (قوڵ بنەما[12]) و (ڕوبنەما)[13] لە زماندا، بە دەستی (سوسور) "زمانی گوفتار" و – (ڤینیگنشتاین)[14] پێشنیارکرابوو، بەلام چۆمسکی بە پێچەوانەی ئەوانەی پێش خۆی، بوونی ئەو بونیادە دوانەیەی بە کلیلێک بۆ وەلام دانەوەی پرسیارە سەرەکیەکانی تر دەربارەی چیەتی زەین دەزانی.

چۆمسکی دەڵێت: "تایبەتمەندیەکانی گشتی بونیاتی ڕێسایی لە نێوان هەموو زمانەکاندا هاوبەشەو، ئەم تایبەتمەندیانە، نیشاندەری تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی زەینە.. بۆیە هاوبەشیەکی تایبەتیان بۆ زمان هەیە کە بەسەر فراوانی زمانەکانی مرۆڤدا سنور دەستنیشان دەکات". بۆیە (گشتیەکانی)[15] تایبەت بۆ زمان بوونی هەیە کە بەسەر زمانە مرۆییەکاندا سنور دیاری دەکات.

هەولی سەرەکی چۆمسکی لە زمانناسیدا ئەمە بوە کە چەمکێك بخاتەڕوو کە شێوەی کارکردنی ئەو هاوبەشیە زمانیە ئاراستە بکات.

هەندێ جار ئەو زمانە هاوبەشە گشتیانە بە ناوی (خەیالاتی دەرونی)[16] ناوی بردوە کە بوەتە هۆی ئاڵۆزترکردنی بیروڕاکانی.

بە پێناسەیەکی هونەری، زمانی هاوبەش لە لای چۆمسکی تەنیا "مەرجگەلێکی زۆر سنوردار کراون، کە ڕێسای ڕێزمانەکەیان دابین دەکات".

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم مەبەستە ئەگەر بۆ نمونە لە ڕستەی "(جان) لە ڕاستگۆیی خۆشی دەبینێت"، شوێنی (بکەر) واتە (جان) لەگەڵ (تەواوکەر) واتە ڕاستگۆیی بگۆڕین، ڕستەکە دەبێ بە: "ڕاستگۆیی لە (جان) خۆشی دەبینیٚ".

دیارە ئەم ڕستەیە لە لایەنی ڕێساییەوە هەڵەیە. هۆکاریشی ئەمەیە کە بنەمای گشتی یان تایبەتمەندیەکی بنەمایی لە زەینی قسەبێژەکاندا بوونی هەیە کە ڕستەی یەکەم دەکاتە ڕێسایی و ڕستە دوهەم دەکاتە ناڕێسایی. لێرەدا پرسیارێکی سەرەکی بۆ چۆمسکی و هاوکارەکانی دێتە ئاراوە

کە ئەو بنەما گشتیانەی لەهەر خاڵێکی پرۆسەی زماندا، لە گرامەرەوە بیگرە تا قوڵ بنەماو ڕوبنەماو سەرئەنجامی دەربڕینی ئاواز و ئەو مانایانەی کە بەرەو ڕوی وشەکان دەبنەوە، بدۆزنەوە.

پێویستە لە سەردەمی منداڵی چۆمسکیدا بە دوای بنەماکانی شۆڕشی زمانناسیدا بگەڕێین.

(ڤیلیام چۆمسکی) باوکی (نوام چۆمسکی) لە مامۆستاکانی زمانی (عیبری) و ڕێنمایی ئاینی جولەکەکانی زانکۆکانی (فیلادلفیا) بوو، جگە لە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر ڕێسای زمانی عیبری سەدەکانی ناوەڕاست (سەدەی سیانزەهەمی زاینی) و نوسینی یەکێك لە گرنگترین کتێبەکانی زمانی عیبری، لە بواری پەروەردەو فێرکردنیشدا خاوەن بیروڕا بوە.

دایکیشی (میکوە ئیسرائیل)، مامۆستای چۆمسکی بوو هەم لە ماڵەوە و هەم لەو قوتابخانەیەی باوکی بەڕێوەبەری بوو.

باوکی بۆئەوەی نەچێتە ناو سوپای سزاری ڕوسیاوە، لە ساڵی (*1913*ز)دا کۆچی کرد بۆ (فیلادلفیا)ی ئەمریکاو هەر لەوێ بوو کە (نوام) لە ساڵی (*1928*ز)دا لەدایك بوو.

(نوام) لە سەردەمی منداڵیدا (تا تەمەنی *12* ساڵی) لە قوتابخانەیەك دەیخوێند کە بایەخێکی زۆریان بە خەیاڵ و هۆشی مندالان داداو لەو شوێنە گونجاوەدا، هەرکەسێك لەسەر بنەمای توانای خۆی، کارێکی گرنگی ئەنجام دەداو نرخی هەر کارێك کەمتر لەوی تر نەبوو. هەر لەو قوتابخانەیەدا، دایکی (نوام) مامۆستای زمانی عیبری بوو. کاتێ کە تەمەنی زیاتر لە (*10*) ساڵ نەبوو، دەستی کرد بە دوبارە خوێندنەوەو پێداچونەوەی کتێبی ڕێسای زمانی عیبری سەدەکانی ناوەڕاست، کە بە دەستی باوکی نوسرابوو. ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی کارێك بوو کە لە ساڵەکانی دواییدا بە شێوەی بیروڕایەکی بەنرخ لە دنیادا بڵاوکرایەوە.

نوام لە ساڵی (*1945*ز)دا چوە زانکۆی (پنسیلڤانیا). بەڵام پاش دوو ساڵ بڕیاری دا بە هۆی پەیوەندی بە کۆمەڵە مەسەلەیەکی سیاسیەوە، بچێت بۆ (فەلەستین) و ببێتە هاوپەیمانی یەکێك لە گروپە چالاکە سیاسیەکان. بەڵام دایك و باوکی بۆ بەرگریکردن لە ڕۆیشتنی، (نوام) یان لەگەڵ (زیلیگ هریس)[16] زمانناسی هەڵکەوتوو مامۆستای زانکۆ ناساند، کە زۆر بە خەستی تێکەڵی بابەتە ڕامیاریەکان بوو کە بیری چەپ ڕەوانەی کوڕەکەیانی لەخۆ دەگرت.

چۆمسکی دوای ئەوەی (زیلیگ هریس)ی ناسی، بڕیاری دا لە (پنسیلڤانیا) بمێنێتەوەو بێجگە لە توێژینەوەی بیرکاری و فەلسەفە، بەشداری خولەکانی زمانناسی (هریس)یشی کرد.

لەو کاتەدا، (هریس)، کاری سەرەکی خۆی لە بواری زمانناسی بونیادخوازانەدا دەستپێکردو کتێبی (شێوەکانی زمانناسی بونیاتگەرا)[18]ی نوسی.

چۆمسکی دەڵێت: "دووبارە خوێندنەوەو پێداچونەوەی ئەم کتێبە بوو بە هۆی ئەوەی من لە ئاستێکی زۆر بەرزدا فێری زمانناسی ببم، بەرلەوەی سود لە خولەکانی (هریس) وەربگرم".

(هریس) پێشنیازی بۆ چۆمسکی کرد تا دەربارەی ڕێسای عیبری بکۆڵێتەوەو کاری لەسەر بکات. ئەو لە بارەی ئەو قۆناغەی ژیانیەوە وا دەدوێت: "لە تەمەنی دە ساڵیدا دەستم کرد بە چاککردن و پێداچوونەوەی کتێبی ڕێسای زمانی عیبری سەدەی سیانزەهەم و ئەم بابەتە کاریگەری لەسەر زۆربەی کارەکانم هەبوو، چونکە لە جیاتی ئەوەی بە دیدێکی بونیاتگەرانە نزیکی ئەو بوارە ببمەوە، بە پێشینەیەکی ناڕەسمی، لە زەمینەی زمانناسی کلاسیکدا، چومە ئەو بوارەوە، هەرچەند ناتوانین ناوی پێشینەی لێ بنێین، بەڵام هیچ شتێکم دەربارەی ئەو بابەتە نەدەزانی و تەنیا ئارەزومەند بووم، کاری مێژوویی ئەنجام بدەم. هەرچەندە هەرگیز حەزم لە زمانناسی مێژوویی نەبوە، بەڵام لە زمانناسی مێژووییدا، خاڵێك شاراوەیە کە زمانناسی بونیاتگەرا بە شێوەیەکی گشتی ئەو خاڵەی پشتگوێ خستوە.

ئەو بابەتەی من گریمانەم کردو لەو بارەیەوە دڵخۆشم، نابێت لێکۆڵینەوەی زمانناسی تەنیا بە وەسفکردن ڕازی بێت و لە شیکردنەوەو تەفسیر بێئاگا بێت.

زمانناسی مێژوویی کاری لەسەر شیکردنەوەو دەربڕینی ئەمە دەکرد، کە بۆچی جۆرێك بونیات و فۆرم لە کاتێکی تایبەتدا بوونی هەبێ، بەڵام زمانناسی بونیاتگەرا، دوپاتی دەکردەوە کە شیکردنەوەو ڕاڤەکردنێك ئەنجام نەدرێت و لەم بیروبۆچوونەدا، شیکردنەوە جۆرێك لە فەلسەفانەی منداڵانەیە.

لە ڕاستیدا تەنیا کارێکی گرنگ، کە لە بواری زمانناسیدا ئەنجامم داوە ئەمە بوە کە شیکردنەوەکانی (توصیفی)[19] پێشکەش بکەم و هەوڵ بدەم تیۆری (بونیاتی هاوکاری[20]) زمان بدەم، تا بەشکردنی دیاردەکان شیبکاتەوە.

بە لایەنی کەمەوە، لە یەکەمین کاری خۆمدا، بە بەئاگا لە خۆبوونێکی زۆرەوە پشتم بە ژمارەیەکی جۆراوجۆر لە شیکردنەوەکانی کەسانی جیاواز لە بواری زمانناسی مێژووییدا بەست، ئەو جۆرە زمانناسیەی کە لە هەمان سەردەمی منداڵیدا لەگەڵی ئاشناییم هەبوو.

من هیچ جۆرە زانیارییەکی ترم دەربارەی زمانناسی نەبوو تا ئەوەی لە زانکۆ ئاشناییم لەگەڵ (زیلیگ)دا پەیداکرد.

ئەو دەڵێت: "کارەکەی من لەسەر ڕێسای عیبری هیچ جۆرە پایەیەکی تیۆری زمانناسانەی نەبوە، بەڵام یارمەتیم لە پێشینەو ئەزمونی خۆم لە زمانناسی مێژووییدا وەرگرت.

من چالاکی خۆم بێ پرسیارکردن دەستپێکردو سودم لە گرامەری پێکهێن[21] وەرگرت کە بە ڕای خۆم تەنیا شێوەی شایەنی قبوڵکردن بوو و هەوڵمدا سیستمێك لەو ڕێسایانە بدۆزمەوە کە توانای مانابەخشینی هەموو بونیاتی ڕستەکانی زمانی هەبێت.

زوو تێگەیشتم، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، پێویستە پێڕستێکی دوورو درێژم لە ڕێساکانی تۆمار کراودا هەبێت، هەروەها ئەمەش تێگەیشتم کە ڕێکوپێك بوونی لۆژیکی ئەو ڕێسایانە تا ڕادەیەك پەیوەندی بە ڕێکوپێك بوونی

سەردەمەکانی مێژوییە، کە من ئاشناییم لەگەڵیاندا هەبوو. پاشان گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ئەگەر بە زمان، ڕێکوپێکییەکی لۆژیکی دروست بکەین، دەتوانین بەشێکی زۆر لەو دیاردانە شیبکەینەوە. من ساڵەهای ساڵ بە تەنیا دەربارەی ئەو بابەتانە کارم دەکرد".

چۆمسکی لە ساڵی (*1951*ز)دا، ماجستێرنامەی خۆی بە ناوی "واژەناسی زمانی عیبری نوێ"[22] پێشکەش کرد بە زانکۆی پنسیلڤانیاو توانی بڕوانامەی ماجستێر لەو بوارەدا وەدەست بهێنێت.

هەروەها، لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەکانی لە بواری فەلسەفەدا، لە لای (نلسون گودمان)[23] درێژە پێداو دوای تەواوبوونی خوێندنەکانی، (گودمان) ئەوی کرد بە ئەندامی کۆمەڵەی زانستی جولەکەکانی (هاروارد).

چۆمسکی لەو قۆناغەدا بۆ بەرەوپێشبردنی شێوەکانی زمانناسی بونیاتگەرا کاری دەکرد و پاش چوار ساڵ پلەی دوکتورای لە زانکۆی پنسیلڤانیادا وەدەست هێنا.

چۆمسکی لەو ساڵانەدا، خوێندکارو لە هەمان کاتیشدا هاوکاری هریس بوو. لەیەک کاتدا درێژەی بە چالاکیەکانی دەربارەی ڕێزمانی زمانی عیبری دەدا. چۆمسکی لە دوایین ساڵی بوونی خۆی لە هاروارد، دەستنوسە (*900*) لاپەڕەکەی لەو بارەیەوە تەواوکردو ناوی "بونیاتی لۆژیکی تیۆری زمانی" لێنا.

چۆمسکی بەشێکی ئەو دەستنوسەی هەڵبژاردو ناوی "لێکدانەوەی گۆڕانە شێوازیەکان"[25] لێناو پێشکەشی کرد بە گروپی زمانناسی زانکۆی "پنسیلڤانیا" و بڕوانامەی دوکتۆراکەی وەرگرت.

لەو کاتەدا، یەکێک لە خوێنەرانی دوکتۆرانامەکەی گوتبووی: "من نازانم ئەم بابەتە پەیوەندی بە چ بەشێکەوە هەیە، بەڵام دڵنیام زمانناسی نیە".

چۆمسکی وا دەڵێت: "من بە شێوەیەکی گشتی بڕوام بە ڕوانگەی هریس هەبوو، ئەو وای دەزانی کە زمانناسی بونیاتگەرا، نمونەیەکی شیاوە و هەوڵی دەدا لەسەری کاربکات. لە ڕاستیدا یەکەمین بابەتی من لە گۆڤاری (لۆژیکی نیشانەیی)[26]دا بڵاوکرایەوەو ئێستا لەلای خۆم "کارێکی گەوجانە بوو".

یەک دوو ساڵێک پاش وەرگرتنی بڕوانامەی دوکتۆراکەی، هیچ سەرنووسەرو گۆڤارێك ئامادەی هاوکاریکردنی نەبوون و بابەتەکانیان بڵاونەدەکردەوە، تا ئەوەی ڕۆژێك، نوێنەرێکی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەڵمانی (موتان)[27] چوو بۆ کۆمەڵەی زمانناسی ڕێکخراوی تەکنەلۆژی (ماساچوست، *MIT*) کە چۆمسکی تیایدا مامۆستا بوو و، بە شێوەیەکی کتوپڕ دەستنوسەکانی لەسەر مێزەکەیدا بینی و دەربارەیان لێی پرسی. چۆمسکی لە وەڵامدا گوتی کە ئەوانە یاداشتەکانی وانەگوتنەوەکەیەتی و لە دەستنوسە (*900*) لاپەڕەییەکەی کۆی کردۆتەوە.

نوێنەری دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (موتان) سەیرێکی کردو گوتی:

"ئێمە بڵاوی دەکەینەوە" لێرەدا بوو کە (موتان) کتێبی بونیاتەکانی نحوی"[28] لە ساڵی (*1957*ز)دا بڵاوکردەوە.

چۆمسکی لەو کتێبەدا بە هۆی جەختی لەسەر گرنگایەتی توانای خوڵقێنەرانەی زمان، لەگەڵ مامۆستاکانیدا جیاوازی پەیداکردو ڕێسای ڕێزمانی بەناوی شیکردنەوەیەکی بە توانا بۆ چۆنیەتی پێکهێنانی ڕستەکان بڵاوکردەوە.

ئەو کتێبە بەسەر هەندێ لە زمانناساندا کاریگەری کرد. "روبیرت لیز"[25]، یەکێك لە زمانناسانی بونیاتگەرا، دوای خوێندنەوەی ئەو کتێبە، پشتگیری خۆی ڕاگەیاند و لە گۆڤاری "زمان"[30]دا، ڕەخنەیەکی باشی لەسەر نوسی و لەو کاتەوە ئەو کتێبە، سەرنجی هەموانی بۆلای خۆی ڕاکێشاو لەم بەشەدا شۆڕشێکی پێکهێنا.

چۆمسکی لە ساڵی (*1965*ز)، لە کتێبی "لایەنەکانی تیۆری نحو"[31]دا گۆڕانکاریەکی بە بایەخی لە ڕێزمانی (گشتاری)دا پێکهێنا. کە لەوێ ئاماژەی بەوە کردوە کە پێویستە (قوڵ بنەماو ڕوبنەما)کان لەگەڵ ماناناسی و واژەناسیدا پەیوەندیان هەبێت، هەر لەوکاتەدا کە تیۆری (نرخی هەڵسەنگاندن)[32]ەکەی هەموو بەشەکانی زمانناسی داگیرکردبوو، تیۆریەکانی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای دوو جۆر مانا لە زماندا پێکهاتبوو؛ یەکێك ئەمەی کە ڕێسای زمان، زانستێکی بنچینەییەو دوهەم ئەمەیە کە سودوەرگرتنی ئێمە لە زمان، لەگەڵ هەستی خوڵقێنەرانەی خۆمانە.

بە قسەی چۆمسکی، خوڵقێنەری لە بواری ئاڵۆزو دەوڵەمەندندا و لەو ڕستەیەی ئێوە دروستی دەکەن، ئاشکرایەو ئێوە ئازادن لەوەی دەتانەوێ هەر شتێك بڵێن و، هەر شتێك لە خەیاڵتاندایە، دەریبڕن و دەربارەی هەر شتێك دەتانەوێ، بیربکەنەوە.

چۆمسکی لە درێژەی ساڵەکانی (*1964*ز) تا (*1966*ز) سێ کتێبی[34]، لە بەشی زمانناسیدا نوسیوە کە هەمووی دەربارەی دووپاتکردنەوەی تیۆریەکانی و لە وەڵامی ڕەخنەگران و پێداچوونەوەی تیۆریەکانی بوە.

زۆرجار، پێکهێنەر کۆمەڵێك وزەی زەینی خۆی دەربارەی ڕوانگەی سەرەکی خۆی کۆدەکاتەوەو پاشان خەریکی دوبارەکردنەوەو گۆڕانکاری دەبێت و پەیڕەوەکانی باشتر دەتوانن کاریگەربوونی کارەکەی ببینن و بەرەو پێشەوەی ببەن.

چۆمسکی ماوەیەك لەمەوپێش لەسەر قسەی هاوکاری خۆی (موریس هالە)[35] ڕویکردبوە لای خوێندنەوەی زمانناسی مێژوویی و لە ساڵەکانی (*1964*ز) تا (*1965*ز) و کاتێك کە بۆ پشوو، دوای حەوت ساڵ کارکردنی سەخت، لە سەنتەری لێکۆڵینەوەکانی زەینی (هاروارد)دا نیشتەجێ بوو، خۆی بە تەواوی لەمێژووی زمانناسیدا نوقم کردو ئەنجامی خوێندنەوەکانی، کتێبی "زمانناسی دیکارتی"[36] لە ساڵی (*1966*ز)دا بوو.

کتێبێك کە ئەندێشەکانی دەربارەی چییەتی زەین، بە ئاشکرا دەربڕیوە و جگە لەوەش ڕوانگە رامیاریەکانی بە شێوەیەکی ئاماژەپێکراو، لە

ناویدا نوسیوە. چۆمسکی دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر تێگەیشت کە ناکۆکیەکەی لەگەڵ زمانناسی بونیاتگەرادا، بەشێك لە بابەتێکی گەورەترە دەربارەی میتودولۆژی فەلسەفەو دەروونناسی و زانستی کۆمەڵایەتی.

بەڕای ئەو، فەیلەسوفەکانی سەردەم لە جیاتی ئەوەی هەوڵبدەن لە فەیلەسوفەکانی کۆن، لە ڕوانگەی کەش و هەوای مێژوویی و خەیاڵی تایبەت بە خۆیان تێبگەن، هەموو سەرنج و بایەخی خۆیان دەدەنە بواری مێژوویی فەلسەفەوە.

چۆمسکی بە کەڵك وەرگرتن لە خوێندنەوەکانی لەسەر مێژووی زمانناسیدا، توانی پەرە بە تیۆریەکانی دەربارەی زمان بدات و پەیوەندیەك نێوان مێژووی کاری خۆی و پرۆسەکانی فیکری و تیۆریەکانی سەردەمەکانی نوێیدا پێك بهێنێت. تیۆریەکان تا نیو سەدە بەر لە چۆمسکی، ئەزمون خوازانە[37] بوون، بەم مەزەندەیە کە زانستی مرۆڤ تەنیا لە ڕێگای تاقیکردنەوە دەگاتە ئەنجامی خۆی.

ڕوانگەی زمانناسانی بونیاتگەراو دەرونناسانی ڕەفتارگەرا ئەمە بوو کە پەروەردەبوونی لایەنی خوڵقێنەری بەکارهێنانی زمان، تەنیا لە ڕێگای فێرکردن و خووڕەوشت و تاقیکردنەوەکانی ڕابردوودا بە ئەنجام دەگات.

بەهەرحاڵ هەوڵەکانی چۆمسکی بۆ تێگەیشتنی چیەتی زەین و خەیاڵ و زمان، بۆ لای گشتی بوونەکانی زمانی ڕۆیشت و بەو شێوەیە خۆی لە نێوان سونەتی بیرخوازانەی فەلسەفەدا دۆزیەوە.

چۆمسکی لەگەڵ (ئەفلاتون و دیکارت و لایب لیتس و کانت و ئەرەستو و هابزو لاك و هیوم و ڤینگشتاین و کواین و دونالدسون)دا ڕوبەڕوو دەبوەوە.

شایەنی سەرنجە کە جیاوازی سەرەکی نێوان دوو ڕوانگەی عەقڵخوازانەو ئەزمونخوازانە لە ڕێژەی کاریگەری و پێگەی دوو مانای چیەتی[39] –(نەعمەتی ژینگەیی و دەرونی)– و سروشت[40] (شوێن) لە زانستی مرۆڤدایە. بەڕای چۆمسکی، منداڵ بەرلەوەی دەست بکاتە قسەکردن، ڕێزمان و بنەمای داڕشتنی ڕستەو زمان دەزانێت و سوود لەوانە بۆ فێربوونی ڕێزمان وەردەگرێت.

چۆمسکی لەگەڵ (ئەفلاتون و دیکارت و لایب لیتس و کانت و ئەرەستو و هابزو لاك و هیوم و ڤینگشتاین و کواین و دونالدسون)دا ڕوبەڕوو دەبوەوە

هەڵبەت پێویستە بڵێین کە منداڵ لەگەڵ توانای قسەکردنی بە زمانێکی تایبەتدا لەدایك نابێت، پێویستە ئەو سەرەتا فێری شتی زۆر ببێت و لە لایەنی فیزیکی و دەرونیەوە پێبگات، بەرلەوەی بتوانێ هەموو شارەزاییەکانی زمان وەدەست بهێنێت.

چۆمسکی کارەکانی تەنیا بە "دەستپێکردنێکی سادە بۆ لای تێگەیشتنی

گشـــتی و تـــەواوی بەشـــی دەوڵەمـــەندی تاقیکردنەوەکانی زمانی" دەزانێت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، هـەر ئـەم دەسـتپێکردنە سـادەیە، گۆڕانکارییـەکی گـەورەی لـە زمـاندا پێکـهێناوەو مانایـەکی نوێـی بـە بابـەتی زەیـن و چۆنیەتی کارکردنی بەخشیوە.

دوا وتە ئەمەیـە، ئەگـەر ئـەنجامی پرسـیاری سەرەکی چۆمسـکی دەربـارەی ئـەوەی کـە "زمـان چیـە؟" بـوو بـە هـۆی سـەرهەڵدانی شۆڕشـێك لـە بەشی زمانناسیداو کاریگـەری لەسـەر بەشـەکانی تـری زانسـتی مرۆڤایـەتی و سروشـتیدا کـرد، واتـە ئـەم جوڵەیـە، دەتوانـێ سـەرەتایەك بێـت بـۆ سەرهەڵدانی شۆڕشـێکی گـەورەتر دەربـارەی ئـەم پرسیارە سەرەکیە کە: "مرۆڤ چیە؟".

"بە ڕای چۆمسکی، ڕەنگە ئەم ڕێگایە بتوانێ لە پێشنیازو نەخشەی پڕ لە ڕاز و نهێنی و ئاڵۆزی زەین و هۆشی مرۆڤ، تێبگات و ئەو بنەمایانـەی بەسـەر کـارکردنی خـەیاڵدا کاریگـەرن، بخاتـە بەرچاوی هەموان".

بە هیوای ئەو ڕۆژە.

## پەراوێزەکان

*1-Chomsky, Noam.*
*2-Ferdinand de Saussure.*
*3-Cours de Linguistique generale.*
*4-Signifie.*
*5-Signifiant.*
*6-Sign.*
*7-Langue.*
*8-Parole,*
*9-Bbom field, Leonard.*
*10-Procedures.*
*11-Mentalistic.*
*12-Deep StruCture.*
*13-Surface Structure.*
*14-Wittgenstein.*
*15-Language Universals.*
*16-Innate or abstract ideas.*
*17-Haris, Zelig.*
*18-Met Rods in Structural Linguistics.*
*19-Descriptive explanations.*
*20-Synchronic Structure.*
*21-Generalive gramer.*
*22-Morphophonemics of Modern Hebrew.*
*23-Good man, Nelson.*
*24-The logical Sturture of Linguistic theory.*
*25-Transfonrmational analysis.*
*26-Journal of Symbolic Logic.*
*27-Mouton.*
*28-Syntactic Structures.*
*29-Lees, Robert.*
*30-Language.*
*31-Aspects of the Theory of Syntax.*
*32-Standard Theory.*
*33-Creativity.*
*34-Current Issues in Linguistic Theory (1964).*
*Aspects of the Theory of syntex (1965).*
*Topies in the Theory of Genevalive Grammax (1966).*
*35-Halle, Morris.*
*36-Cartesian Linguistics.*
*37-Empiricism.*
*38-Ratioalism.*
*39-Narture.*
*40-Nurture.*

## سەرچاوەکان

*Noam chomskey Critical Assessments, Volume III, Edited by carols Poatero*
*1-Chomsky's Revolution in Lingustics, Robert Sklar.*
*2-The Chomsky on revolution, Daniel yargin.*
3-کتاب ماه ژماره ( 46 و 47).
(ادبیات و فلسفه - 1380)

# گەڕان بەدوای حەقیقەتی وشەدا

• بهنام باوندپور
▪ لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

-رۆحێکی غەریب لەدارستانێکی تاریك دەچێت-
(پەندێکی ڕوسییە)

**وتەیەك**

(ئەم وتارەی بهنام باوندپور کەدەربارەی وەرگێڕانە، وتارێکی درێژەو ئێمە لێرەدا تەنها بەشێکمان لێ تەرجومە کردووە، چونکە بەشەکانی تری زیاتر دەربارەی هەندێ نموونەی وەرگێڕانە بۆ فارسی بۆیە فەرامۆشمان کردووە. چونکە بایەخێکی ئەوتۆی نییە بۆ خوێنەری کورد. بەڵام ئەم بەشەی کە لێرەدا تەرجومە کراوە بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ هەموو ئەوانەی تەرجومە دەکەن یان لەداهاتودا دەیانەوێت تەرجومە بکەن، هەروەها بۆ ئەوانەش کە دەیانەوێت ڕەخنە لەوەرگێڕان بگرن گرنگییەکی تایبەتی هەیە-وەرگێڕ).

**ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کەتیۆری وەرگێڕان لەدوای وەرگێڕانەوە دێت. هەموو ئەوەی کەوەرگێڕێك دەربارەی تیۆری وەرگێڕان دەیڵێت، شتێك نییە جگە لەئەزموونی خۆی کەلەکاری وەرگێڕانەوە هەڵیهێنجاوە، زۆر قورسە باوەڕ بەوە بکرێت کەڕەخنەگری وەرگێڕان، خۆی وەرگێڕ نەبێت. لەلایەکی دیکەوە تیۆری وەرگێڕان- بەپێی پێشینەی باسی وەرگێڕەکان- زۆر تازەیەو هێشتا وەڵامی وردو گشتگیری پرسیارە بنەڕەتییەکانی خۆی نەداوەتەوە، یان دەتوانین بڵێین کە لەواقیعدا هێشتا شتێك بەناوی تیۆری وەرگێڕانەوە -وەکو هونەر- وجودی نییە. ئەوەی کە هەیە چەند هەوڵ و قوڵبوونەوەکی جیاجیایە لەمبارەیەوە، ئەمەش ڕەنگە بۆخۆی یەکێك بێت لەوهۆیانەی کەسەقەتی وەرگێڕان زیاد دەکات و زیاتر کۆنترۆڵکردنی ڕووناکبیریانەی وەرگێڕان قورس دەکات و زەمینە بۆ وەرگێڕانی ڕووکەش و بێسەروبەر خۆشدەکات.**

کاری وەرگێڕێك، لەوێوە کەوەرگێڕەکە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ بابەتی وەرگێڕانەکەدا هەیە (لێرەدا دەبێ حەزو ئارەزوی وەرگێڕەکەش باسبکرێت) هەروەها لەوێوە کەخۆی زۆربەی کارەکانی بەتەنیایی ئەنجام دەدات و دەیەوێت بەتەنیایی ئەنجامی بدات، خەسڵەتێکی تایبەتی بەخۆیەوە دەبینێ و لەم ڕوانگەیەوە هیچ سیستمێکی تایبەتی و ڕێکوپێك بەتەواوی قبوڵناکات و پێوەرو ڕێساو تیۆرو شێوەیەکی مێژووی تایبەتی تیایدا ڕەنگ ناداتەوە. ئەگەر چەند شێوازێکی تایبەتی وەرگێڕانیش هەبن، ئەم شێوازانە بەرهەمی قۆناغە مێژووییەکانن، ئەو قۆناغانەی کەخۆیان بەرهەمی کاری وەرگێڕەکانی ئەو سەردەمە بوون. وەرگێڕ خۆی لەگەڵ بابەتی وەرگێڕانەکەیدا لەپشت مێزەکەیەوە بەتەنیایەو کەرەستەی کارەکەی بریتین لەئەزموون و گەنجینەی فیکری و هەستیی خۆی.

وەرگێڕان جۆرێکە لەگەڕان بەدوای حەقیقەتدا. ڕۆڵی وەرگێڕ گەڕانی بەردەوامە بەدوای حەقیقەتی وشەدا. ئەم گەڕانە بەلای کەمەوە لەدوو زماندا ئەنجام دەدرێ، بۆ بەڕاستی پێکەوەبەستنی دوو وشە، دوو ڕستە دواجار دوو ڕۆشنبیریی. وشەکان وەکو بونەوەری زیندوو لەڕۆشنبیریە جیاوازەکاندا، ژیانێکی جیاوازیان هەبووە، ئەوەی کەئێمە بەدوو واژەی هاومانا لەقەڵەمی دەدەین ڕەنگە دوو واژەی جیاوازبن. وشەکان لەڕۆشنبیرییە جیاوازەکاندا وەکوخڕە بەردەکانی دەریایەك، هەریەکەیان بەرێڕەوێکی مێژوویی–فەرهەنگی تایبەتیدا بەسیفەتی جۆراوجۆرەوە سفتبوون و فۆرمەڵەبوون. وەرگێڕان لەو ڕێڕەوە مێژوویی–فەرهەنگییەدا، لەبوونیادەکانی زماندا، لەغەم لێدەدات ئەوزمانەی کەژیاوەو پیربووە کە جاری وایە خۆی گەنج کردۆتەوەو شێوازەکانی ژیانی خۆی گۆڕیوە، بۆئەوەی توانای ژیانەوەی وشەو ڕستەو شیعرێك لەزمانێکی دیکەدا فەراهەم بکات.

وەرگێڕان بریتیە لەگەیاندنی شتێکی نامەفهوم و بریتیە لە چوونە ناو دارستانێکی تاریکەوە یان چوونە ناو ڕۆحێکی غەریبەوە هەروەها بریتیە لەگەشتێکی ئازاد بە نێو وشە تەمومژاویەکاندا لەودیو فەرهەنگەوە، بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی قسەی

وەرگێڕان جۆرێکە لەگەڕان بەدوای حەقیقەتدا.

شاعیرو ئامادەکردنی دیاریەکی تازە بۆ ڕۆشنبیری خۆماڵی. لەلایەکەوە دەبێ دان بەودا بنرێ کەئەوەی بەناوی (وەرگێڕان)ەوە لە سەر زمانی خەڵکە هونەر نییە. بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەوەی کەبەناوی وەرگێڕانەوە ڕۆژانە دەچێتە بازاڕی کتێبەوە لەبنچینەدا وەرگێڕان نییە. ئەوەی کەوەرگێڕان وەکو هونەر لەڕۆشنبیری و بونیادەکانی دوو زماندا لەپشتیەوەیەو بەڵام بەرهەمی سێیەم پێشکەش بەخوێنەر دەکات، ئەوە وەرگێڕانی چەند ڕەگەزێك لەڕۆشنبیری و کۆمەڵگای (ئەلف)ەوە دەگوێزێتەوە بۆ ڕۆشنبیری و کۆمەڵگەی (بێ). ئەمە بۆ خۆی جوانی هونەریی تێدایە بێئەوەی لەیەکێك لەدوو زمانەکەدا (دوو فەرهەنگەکە)دا نوقومبێت. وەرگێڕان چەند دیاریەك لەزمانی یەکەمەوەلەگەڵ دەهێنێ، بەڵام بەهەرحاڵ لەزمانی دووەمدایە

کەوەکو بەرهەمێکی ناوازە دەردەکەوێتو بەم پێیە دەبێتە بەشێك لەئەدەبی خۆماڵی (زمانی دووەم). ئەو روانینەی کەئەم بەرهەمانە لەپلەی دووەمدا دادەنێ دیدێکی میللی ترسناکە کەهیچ بنەمایەکی زانستی نییە. ئەوەی کەلەزمانی فارسیدا روودەدات ئەگەر بەهای هونەریی هەبێت ئەوە وەکو بەشێك لەئەدەبیاتی نەتەوەییو خۆماڵی ئێمە (مەبەستی ئێرانە)لەقەڵەم دەدرێت.

جاری واهەیە وەرگێڕانێك دەتوانێت دەورێکی باڵاتر لەو شتە ببینێت کەبە (ئەدەبی خۆماڵی)ناوی دەبەن. لیڤیۆس ئەندرۆ نیکۆس (شاعیری رۆمانی *204-285*پ. ز)یۆنانییەك بوو کەببوو بەلاتینیو بەوەرگێڕانی ئۆدیسەی هۆمیرۆس ئەم داستانەی کرد بە (سەکۆی بازدانی) ئەدەبی رۆمانی. ئەم وەرگێڕانە وردو کێشداربوو بەڵام لەهەمانکاتدا بەتەواوی وەرگێڕانێکی حەرفی نەبوو.

**جاری واهەیە وەرگێڕانێك دەتوانێت دەورێکی باڵاتر لەو شتە ببینێت کە بە (ئەدەبی خۆماڵی) ناوی دەبەن.**

لێرەدا ئێمە رووبەڕووی یەکێك لەکێشە بنەڕەتیەکانی وەرگێڕان دەبینەوە لەئێراندا: ئەوەی کەلە زمانی فارسیدا بەدەنی وەرگێڕانی لاواز کردوە، ناتەبایی مەعنای وەرگێڕانی بەشیعرنییە- بەمەفهومە گشتیەکەی- بەڵکو نەبوونی جوانی شاعیرانەیە. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە ناتەبایی مەعناش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، لەبەر ئەوەی شیعر لەخودی خۆیدا چەند مەعنایەکەو لەکاتی وەرگێڕانیدا بەشێوەکی روکەش‌و حەرفی، یان دەبێتە سەرەنێزەیەکی یەکلا یان لەبنچینەدا شایەنی خوێندنەوە نابێ. زۆرجارلەکاتی وەگێڕانی شیعردا بیانووی (ئەمانەت)شیعر دەکوژێ، بێئاگالەوەی کە ئەمانەت، واتا ئەمانەت تەنها لەمەعنادا- ئەویش بەمەعنا باوەکەی - نییە، بەڵکو ئەمانەتیشە لەفۆرم‌و جوانیدا. لەم جۆرە وەرگێڕانانەدا توانای قسەی شاعیر لەناو دەچێت، رۆح‌و فەزای شیعر جێگای خۆی بۆ بۆشاییەکی کوشندە چۆڵ دەکات‌و ئەوەی کەدەمێنێتەوە بێزاری خوێنەرە لەشیعری بێگانە. بەڕاستی وەگێڕانی لەم جۆرە چ سودێکی هەیە؟ کەپرسیارێکی بێ وەڵامی تر بۆ نەزانیمان زیادبکەین، وەرگێڕان دەبێ چەند هاوتایەك بۆ نیشانە زمانیەکانی زمانی بێگانە لەزمانی خۆماڵیدا بدۆزێتەوە، ئەمەش پێویستی بەهەوڵێکە کەئێمە لەقسەی رۆژانەماندا بەهەوڵی تەواو ناویدەبەین. دوو زمانی جیاواز دوو جوانی جیاواز بەرهەمدەهێنن، دوو جەزبەو دوو هەستی جیاواز دروستدەکەن، لەلایەکی دیکەوە دوو زمانی جیاواز دوو تێروانینی جیاوازیان هەیە بۆ جیهان. ئەمە دەشێت لەشیعردا لەچەند بەشێکی بچووکدا خۆی نیشانبدات، بەڵام ئەو پەڕی کاریگەریی خۆی لەجودایی لەسەر دەقی ئەسڵی‌و تەرجومەکراو بەجێدەهێڵێت. ئەرکی وەرگێڕ وێڕای دۆزینەوەی هاوتا وردەکانی نیشانە زمانییەکان بریتییە لەدۆزینەوەی بونیادێك کەبتوانێت رۆحی شیعر بگوێزێتەوە بۆ خوێنەر، وەرگێڕ دەبێت کورتترین مەودا لەگەڵ ئەندێشەی شاعیردا دروستبکات‌و

یارمەتی خوێنەری شیعر بدات بۆ ئەوەی بەهەمان شێوە بیربکاتەوە کەشاعیر ویستوویەتی بیری لێبکاتەوە. هەموو وەرگێڕانێکی راستەقینە دەبێت لەقاڵبە ئەسڵییەکەی بێتە دەرەوە، بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی تەواو ڕەها لەزمانی زووەمدا بتوێتەوە، دەبێت بەرگێکی نوێ لەبەربکاتو لەقاڵبی سێیەمدا دەربکەوێت. بەوردی ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە زۆر دژوارە، بۆیە پەنا بۆ چەند نموونەیەك دەبەم: لەکاتی وەرگێڕانی بۆرخیسدا، ئایا ئەوە بۆرخیسە کە دەبێت بگوێزرێتەوە بۆ زمانی فارسی یان زمانی فارسیە دەبێت بگوێزرێتەوە بۆ بۆرخیس؟ وەڵامی ئەمە بەکردەوە دراوەتەوە، وەرگێڕانی بۆرخیس لەلایەن ئەحمەدی میرعەلاییەوە بێئەوەی کەلەڕێڕەوی زمانی فارسی دەربچێت تاڕادەیەکی زۆر ئەرجەنتینییە. مرۆڤ حەزدەکات بڵێت لەو وەرگێڕانەدا جۆرێك تەبایی لەودوو ڕۆشنبیریەدا دەبینێتو وێڕای ئەوەی وەرگێڕانەکە لەزمانی دووەمەوە کراوە لەکاتی خوێندنەوەیدا بەباشی هەست بەبۆنو بەرامەی شێوەی داڕشتنی بۆرخیس دەکەین. وەرگێڕانی بۆرخیس لەنموونە باڵاو سەرکەوتووەکانە، کەبەپێی ئەوە دەتوانین قسە لەسەر گۆتەیەك بکەین کە ناوی (هونەری وەرگێڕان)ە. بەڵام دەپرسم کوان ئەو هەموو وەرگێڕانانەی بۆ بەرهەمەکانی ئەم نووسەرانەمان کردووە نێرڤاڵ، پوشکین، ئەدگار ئالان پۆ، لێرمانتۆڤ، بۆدلێر، بلوك..؟ وەڵامی هۆی کارتێ نەکردنی ئەم وەرگێڕانانە یارمەتییەکی زۆرمان دەدات بۆ دۆزینەوەی ڕێگا تازەکانی وەرگێڕان.

## وەرگێڕان هونەرێکی دژوارە

وەرگێڕان هونەرێکی دژوارە. لەلایەکەوە ئێمە دەمانەوێ لەکاتی خوێندنەوەی گۆتەدا بە فارسی، گۆتە بخوێنینەوە نەك فلانە وەرگێڕ، لەلایەکی دیکەوەو لەوێوە کەتێڕوانینی زمانی فارسیو ئەڵمانی بۆ جیهان لەیەکتری جیاوازە، ئێمە هەم گۆتە دەخوێنینەوە هەم هەندێ شتی تر، ئەم (شتی تر)ە دەشێ ئەو ڕەگەزانە بێ لەزمانو ڕۆشنبیری ئێمە کەدەمانەوێ بەیارمەتیان ئەو گۆتەیەی کەتێگەیشتنی قورسە بۆ زیهنی ئێرانی ڕوون بکەینەوە. جاریوایە ئەم ڕوونکردنەوەیە بەمەفهومی کورتکردنەوەی ڕستەیەك دێت لەکاتی گوێزانەوەیدا بۆ زمانی دووەم. ئەمە ئەرکێکە کەهەتا ئەگەر وەرگێڕیش ئەنجامی نەدات، خوێنەر بۆ خۆی جێبەجێی دەکات. خوێنەری بەرهەمی وەرگێڕاوو هەموو خوێنەرێك لەکاتی خوێندنەوەدا بەشێوەیەك وەرگێڕە، خوێنەری هەر بەرهەمێك ئەو بەرهەمە بۆخۆی ڕووندەکاتەوەو بەشێوەیەکی (هاوچەرخ) بەرهەمەکە دەخوێنێتەوە. چ کەسێ دەتوانێت بڵێت لەکاتی خوێندنەوەی (حافز)دا خۆی لەسەدەی هەشتدا دەبینێتەوە! ئەگەر کەسێکی واش هەبێ یان کێشەیەکی دەروونی جدی هەیە یان حەزی لەزانستی شوێنەوارناسییە نەك لە ئەدەب . لەڕاستیدا خوێنەر لەهەر سەردەمێکدا بەشێوەیەکی هاوچەرخ لەزیهنی خۆیدا نووسەر تەرجومە دەکات. ئەم ئەرکە بەهەوڵو بەرپرسیارێتیەکی گەورەترەوە لەئەستۆی وەرگێڕدایە. کردن بەنموونەو لەپێشدا هەڵبژاردنی زمان یان فلان کێشی شیعری سەردەمێکی تایبەتی لەمێژووی ئێران بۆ

وەرگێڕانی بەرهەمی کلاسیکی یان شیعری بێگانە تێڕوانینێکی زۆر ساویلکانەیە. لەبەرئەوەی کەهیچ گرەنتیەك نییە بۆ ئەوەی کەئەو قۆناغە مێژوویيانەو زمانەکانی و ئەو کێشە شیعريانەی لەو سەردەمانەدا هەبوون لەیەکەوە نزیك بووبن. لەوەرگێڕانی بەرهەمی هونەریدا پێوەر زمانو لەهجەی سەردەمە لەیەکچووەکانی مێژوو نییە بەڵکو زمانی خودی بەرهەمەکەیە. ئەم وەرگێڕانە حساب بۆ لێکچوونە مێژووییەکان ناکات بەڵکو حساب بۆ شێوازو کێشو دەنگدانەوەو ریتمو فەزاو مانا دەکات. هەرخوێنەرێك لەکاتی خوێندنەوەی شیعرێکی وەرگێڕراودا دەیەوێت شیعرێك بخوێنێتەوە. دەبێت هەرواش بێت. هەربۆیە وەرگێڕان نوسخەیەکی ترنییە لەدەقی ئەسڵی، بەڵکو خۆی دەقێکی سەربەخۆیە کە(پەیوەندییەکی نزیکی) لەگەڵ دەقی ئەسڵیدا هەیە، وەکو پەیوەندیی نزیکی شاعیر لەگەڵ سروشتدا.

ئەگەر باوەڕمان بەتاکێتی بەرهەمی هونەریی هەبێت، بەکردەوە ئەوەمان پەسەندکردووە کەوەرگێڕان بەرهەمێکی سەربەخۆیە کەئەگەر بیەوێ وەکو بەرهەمێکی هونەریی خۆی بنوێنێ دەبێت خۆی هونەربێت. ئەگەر بڵێین وەرگێڕان بەرهەمێکی هونەریی نییە– لەبەرئەوەی کەهەموو ئەوەی بەرهەمێکی هونەریی ویستویەتی بیڵێت نەیوتوە– بەڵکو ڕێگایەکە بەرەو بەرهەمی هونەریی، ئەوکاتە دەبێت دان بەوەدا بنێین کەبەرهەمی هونەریی خۆی بەرهەمی هونەریی نییە. کێ دەتوانێت ئەوە بڵێت یان گرەنتی ئەوەبدات کەنووسەری بەرهەمێك ئەوەی کەویستویەتی بیڵێت بەوردی وتویەتی و لەڕۆحەوە گوێزاویەتەوە بۆ وشە؟ ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەکرداری خوێندنەوەش ڕاستە. هیچ خوێنەرێك هەتا هیچ رەخنەگرێکێش ناتوانێت بڵێت کەهەموو وێنەو وشەو گەمە زمانییەکانی نووسەرێکی وادیوەو لێیان تێگەیشتووە کەلەسەر لاپەڕەکان هەن.

شیعر بریتییە لەبەرهەمی پەیوەندیی شاعیر لەگەڵ گەردوونو بووندا، شاعیر لەڕۆحەوە شتەکان تەرجومە دەکات بۆ وشە، وەرگێڕ لەوشەوە تەرجومەی دەکات بۆ وشە. بەڵام وشەی سەرەتا بۆ وەرگێڕ شتێك نییە جگە لەوڕۆحەی کەدەبێت بەرگێکی دیکە بپۆشێ و لەشێوەیەکی دیکەدا دەرکەوێت. وەرگێڕ لەوشەوە بۆ وشە تەرجومە دەکات، بەڵام ئەوە ئیجباری نییە کەوشەکەی وەرگێڕ لەوشەی زمانی یەکەم بچێت، بەڵکو دەبێت مەفهوم لەبەرامبەر مەفهومو ڕۆح لەبەرامبەر رۆحدا دابنێت. وشە بەلای وەرگێڕەوە قاڵبێکی زیندووەو لەریتمو دەنگدانەوەو مانا دروستبووە، نەك هاوتایەکی سادەی ناو فەرهەنگ. ئەوەی کەلەفەرهەنگدا لەوشەکە دادەماڵرێت، ژیانو رۆحی وشەکەیەو ئەرکی وەرگێڕ بریتییە لەژیان پێبەخشینو هێنانی رۆحێکی نوێ بۆنێو قاڵبی وشەکە.

دەتوانرێ کەم کەس بەدیبکرێ کەچێژ لەوەرگێڕانی وردو پڕ ئەمانەت، بەڵام بێڕۆحی (فاوست)ی گۆتە وەربگرێت کەلەلایەن خالا دکۆفسکییەوە کراوە بەڕوسی. بەڵام لەهەمانکاتدا بەوەرگێڕانی(زیندوو سروشتی)گۆتەو شکسپیر لەلایەن باسترناکەوە نەیەتە جۆشو خرۆش. وێڕای

ئەوەی کەوەرگێڕانی گۆتەو شکسپیر لەلایەن باسترناکەوە لەگەڵ دەقە ئەسڵیەکەدا وشە بەوشە تەرجەمە نەکراون. باسترناك لەوتارێکدا کەسەبارەت بەوەرگێڕانی دەقەکانی شکسپیر نووسیویەتی بەڕاستی تەئکید لەو مەسەلەیە دەکاتەوە کە (وەرگێڕان دەبێ وەکو دەقی ئەسڵی بانگهێشتمان بکات بۆ کاریگەریی ژیان نەك ئەوەی وەکو (بەرێکی زماننناسی)بێتە بەرچاو، ئەم ڕستەیە دیسان ئەو کێشەیەم بەیاد دەهێنێتەوە کەپێشان باسم کرد واتا ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە لە (ئەمانەت)کەلە زۆربەی وەرگێڕانەکانی ئەمڕۆدا بەرچاو دەکەوێت ئەم جۆرە (ئەمانەت)ە وەرگێڕان دەکات بەو بەری زماننناسییە، تائەوەیکە وەرگێڕان بچووك دەبێتەوە بۆ گفتوگۆی وەرگێڕ لەگەڵ خۆیداو رەنگە بەوگریمانەبێ کەئەوەی خۆی لێی تێگەیشتووە کەسانی تریش لێی تێگەیشتوون.

وەرگێڕان کارێکی روونکردنەوەیی رۆشنگەرانەیە. لەوەرگێڕاندا ئێمە ناو لەبێگانەیەك دەنێین کەماوەیەکی زۆر بێ ناو بووە، ئەم ناولێنانە (روونکردنەوە)یە دەشێ یان باری مەعنایی ئەسڵەکە سووك بکات یان شتێکی بخاتەسەر، بەڵام بەهەرحاڵ روونکردنەوەیەکە دەخرێتە سەر ئەوەی لەدەقە ئەسڵیەکەدا هەیە. ئەم مەسەلەیە بەلای کەسێکەوە کەئاشنایی لەگەڵ دوو زماندا هەیە مەسەلەیەکی روونو ئاشکرایە. مایەی سەرنجە کەلێرەدا فەرهەنگیش بەجۆرێك یارمەتیمان دەدات: مەعنای حەرفی کرداری (تەرجومەکردن) لە زمانی پۆڵەندیدا (روونکردنەوەیە) *Tlumaczyc* و لە زمانی روسیدا (تێپەڕاندن) و (جێگۆڕکێ)یە *Perevodit* لەزمانی فارسیشدا لەبەرامبەر کرداری تەرجومەکردن کرداری وەکو (گزارش دادن-خەبەردان)، (تفسیرکردن-روونکردنەوە)دێتە بەرچاومان . حەقیقەتێك لەم مانا حەرفیانەدا خۆی حەشارداوە. کاری وەرگێڕان لەڕاستیدا بریتیە لەگوێزانەوەو روونکردنەوە ئەمەش بەهیچ شێوەیەك لە خواستی ئێمە زیادناکات. بەڵکو سروشتی جیاوازو تایبەتی زمانەکان دەبێتە هۆی دروستکردنی وەزعێکی لەو جۆرە. بەهەرحاڵ هەر هاوتایەك لەزمانی دووەمدا وشەیەکە کەجیاوازە لەهاوتاکەی خۆی لەزمانی ئەسڵیدا. ئەم جیاوازییە دەشێ زۆر کەم بێتو هەندێ جار بگاتەڕادەی سفر، بەڵام لەسەدا سەد هەمان وشە نییەو هەرچەندە هەوڵبدەین کەئەمین بین دیسان ناتوانین بەتەواوەتی بگەینە (طبق الاصل)تەنها بەرهەمی هونەری (طبق الاصل)هەمان نووسخەی ئەسڵیەو هیچی تر. ئەگەر بمانەوێ لەباوەڕی شەعبی سەبارەت بەئەمانەت خۆمان دەرباز بکەین دەبێت وەرگێڕانی حافز بۆ ئەڵمانیو وەرگێڕانی خیام لەلایەن فیتیز جیراڵدو وەرگێڕانی حافز بۆ روسی لەلایەن ئافا ناسی فیت-ەوە توڕبدەین.

> **وەرگێڕان کارێکی روونکردنەوەیی رۆشنگەرانەیە.**

ئەگەر لەو نموونانەی سەرەوە ورد بینەوە. لەو پێناسەیە نزیك دەبینەوە کە وەرگێڕان بەدیهێنەری توانای سەرلەنوێ ژیانەوەی بەرهەمی هونەرییە. بەهەمان شێوە کە شاعیر توانای سەرلەنوێ ژیانەوەی سروشت لە وشەدا بەدیدەهێنێ، واتە توانای سەرلەنوێ ژیانەوە یان (ژیانێکی بالاتر)،

ئەم ژیانە باڵایە سەبارەت بە (سەدساڵ تەنیایی) ڕوویداوە، بەجۆرێك كە ماركیز خۆی وەرگێڕانە ئینگلیزیەكەی سەدساڵ تەنیایی لەدەقە ئەسڵیە ئیسپانیەكە پێباشترە.

بە سەرنجدان لەو ڕوونكردنەوانەی سەرەوە پێموایە ئیتر ئەو خاڵە ئاشكرایە كەوەرگێڕانی شیعر لەزمانی دوومەوە، لەڕاستیدا وەرگێڕانی دەقی ئەسڵی نییە، ئەم وەرگێڕانە –ئەگەر زۆر باشیش بكرێ– وەرگێڕانی نیشانە زمانیەكانو ڕیتمو دەنگدانەوەو فەزاو مەعنای شیعرێكی ترە لە ڕۆشبیرییەكی دیكەدا بەحساب كردن بۆ توانا زمانیەكانی، هەربۆیە بەشێكی زۆر لە وەرگێڕانەكانی ئێمە وەرگێڕانێك نەبووە لە شاعیرەكانەوە بەڵكو وەرگێڕانێك بووە لە وەرگێڕەكانەوە، ئەویش بەزۆری بەشێوەیەكی خراپو سەقەت، ئەگەر وەكو دوبارەكردنەوە لەوەرگێڕان بڕوانین ئەوا وەرگێڕان لەزمانی دووەمەوە دووجار دووبارەكردنەوەیە. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە حوكمی ئێمە سەبارەت بە(تاكێتی بەرهەمی هونەری ) ناگۆڕێ. وەرگێڕان لەزمانی دووەمەوە ڕێژەی سەدی هەڵەی وەرگێڕ لەگوێزانەوەی فۆرمومەعنادا هەرچی زیاتر دەكات، لەبەر ئەوەی وەرگێڕانی بەرهەمێكە كە جارێك لە قاڵبی ئەسڵی هێنراوەتە دەرەوە وبە سافی زمانی دووەمدا تێپەڕیووەو خۆی لەگەڵ ئیلتیزاماتەكانی ئەو زمانەدا گونجاندووە. تەرجومەی وەرگێڕێك لەوەرگێڕێكی ترەوە لەوە دەچێت كە شاعیرێك لەبری تەرجومەكردنی جیهان (پاز وتەنی ) شاعیرێكی تر تەرجومە بكات.

هەندێك باوەڕیان وایە كە وەرگێڕانی شیعری شاعیرێك بەتەنها یان وەرگێڕان لە شێوازوكەشوهەوایەكی ئەدەبییەوە، سەركەوتنی كارەكە مسۆگەر دەكات. ئەم جۆرە تێگەیشتنە وەكو پراكتیك كۆن بووە. چونكە یەكەم بڕیار لەسەر بەرهەمەكە دەدرێت نەك لەسەر مێژوو وكارو چالاكی وەرگێڕەكە دووەم وەرگێڕان جۆرێكە لەگۆڕینی زمان، مرۆڤ یان دەتوانێت زمانی خۆی بگۆڕێت لەو حاڵەتەشدا دەتوانێت كاری زۆر تەرجومە بكات یان ناتوانێت لەم حاڵەتەدا تەنها كەسێك كەدەتوانێت تەرجەمەی بكات خۆیەتی. وەرگێڕیش وەكو شاعیر لەهیچ كەسێكەوە نزیك نییە تەنها لەخۆیەوە نەبێت هەڵبەتە ئەمە بەمانای لەبەرچاونەگرتنی عەشقی وەرگێڕنییە بۆ شاعیرێك یان بۆنووسەرێكی تایبەتی، مەسەلەكە ئەوەیە كەبڕیاری لەپێشا دراو لەتیۆری وەرگێڕاندا بنەمایەكی زانستی نییەو زیاتر دەشێ بۆ بەرپرسی دەزگایەكی بڵاوكردنەوە كەدەیەوێت سەرجەم شیعرەكانی شاعیرێك چاپ بكات بایەخی هەبێت.

وتمان كەوەرگێڕان جۆرێكە لە (دووبارە كردنەوە )بەڵام ئەم دووبارە كردنەوەیە بەتاڵو بێهودە نییە، بەڵكو توانای ژیانەوەو جاری واهەیە ژیانێكی باڵاتر بەو شتە دەبەخشێ كەبۆ یارمەتی دانی ئێمە بۆ قوڵتر تێگەیشتن لەبوون پێویستە، ئەوشتەی كەنابێ یان نامانەوێ فەرامۆش بكرێ ئەگەر بەوردیو بەمانا فراوانەكەی بیر لەمەفهومی (دووبارە)كردنەوە بكەینەوە، ئەدەب هەمووی وەرگێڕانەو نووسەرانیش هەموویان وەرگێڕن. هەندێكیان دەزانن كەتەرجومە دەكەنو زۆریشیان

نازانن لەچییەوەو لەکوێوە تەرجومە دەکەن زۆریان قسەیەك یان بیرێکی زەمانی کۆن لەپەراوێزێکی مێژوودا دووبارە دەکەنەوە من لێرەدا مەبەستم لەناوەڕۆکی ئەو قسەیەی پاز نییە کەدەڵێت: شیعر بۆخۆی وەرگێڕانە، واتا وەرگێڕانی جیهان بەڵکو مەبەستم لەمەفهومی دووبارە کردنەوەیە بەو قسەیەی کەلەسەرەتای ئەم وتارەدا لەکتێبی پیرۆزەوە هێناومەتەوە(*)، ئەوەی جێگای سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کەقسەکەی پازیش بۆ خۆی تەرجومە (دووبارەکردنەوە)یەکە، وەك ئەوەی کەراستەوخۆ لەم رستەیەی نۆڤالیسەوە وەرگیرابێ کەدەڵێت: (دواجار شیعر هەمووی وەرگێڕانە)گەشتی ئازادو دوودڵی ئەم دێڕانە مەبەستی لەو وتەیەی نۆڤالیس نییە لەرێبازی هێرۆنیمۆس کەدەڵێت (هیچ شتێك نەوتراوە کەپێشان نەوترابێ)و ئەمەش خودی دووبارەکردنەوەیە (وەرگێڕان)ە بەئاگا یان بێئاگا بریتە لەو رستەیەی کتێبی پیرۆز کەدەڵێت( هیچ شتێکی تازە لەئارادانییە) بەهەمان شێوەش کەتەواوی ئەم وتارە شتێك نییە جگە لەوەرگێڕان.

شاعیر لەئەزموونەوە بۆ زمان، وەرگێڕ لەزمانەوە بۆ زمانو خوێنەر لەزمانەوە بۆ رۆح تەرجومەدەکات. بەمشێوەیە شیعر لەرۆحەوە دێتو پەیوەست دەبێتەوە بەرۆحەوە وەرگێڕانی ناشیرینو بێ رۆحی شیعرێك کەتەنها پشتی بەئەمانەت بەستووە توانای پێکەوە گرێدانی رۆحی خۆماڵیو بێگانەی نییە دوورێگا لەئارادایە یان وەرگێڕانی پڕ ئەمانەتو ناشرین کەهونەر نییە یان وەرگێڕانی پڕ ئەمانەت و جوان کەدەتوانرێ بەهونەر ناوبرێ قسەکردن لەسەر (وەرگێڕانی هونەری بەڵام نائەمین بابەتێکی ترەو پێویستی بەبابەتێکی سەربەخۆ هەیە)وەرگێڕان لەجۆری یەکەم بریتیە لەجێگیر کردنی وشەکان بەسادەییو پەروەردەکەری تێگەیشتنێکیبازاڕیانەیە سەبارەت بەئەمانەت کەتەواوی شیعرەکە کاول دەکات بێئەوەی پەی بەقوڵاییەکەی بەرێتو دەیکات بەپەیکەرێکی بێگیان بەم جۆرە تێگەیشتنە لەوەرگێڕان پرسیارە بێ وەڵامەکانی ئێمە زیاتر دەبنو پەنجەرەی ماڵەکانمان بەرووی رۆشنبیری بێگانەدا بەداخراوی دەمێننەوە. گرنگ نییە کەچەندمان تەرجومەکردووەو چەند تەرجەمە دەکەین، گرنگ ئەوەیە کەچۆن تەرجەمەدەکەین.

** نووسەر مەبەستی لەم قسەیەی کتێبی پیرۆزە کە دەڵێت (هیچ شتێکی تازە لەئارادا نییە) کە لەبەشێکی تری نووسینەکەیدا هێناویەتییەوەو تەرجومەمان نەکردووە، وەکو دەبینین لەم بەشەشدا هێناویەتەوە (وەگێڕ).*

سەرچاوە

گۆڤاری (کبود) لاپەرە *45-36* کە لە ئەوروپا بەفارسی دەردەچێت.

# فریشتە سامناکەکان

• سکۆت سیکلز
▪ لە ئینگلیزییەوە: بەختیار سابیر حەمە

(شانۆگەرییەکی یەك پەردەییە)

**ئەکتەرەکان:**

*بێن*/ تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبێت و کەسە مردوەکەیە.

*میراندا*/ تەمەنی چل ساڵێك دەبێت و ژنی بێنە.

*کارین*/ تەمەنی بیست ساڵێك دەبێت و کچی بێنە.

*ڕاندی*/ تەمەنی بیست ساڵێك دەبێت و دەزگیرانی کارینە.

*تای*/ تەمەنی (35) بەرەو ژورەو مێردی خوشکی بێنە.

*هێلین*/ خوشکی بێن و ژنی تایە کە پێشتر مردوە. (ڕۆڵی هێلین کەسایەتی کارین بەرجەستەی دەکات، بەڵام کەمێك گۆڕانکاری لە جلوبەرگ و سەروسیمایدا کراوە).

دیمەنەکە/ پرسەی بێنە: پێشوازیکردن و شتی تر.

کات/ پاییزە.

شوێن/ سەرشانۆ چۆڵە. گۆڕانی دیمەنەکە بەندە بە ڕوناکی و جوڵەوە.

**پەردە لادەدرێت و نمایشەکە دەستپێدەکات.**

ڕوناکییـەك وردە وردە لەسـەر ڕوخسـاری بێـن دەردەکەوێت کە لەسەر شـانۆ ڕاکشـاوەو مـردوە. دواتـر ڕوناکییەکـە هـەموو جەسـتەی بـە تـەواوی دەردەخات کە ئامادەکراوە بۆ ناشتن. ڕوناکییەکی تر میراندا پیشاندەدات کە جلی ڕەشی لەبەردایە. کـارین و ڕانـدی دەسـتی یـەکیان گرتـوەو بـە غەمبارییـەوە دێنـە نـاو ڕوناکییەکـەوە. تـای دێتـە لایـان و دەست دەخاتـە سەرشـانی میراندا. کـارین ڕوی بـۆلای بێـن وەردەگـێڕێت. بـە تێڕامانێکـەوە چـاوێك بـە سـەراپای جەسـتەیدا دەگـێڕێت و زەردەخەنەیـەکی کـەم دەیگرێـت. (ڕوناکییەکـە لەسەر بێن لادەچێت، تای لە ڕوناکییەکە دەچێتە دەرەوەو کەمێك دواتر ڕاندی و کارینیش بەدوایدا دەڕۆن و میراندا بـە تـەنیا جێدەهێڵـن. ڕوناکییەکـە لەسـەر مـیراندا نـامێنێت. (لـە شـوێنێکی تـردا ڕوناکییەك دەردەکەوێت و کارین دێتە ناویەوە).

*کارین/* (لەبەرخۆیەوە) باوکم گەلێك یادگاری بۆ بەجێهێشـتووم، بـەڵام کـاتێك بینیـم لـەم بەرگـە سپییەدا ڕاکشاوە، خۆشترینیان هاتەوە یادم.

(لـە شوێنێکی تـردا ڕوناکییـەك دەردەکـەوێت و ڕاندی دێتە ناوی)

*ڕاندی/* من و بێن هـەرگیز یـەکترمان نـەبینیبوو. لە تەلەفۆندا قسەمان کردبوو. باوکی خۆمی بـەبیر دەهێنامەوە کە ئەویش هەر مردوە.

(ڕوناکییـەکی تـر دەردەکـەوێت و تـای دێتـە ناوی، کارین دەچێت بۆ لای ڕاندی)

*تای/* (لەبەرخۆیەوە) کاتێك هێلـین مـرد ئـەم زۆر خەفەتی پێخوارد. لـە من زیـاتر خەفـەتی خـوارد. هەموو جارێك دەیوت پێش ئەوەی ژنی منی بێت، خوشکی ئەو بوە. بێن خێزانەکەی خۆی زۆر خۆش دەویسـت. ئەگـەر هەرچییـەکیش بوبێـت، زۆر خۆشی دەویستن.

*کـارین/* (بـۆ ڕانـدی دەدوێـت) زۆر خـەمی دایکممە. چەند ڕۆژێکە هیچی نەخواردوە.

*ڕانـدی/* بەڕاسـتە؟ ئـەم ماوەیـە زۆر لەگـەڵیدا نەبووین.

(میراندا دێتە نـاو ئـەو ڕوناکییـەوە کـە پێشـتر کارین بەجێی هێشتبوو)

*کارین/* ڕاست دەکەی. ڕەنگە ئێستاش هـەر بە دزییـەوە بچێت بۆ لای سەلاجەکە، وەك چـۆن ئـەو کاتانەی باوکم لەسەر ئیش بوو دەچوو.

(کارین دەچێت بۆ لای تای)

*میراندا/* (لەبەرخۆیـەوە) بێن مێـژوو نووسـێکی توندڕەو بوو. هـەندێك جـار سـەرم سـوڕدەما لـەو هـەموو وێنانـەی هـەمانبوو. ئـەو لـە زۆربـەیاندا هەبوو، لە ڕاستیدا پێم وا نیە تەنها سێ وێنەشمان هـەبێت کـە ئـەوی تێدا نـەبێت. لـە هـەمان کاتیشـدا زۆر لە خۆبوردو و یارمەتیدەر بوو.ماڵێکی خـۆش و کچێکی جوانمان هەبوو. ئەرێ بە ڕاست، کچێکی ڕوخۆش نییە؟ زۆر لە پـورە هێلینـی دەچێت، خـوا لێی خۆشبێت. کاتێك هێلـین مـرد زۆرم پێنـاخۆش بـوو، ئیتر تـای سـەردانی نـەدەکردین. لـە ڕاسـتیدا ئەو و بێن هـەرگیز باسیان نەدەکرد. خۆ دەزانیـت هـەندێك لـە براکـان چۆنـن لەگـەڵ خوشـکە بچکۆلەکانیاندا. هیچ کوڕێك تا سەر باش نییە. بە هەمان شێوە براکەی منیش لەو جۆرە بوو. سوێند

دەخۆم هەندێك جار زۆر لە باوك خراپترن. بە دڵنیاییەوە لەبیرم ناچێتەوە.

(راندی دەچێت بۆ لای میراندا)

*کارین بۆ تای دەدوێت/* هەرچەندە ماوەیەکی زۆریشە لێی دورکەوتومەتەوە، بەڵام وا هەست دەکەم مردنەکەی بۆشاییەکی گەورە لە مندا بەجێبێڵێت. وام بیردەکردەوە ئەو کاتێك بمرێت کە من و راندی منداڵمان بوبێت. ئەوانمان دەکرد بە پردێك لە نێوانماندا. نازانم هەروا ئاسان نییە جارێکی تر بریار بدەم قسە لەگەڵ باوکمدا بکەم. بە یارمەتی خۆت خاڵە وابزانم لە مەتبەخ منیان دەوێت.

(کارین لە روناکییەکە دەچێتە دەرەوە).

*راندی/* هەر کاتێك من و کارین بیر لەوە دەکەینەوە شتێك بکەین بۆ زەواجەکەمان، ترسێکی زۆر داماندەگرێت. بیر لەوە دەکەینەوە کە هەڵبێین. ئەمەش هەڵچونێکی رۆمانسیانەیە.

(کارین دێتە ناو روناکییەکەی میرانداو راندییەوە، هەوڵدەدات دان بە خۆیدا بگرێت و شڵەژاو دیارنەبێت. شتێك دەچرپێنێ بە گوێی راندیدا و زەردەخەنەیەك بۆ دایکی دەکات).

*راندی/* بە یارمەتی خۆتان.

(راندی دەچێتە دەرەوەو کارین دەچێتە روناکی سێیەمەوەو لەوێدا دەمێنێتەوەو لە پشتیەوە تای وەستاوە. تای لە شوێنی خۆیەوە قسە لەگەڵ میراندا دەکات).

*تای/* وەك تارماییەك وابوو، میراندا. کاتێك هاتمە ژورەوە وام هەست دەکرد هێلینم بینیبێ. (ئەمە دەڵێت و دەچێت بۆ لای کارین، بە دەم رێگاوە دەڵێت). وەك ئەوکاتەی زەواجمان کرد گەنج و بەخۆوە بوو. خەریك بوو بانگی بکەم، بەڵام سەیری کردم و وتی..

(کاتێك گەیشتبوە نیوەی رێگای نێوان خۆی و کارین، کارین ئاوری بۆ دەداتەوەو باوەشی بۆ دەکاتەوەو دەڵێت):

*کارین/* خاڵە تای.

(روناکییەکەی کارین و تای نامێنێت. کارین دەچێتە دەرەوە. تای بە دەم قسەکردنەوەو بە تاریکیەکەدا دەچێت بۆ لای میراندا).

*تای/* چاوی کارین لە چاوەکانی باوکی دەچێت. رەشێکی تۆخن، سەرنجت رادەکێشن. مەبەستم خراپ نییە. ئێستا نیازت هەیە چی بکەیت؟

*میراندا/* چی بکەم؟ماڵەکە پاك دەکەمەوەو خۆم فێری چێشت لێنان دەکەم و بازار دەکەم و پرسەش بۆ مێردەکەم دەگرم. زۆر بۆی دەپارێمەوە.

*تای/* پێویستی بەوە نییە.

*میراندا/* کاتێکی زۆری لەگەڵ خواپەرستیدا بردە سەر. هێندە باسی دینی دەکرد، دین ئەمەیەو دین ئەوەیە، کە لە باسکردنی دەبوەوە ئیسراحەتم دەکرد. ئەو قسانەش هەموو باسی سزاو پاداشت و پاکردنەوەی رۆح بوو. مێشکی پیاوی ئەخستە خوارەوە. دواجار کە چووم بۆ کەنیسە هێندە نابێت. من و کارین سەیری کورێکمان دەکرد بۆ ئەوەی شوی پێبکات. راندی کورێکی رێکوپێك نییە؟ زۆر کوری چاکە. بێن زۆر حەزی پێنەدەکرد، بەڵام دەشزانی ئەمە چۆنە.

*تای/* ئەزانم.

*میراندا/* خۆزگە هێشتا هەر بە نیازبن لە کەنیسە زەواج بکەن. زۆر زەحمەتە. من و بێن هەردووکمان حەزمان لە زەواجکردنە لە کەنیسە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شتێکی پراکتیکی (عەمەلی)مان دەوێت. بەهەرحاڵ لە تواناماندا نییە ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ سازبکەین. گوێ بگرە، ئەو چی دەوت منیش ئەوە دەڵێم، داوای لێبوردن دەکەم، تای لە خۆمەوە هەست بە هیلاکی دەکەم.

(تای یارمەتی میراندا دەدات لە ڕوناکییەکە دەچێتە دەرەوەو ڕوناکییەکە نامێنێ).

(ڕوناکییەك لەسەر کارین دەردەکەوێت کە لەسەر کورسییەك دانیشتوە. میراندا ڕۆبێکی حەمامی لەبەردایە دێتە ناو ڕوناکییەکەوە).

*کارین/* ئێستا چۆنی؟ هیچ خەوت لێکەوت؟

*میراندا/* لەوانەیە. خەبەرم بوەوە.

*کارین/* دڵنیام شتەکان بەرەو باشتر دەڕۆن.

*میراندا/* مەبەستت چییە؟

*کارین:* هیچ. خۆت دەزانیت. تەنیا تۆو خەوو خواردن و ئەم جۆرە شتانە. پێت وایە مەبەستم چی بوە؟

*میراندا/* نازانم. لە بیرم ناچێتەوە چەند لە باوکت تورەیت.

*کارین/* چیتر تورە نیم، تەنها کەمێك بێتاقەتم. چی لە تواناماندا بوو کردمان. ئەوەی نەکرێت ناکرێت. ویستم ئێوارە ئەم شتانەت هەمووی پێبڵێم. مێشکی خۆم بە شتێکەوە خەریك کردبوو، دواجار گەیشتمە ئەنجام. بیرم لە شتێك کردەوە.

*میراندا/* شتێکی باش؟ دەربارەی باوکت؟

*کارین/* بەلاتەوە سەیرە؟ ڕۆژێکی زستان بوو کاتێك -نازانم- وابزانم چومە سەر لکی قاپوتەکەی، ئەویش بردمیە دەرەوە بۆ حەوشەکەی پشتەوە. ئەوکاتە سەگمان نەبوو. تەمەنم هەر شەش حەوت ساڵێك دەبوو. بەهەرحاڵ، لە بەفرەکەدا خۆی دا بە زەویەکەداو دەستی کرد بە هێنان و بردنی قۆڵ و قاچەکانی. پاشان بە منیشی وت وابکەم. کاتێك منیش وامکرد هەستایەوەو یارمەتیدام منیش هەستامەوەو پێی وتم سەیربکەم بزانم چیمانکردوە. لەسەر زەویەکەو لە بەفرەکەدا دوو فریشتە هەبوو. یەکێکی گەورەو یەکێکی بچوك. هێندە شاگەشکە بووم بەو بەهرە هونەرییەی پێی بەخشیم کە چەند جارێکی تر ئەوەم دووبارە کردەوەو چەند کارینێکی ترم دروستکرد. پاشان چوینە ژورەوەو کاکاوی گەرم و کاستەری بۆ دروستکردین.

*میراندا/* باوکت ئەمەی لەگەڵ کردی؟

*کارین/* تۆش بەلاتەوە سەیر نییە؟ ئەمە وات لێدەکات بیربکەیتەوە کە چی ڕویدا. تۆ بڵێی ئەو پیاوەی منی فێری کاکاوی گەرم و فریشتەی بەفر کرد چی لێ قەومابێت؟

*میراندا/* یادگارییەکی زۆر خۆشە.

*کارین/* ئەمە بەشێکی بەنرخە لەو میراتەی بۆم بەجێماوە. مەتبەخەکە هەمووی پاککراوەتەوە. خاڵە تای میوانەکانی بەڕێکرد. هەمویان زۆر ڕێکوپێك بوون. ڕاندی ژوری دانیشتن و ژوری نانخواردنەکەشی پاکردۆتەوە. ماڵی پاك دەکردەوە، خواردنی ئامادە دەکرد. لەوە زیاتر داوای چی بکەم؟

*میراندا/* ئەمە پرسیارێکی گرنگە. بە ئاسانی بەسەریا تێ مەپەڕە.

*کارین/* بۆ تۆ هەرگیز لەوە زیاترت داواکردوە لە باوکم؟ هەموو کەس دەیزانی کە ئەو لەخۆبوردو و یارمەتیدەر دەربوو. ئەمڕۆ زیاتر لە سەد کەس ئەوەیان پێ وتوم، بەڵام ئەوە هەموو شتێك نیە، هەندێك جار بیر دەکەمەوە ئەڵێم تۆ بڵێی باوکم خۆی بەوەی زانیبێت.

*میراندا/* دەیزانی. ڕەنگە باوەڕم پێنەکەیت. دەیزانی خۆشەویستی و بەختیاری لە ژیانی خەڵکدا جێگەیان دیارە. تەنها لەناو ژیانی ئێمەدا نەیدەتوانی جێگەیەك بۆ خۆشەویستی و بەختیاری بدۆزێتەوە. هەرگیز ئەمەم پێنەوتوویت. تەنانەت خۆشم نەمدەتوانی بیر لەمە بکەمەوە. (ڕوناکییەك دەکەوێتە سەر لاشەی بێن) دوای ئەوەی هێلێن و تای هاتنەوەو پیرۆزباییمان لێکردن، گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان. خێرا دەستێکم بەسەر ماڵەکەدا هێنا. سەیرم کرد لەسەر کورسیەکەی خۆی دانیشتبوو. لەبیرتە، ئەو کورسیەی ئەها کاتێك ماڵەکەمان لە زریانە گەورەکەدا پڕبوو لە لافاو فڕێماندا. سەری داخستبوو. چاوی بڕیبوە زەویەکەی بەردەمی. ناچار بووم پرسیاری لێبکەم.

"چییە سەلامەتی؟"

*بێن/* بەداخەوە.

*میراندا/* بۆچی؟

*بێن/* ئەزانم خەڵك هەمیشە لەگەڵ کەسێکی گونجاودا خۆشەویستی ناکەن.

*میراندا/* من پێم وایە هێلێن و تای پێکەوە ئاسودە دەبن. ئەزانم گومانت هەیە، بەڵام..

*بێن/* ئەزانم توشی کێشە دەبن. هەرچەندە من لەگەڵ تایدا زۆر توندو کەللە ڕەق بووم، کەچی ئەو هەر هێنای. لەبەر ئەوە دەزانم خۆشی دەوێت.

*میراندا/* هێلینیش ئەوی خۆش دەوێت.

*بێن/* ئەوەی من مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە ئێمە هەموو کات ناتوانین ئەو کەسە بخوازین کە بە ڕاستی خۆشمان دەوێت، بە داخەوە.

*میراندا/* تێناگەم تۆ چی ئەڵێیت، بێن.

*بێن/* هیچ، تەنها ئەوەندە دەڵێم ئێمە بە یەکتر ڕازی بووین. ئەزانم ڕەنگە کەسێکی تر هەبێت کە تۆ خۆشت ویستبێت، بەڵام دواجار لەگەڵ مندا زەواجت کرد. تۆ زۆر دڵسۆزو نەرم و نیانیت. ناتوانم پێت بڵێم کە چەند مەمنونی ئەو دڵسۆزییەم. هیوادارم بتوانین لەوەش باشتر بین. پێت چۆنە ئەگەر بڕۆینە دەرەوە؟ ئوتومبێلێکی نوێی جوان بکڕین و بە ئوتومبێلە کۆنەکەی تۆ ئیش بکەین. کەڵکی نەماوە، ماوەیەکی زۆرە بەکاری دەهێنین. لە دوایشدا بە ئوتومبێلە نوێیەکە دەچین بۆ شوێنێکی خۆش و خواردنێکی چەوریش دەخۆین. ئەمشەو خەفەت لە هیچ شتێك مەخۆ. ها تۆ ئەڵێی چی؟

(ڕوناکیەکەی سەر بێن نامێنێ) (میراندا ئەم قسەیەی خوارەوە ئاراستەی کارین دەکات و تەواوکەری گفتوگۆی نێوان خۆی و کارینەو فلاش باکەکەی بێن کۆتایی پێدێت– وەرگێڕ).

*میراندا/* چی بڵێم؟ ئاگام لە خۆم نەمابوو. پێکەنین دەمگرێ کاتێك بیر لەو هەموو جارانە

دەکەمــەوە کـە دەتقیژانــد بەســەرمدا لەبەرئــەوەی زۆرم خۆشدەویســت. هــەموو جــارێکیش شــانم هەڵدەتەکاندو تــۆزێ گاڵتەشم پێدەکردی کە تــۆ شـــتی جیـــهانی زۆر دەخوێنیتـــەوە. هـــەموو جارێکیش پـۆزش هێنانەوەکـەی ئــەوەی بـە بـیر دەهێنامەوە هەر جارێك وتبێتی "خۆشم دەوێی" درۆی کردوە، یاخود لانی کەم ئەوەی ئەو وتویەتی بە مانای کەلیمە خۆشەویستی نەبوە. حەزدەکەم بزانیت کە تۆ لەو بۆچونانەتدا ڕاست بویت.

*کارین/* حەزم نەدەکرد وابێت.

*میراندا/* جارێکیان کەمێك هاتمەوە سەرخۆو بیرم کردەوە، باشە ئەگەر منی خۆش نەوێت ئەبێت کێی خۆش بوێت؟ ئەبێت ئەو کەسە کێ بێت؟ هەموو ئەو کەسانەم هێنایەوە پێشچاوی خۆم کە دەماننناسین، بەڵام خۆشت دەزانی دەرەنجامی ئەمە چی دەبێت. یەکەم جار گومان لە کەس ناکەیت و دواجاریش هەموویان دەبنە جێی گومان. قەت هیچ شتێکی لەم بارەیەوە بە تۆ نەوتوە؟

*کـــارین/* بـــاوکم هـــەموو جـــارێك دەیـــوت خۆشەویستی بابەتی منالان نییە.

(ڕوناکیەکـــە لەســـەر ئـــەوان لادەچێـــت و دەکەوێتە سەر تای و ڕاندی کە لەسەر کورسییەك دانیشتوە)

*تای/* ئێستاش هەر خەریکی وێنەگرییت؟

*ڕانـدی/* بـەڵێ. لـە ڕاسـتیدا ئێسـتا لـە ماڵــەوە کاردەکەم. هـەندێك پـارەم قـەرزکردووە تـا بتـوانم خۆم تاقیگەیـەك دابنێـم بـۆ شـتنەوەو چـاپکردنی وێنـەکان. ئێستا وێنە بۆ چەند هاوڕێیـەکی خـۆم دەشۆمەوەو چاپ دەکەم و ئەوانیش ئەو کەسانە دەنێرن بۆ لام کە دەیانناسن. ئیشکردن لە دەرەوە زۆر باشترە. ئەی تۆ خەریکی چیت؟

*تـای/* ئیشـم نییـە. هـەر لەماڵـەوە دانیشــتوم و سەیری تەلەفزیۆن دەکەم. بە هۆی زۆر خۆریشەوە کێشـم (*20*) پـاوەند زیـادی کـردوە. لــە ماڵــەوە دادەنیشـم سـەیری کەناڵـە خۆشـەکانمان دەکـەم. هەندێك جاریش دەگریم.

*ڕاندی/* بێن ئەمەی پێ خۆش بوو؟

*تـای/* ڕەنگە پێـی خـۆش نـەبوبێت، بەڵام ئـەو چ باکیـەتی؟ بـە نسـبەت ئـەوەوە مـن تەنــها مـێردی خوشکەکەی بـووم و هیچـی تـر. لـە دوای مردنـی هێلینـەوە زۆر بەکـەمی دەمبینـی. هـەرگیز هەسـتی نەدەکرد کە هەر بونیشم هەیە.

*ڕاندی/* ئینجا ئەمە باش بوو؟

(ڕوناکییەك دەکەوێتە سەر بێن)

*تـای/* زۆر باشـبوو. زۆر حــەزی دەکــرد خــەڵك ڕەوشتی جوان و ڕێکوپێك و مامەڵەی خۆش بێت. وەك ئـەوەی خـۆی لـەو لایەنانـەوە زۆر تـەواوبێت. حـەزی بـە هیـچ شـتێکی مـن نـەدەکرد. ئـەوەش خەتای من نەبوو چونکە پێش تەواوکردنیخوێندن سەفەرم کرد. دواتر کە خوێندنم تەواوکرد، من لەو بەهێزتر بووم. لـە کولیـە یـاری بۆکسـێنم دەکـرد، لەبــەر ئــەوە توانیــم هێلینــی لێ بســتێنم. لـــەم دواییانەشدا تەواو بو بوومە جێی سەرنج، چونکە دەستم دابوە شیعر نوسین. لە ڕاستیدا ئەوانەی من دەمنوسـین شـیعر نـەبوو. تەنـها چــەند ســەرنج و تێبینیـەك بوون لـێرە و لـەوێ لەگـەڵ چـەند بـیر و بۆچونێـك و ئـەو قســە نەســتەقانەی کــە خــەڵکی دەیکردن.

*بێن/* هیچ شتێکت لەوانە نەنوسیوە کە من وتومن.

*تای/* نەخێر

*بێن/* باشتر وایە نەینووسیت.

*تای/*کێشەیەك نییە. پێم وانییە هەرگیز شتێکی وا خۆش بڵێیت کە شایەنی ئەوە بێت بینووسم.

*بێن/* تۆ پێت وایە من بە خەیاڵمدا دێت ئەگەر (*B..M.O.C*)* منی بە دڵ نەبێت؟ یاخود تۆ؟ تۆ خۆت بە کەسێکی سەرنج ڕاکێش دەزانی، تای؟

*تای/* ئەگەر بڵێم بەڵێ، تۆ لێم دەدەی یا دەمکەیتە دەرەوە؟

*بێن/* جیاوازی نییە، چونکە تۆ...

*تای/* من چی؟ کەسێکی مەرغوب نیم یا ژنم نییە؟ هێلین پێی نەوتویت؟ من وامدەزانی ئێوە زۆر لە یەکەوە نزیکن. پێی وتم کە دەتوانێت هەموو شتێکت پێ بڵێت، ئەڵێی بەینتان بەو شێوەیە نەماوە؟

*بێن/* تۆ شایەنی ئەو نیت.

*تای/* قاچەکانم زۆر گەورەن یان یەکێك پێی وتویت وەك منداڵ دەستم کردوە بە لوتمدا؟

بێن/ تۆ وادەزانیت هەرکەسێك خۆت ئارەزوت بێت دەتوانیت خۆشت بوێت، بەلام وانییە، هەرگیز وانییە.

*تای/* ئەی چۆنە؟ بۆم ڕونبکەرەوە.

*بێن/* هەریەك لە ئێمە لەم ژیانەدا هاوبەشێکی ژیانی هەیە. هەندێك جار وا هەست دەکەین ئەو کەسەمان دۆزیوەتەوە، بەلام وانییە. هەندێك جار وا ڕێدەکەوێت کە ئەو کەسە نەدۆزینەوە یان کاتێك دەیدۆزینەوە کە کار لە کار ترازاوە. تۆ گاڵتەت بەمە دێ، بەلام بڕوام پێیەتی.

*تای/* بۆ تۆ شتێکی باشە.

*بێن/* هەروەها هێلینیش بڕوای پێیەتی. لە دڵی خۆیدا هەست دەکات کە موڵکی کەسێکەو کەسێکیش موڵکی ئەوە. هەروەها وەك من و تۆش زۆر چاك دەزانێت ئەو کەسە تۆ نیت.

*تای/* چۆن هەمووومان ئەمە دەزانین؟

*بێن/* چونکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

*تای/* بێن، تۆ کێشەیەکت هەیە، لە ڕاستیدا چەند کێشەیەك. با تێت بگەیەنم. من وەك هەندێك لە هاوڕێکانت نیم داری بیسبۆڵەکەم لێ ڕاوەشێنی بۆ ئەوەی بمترسێنی. پێش هەموو شتێك دارەکەت لێدەستێنم و هەموو گیانت دەشکێنم.

*بێن/* هەڕەشەم لێدەکەی؟

*تای/* تۆ ئەمە ناو ئەنێی هەڕەشە؟ گوێبگرە بێن، من هێلینم خۆشدەوێت. ئەویش منی خۆشدەوێت. ئەگەر ڕاست نەبین لە خۆشەویستیەکەماندا، لە خوا داواکارم کە ئەمە هەرگیز سەرنەگرێت و هەریەکەمان بە ڕێی خۆیدا بڕوات پێش ئەوەی وەك تۆ یەکترمان لەبەرچاو بکەوێت، بەلام ئەگەر ئێمە ڕاست بین و تۆ نەیەڵیت ئەو لەگەڵ مندا بە ئاسوودەیی بژی، خوا لەناوت بەرێت. ئێستا وابزانم زۆر چاك لە یەکتر دەگەین.

*بێن/* ئەی ئەگەر بە دڵی تۆ نەبوو چی دەبێت؟

*تای/* من هەڕەشەت لێناکەم بێن، ناشزانم چی دەبێت. هیوادارم بە خۆشی کۆتایی پێبێنین.

*کارین/* (لە شێوەی هێلیندا دێتە سەر شانۆ) تای بە یارمەتی خۆت دەتوانیت تا ئێرە بێیت؟ دایەو بابە دەیانەوێت قسەمان لەگەڵدا بکەن.

*تای/* هەر ئێستا دێم. (ڕودەکاتە بێن و پێی دەڵێت) هێلین منی دەوێت. (ڕوناکیەکە لەسەر بێن لادەچێت)

*ڕاندی/* خۆزگە بمتوانیایە وەك تۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا بکەم و بە زەبری کوتەك ڕازیم بکردنایە.

*تای/* چیتر پێویستت بەوە نیە. تۆ پێم بڵێ کەی زەماوەندەکە دەکەیت؟

*ڕاندی/* کێ دەزانێت؟ بە حساب بەهاری داهاتوو بوو، بەڵام ئەگەر ئێستا ببوایە ئەو هێندە خراپ نەدەبوو. لە هەموو ئەم وێنانەدا دەیبینم. هەموو کەسێك دڵی خۆشە.

*تای/* ئەو هیچ کاتێك باش نەبوە. کەسێکی زۆر مەزاجی بوەو زۆر خراپ پەروەردەکراوە. لە هیچ بۆنەیەکدا باش نەبوە، لەبەرئەوە هەموویان بە ناخۆشی ڕۆیشتون. نەیزانیوە چۆن دور لە توندوتیژی و کەللە ڕەقی بژی.

*ڕاندی/* کارین پێی وتم تاکە یادگارییەکی خۆش کە لە بیری بێت ئەو کاتە بوە کە فێری کردوە چۆن فریشتەکان لە بەفرەکەدا دروست بکات.

*تای/* بە داخەوە. تۆ ئەڵێی کێ فێری کردوە؟

*ڕاندی/* باوکی.

*تای/* ئۆو! شتێکی سەیرە مێژوو خۆی دوبارە دەکاتەوە. هەموو جارێك میراندا گازەندەی لا دەکردم -لە ڕاستیدا بۆی باس دەکردم- میراندا هیچ کاتێك گلەیی لە بێن نەکردوە. بەهەرحاڵ، پێی دەوتم کە بێن چەند تورە دەبوو کاتێك دەیزانی کارین جێی سەرنجی دەستە خوشکەکانیەتی. پێویست ناکات لەوە زیاتر لەسەری بڕۆین، من هێلینم هێناو ئێستا کارینیش شودەکات بە تۆ.

*ڕاندی/* زۆر چاکە با وابێت.

(ڕوناکیەك دەکەوێتە سەر کارین و میراندا کە دانیشتوە. ئەم گفتوگۆیانەی دواتر جیاوازن و بەم جۆرەن: گفتوگۆی نێوان کارین و میراندا گفتوگۆیەکە لە نێوان دایك و کچداو گفتوگۆی نێوان تای و ڕاندیش بیرو ڕا گۆڕینەوەیەکە سەبارەت بە چەند کێشەیەکی تایبەت بە خۆیان. شێوەی دەربڕینەکان زۆر ئاشکرایەو هەردولا بە هەمان شێوە قسە دەکەن).

*کارین/* لە ڕاستیدا ئەم زەواجە زۆر گونجاوە.

*ڕاندی/* زەواجەکەی من و کارین.

*میراندا/* بەڵام ئێوە یەکترتان خۆشدەوێت.

*ڕاندی/* خۆشەویستییەکەی ئێمە لەو جۆرە نیە کە هەموو ژن و مێردێك دەبێت یەکتریان خۆش بوێت.

*کارین/* بە دڵنیاییەوە، من بەبێ ئەو ناتوانم بژیم، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوە هەموو شتێك نیە بۆ زەواجکردن.

*ڕاندی/* منیش مەبەستم ئەوە بوو.

*میراندا/* کەواتە ئێوە بۆچی زەواج دەکەن؟

*ڕاندی/* چی وەڵام بەمەوە؟

*کارین/* لەبەرئەوەی هیچ کەسێکی تر ئێمەی خۆشناوێت.

*ڕاندی/* بێن یەکێك بو لەوانە.

*میراندا/* من تۆم خۆشدەوێت. خاڵیشت خۆشی دەوێیت.

*کارین/* تۆ من ئەهێنی دایە؟

*تای/* بێن گاڵتەی بەوە دەهات کارین شوبکات بە لوسکەڵەیەك.

*میراندا/* تۆ گەلێك هاوڕێت هەیە کە خۆشیان دەوێیت و گرنگیشت پێدەدەن. ئایا شودەکەی بەوانیش؟

*ڕاندی/* بە دڵنیاییەوە.

*تای و میراندا/* ئۆف خوایە، پێتان وایە پێکەوە ئاسودە دەبن؟

*ڕاندی و کارین/* پێم وایە، یەکترمان خۆشدەوێت و ڕێزی یەکتریش دەگرین. لە هەموو کەسیش چاکتر یەکتر دەناسین. لە ڕاستیدا، ڕەنگە زەواجەکەی ئێمە لە زوربەی زەواجەکانی تر درێژ خایەنتر بێت.

*تای و میراندا/* باشە ئەگەر دواجار کەسێك هاتە ژیانتەوە چی ڕودەدات؟ کەسێك کە خۆشت بوێت. کەسێك کە وا پێویست بکات خۆشت بوێت. ئەو کاتە ئەڵێی چی؟

*ڕاندی و کارین/* ئەو زەواجە بەردەوام نابێت.

*تای و میراندا/* بۆ نا؟

*راندی و کارین/* هەرگیز نابێت.

(ڕوناکییەك دەکەوێتە سەر بێن)

*کارین/* کاتێك ویستم بە باوکم بڵێم، بەم شێوەیەی ئێستاش نا، هەر ئەوەندە وتم ڕەنگە..

*بێن/* ئاخ خوای گەورە، بە کەسی ترت وتوە؟

*ڕاندی/* ئێ!

*کارین/* نەخێر.

*بێن/* بە هیچ کەس نەڵێیت، بە تایبەتی دایکت. چۆن دەتوانیت شتی وای پێبڵێیت؟

*ڕاندی/* لەوە ناچێت.

*کارین/* لەوە ناچێت بە ئانقەست ئەمەم کردبێت.

*بێن/* یارمەتیت ئەدەم. پزیشکێك ئەدۆزمەوە یارمەتیت بدا، ئەم جۆرە بیرکردنەوانە هەڵەن. دژی خواو دژی سروشتن.

*ڕاندی/* بۆچی خوای هێنایە ناو باسەکەوە؟

*کارین/* تەنانەت من کەسێکی ئیمانداریش نیم.

*بێن/* ڕەنگە ئەمە ئەو خاڵە بێت کە ئێمە تیایدا شکستمان هێنا. نایەڵم تۆش تووشی هەمان چارەنووس ببیت. خەڵك بۆیان هەیە تەنها لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا خەڵکانی تریان خۆشبوێت. ئەزانم هەندێك جار هەست و بیرو بۆچونەکانی خەڵك هەڵیان دەخڵەتێنن. ڕەنگە شتێکی جوان بێت کەسێکت خۆشبوێت ئەگەر ئەو خۆشەویستییە کەسی تر ئازار نەدات، بەڵام ئازاری دەدات. لەبەر ئەوەشە هەموو کەسێك ناتوانێت هەڵپەی ئەم لاولا بکات و شوێن ئەو شتە بکەوێت کە خۆی دەیەوێت. هەندێك جار ئەو شتە بێ هیچ هۆیەك دەبێت بە شتێکی هەڵە بێ ئەوەی هەڵەش بێت.

بەوپەڕی توانامەوە هاوکاریت دەکەم و پێویستیش ناکات کەس بزانێت چیت پێ وتوم.

*ڕاندی/* بەڵام..

*کارین/* بەڵام..

*بێن/* بەڵام چی؟ ئەتەوێت هەموو کەس بزانێت کە کەسێکی لاوازیت و سوك و ڕیسوا ببیت؟ هەموو کەس بزانێت کە لە ناخەوە هەڵەیت و دڵت

ڕۆحتی ژەهرخواردو کردوە؟ هەست ناکەیت ئەم ماوە زۆرەی ئەم نهێنیەت حەشارداوە کاریگەری خراپی هەبوە لە سەرت؟ زۆرم خۆشدەوێیت و هەرگیز نایەڵم شتی وات بەسەر بێت. (ڕوناکییەکە لەسەر بێن لادەچێت).

*ڕاندی/* کێ دەتوانێت گفتوگۆ بکات..

*کارین/* بەم شێوە مەنتیقیە؟

*میراندا/* بۆ یەکەم جار بە منت نەوت؟

*تای/* ئەگەر بەو قورسیە وەریدەگرت، بۆچی بە باوکت وت؟

*کارین و ڕاندی/* کاتێك شتێکی زۆر دەبیستی دەربارەی.

*کارین/* خۆشویستنی دراوسێکەت.

*ڕاندی/* تێگەیشتن لە کەسێك خۆی چۆنە ئاوها.

*کارین/* زۆر مرۆڤی چاك و خێرەومەندی.

*ڕاندی/* مەسیحی.

*کارین و ڕاندی/* هەرچییەکی تر ببیستی بڕوای پێدەکەیت.

(هەردوو ڕوناکیەکە نامێنێ و لە دوو شوێنی ترو بەرامبەر بە یەکتر دەردەکەونەوە بە شێوەی ڕاست و چەپ. میرانداو تای دەچنە یەکێکیانەوەو ڕاندی و کارینیش دەچنە ئەوی تریانەوە).

*میراندا/* منداڵەکان لە سەرەوەن خۆیان کۆدەکەنەوە. دەیانویست شەوێکی تریش بمێننەوە، بەڵام پێم وتن پێویست ناکات.

*کارین/* هەرچیەك هەبوو هەموویم بە دایکم وت.

*تای/* ئەبوایە بتوتایە.

*ڕاندی/* منیش شتێکم بە خاڵت وتوە.

*میراندا/* ئەو قسەو قسەڵۆکانە ئارامی لەبەر هەڵگرتبووم.

*تای/* ئاوا، من هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات.

*کارین/* وتی چی؟

*ڕاندی/* وا بزانم دایکت چی وت ئەویش هەر ئەوە. کە باسی فریشتەکانم بۆ کرد ئەم زیاتر حەپەسابوو.

*میراندا/* وای بۆ ناچم ڕاندی پێی وتبێتی.

*کارین/* کە بیر لەوە دەکاتەوە ئێمە چۆن ژیانێکمان لەگەڵ باوکمدا بردۆتە سەر، بەلایەوە سەیرە شتێکی مەعقول فێربوبێتم و بتوانم بیڵێم بە تایبەتی بیرکردنەوە لە خۆشیەکی ڕاستەقینە.

*تای/* ئەو پێی وتم. تەنانەت پێشی وتم کە کارین لەبیریەتی بێن فێری فریشتەی بەفری کردوە.

*کارین/* ئۆو، دەنا.

*تای/* ئەوە تاکە یادگاریی خۆشی کارینە لەگەڵ بێندا.

*کارین/* نەفرەتی خوای لێبێت. ئەمە بە تەئکید کاری خواکەی ئەوە. هیچ شتێکی تر هێندە دڵڕەق نیە.

*میراندا/* بێزار بویت، وا نیە. پێویست ناکات بەم شێوەیە خۆت سەغڵەت کەیت.

*ڕاندی/* چییە؟ چی بوە؟

*کارین/* ئەمەوێت یەك دەقیقە لەو یادگارییە لای خۆم گل بدەمەوە، یەك، تەنها یەك دەقیقە، کەچی ئەو فریشتانە لە سەهۆڵەکە دێنە دەرەوەو دەیبەنەوە.

*تای/* تێدەگەم. بەداخەوە.

*کارین/* ئەو نەبوو! تەنانەت ئەو نەبوو..

(کارین دەست دەکات بە گریان، ڕاندی دەیگرێتە باوەش. لە کاتێکدا میراندا دەست دەکاتەوە بە قسەکردن ڕاندی کارین هێور دەکاتەوە و پێکەوە سەر شانۆ جێدەهێڵن. ئەم کرداری هێورکردنەوەو بردنە دەرەوەیە پڕە لە سۆزو خۆشەویستی و موعاناتی دوو کەس دەردەخات کە لە نزیکەوە ئاگایان لە مەشاعیری یەکتر هەیە).

*میراندا/* من لەگەڵ تەنیایی و بێدەنگیدا ڕاهاتووم. بێن هەرگیز لە نیوەشەودا لە خەو هەڵنەدەستاو پرخەی پرخیشی نەدەکرد. بە هێواشی هەناسە دەدا. زۆر بە لامەوە سەیر بوو کە دەمبینی بە هێمنی خەوتوە. تەنانەت لەناو تابوتەکەشدا شڵەژاو دیاربوو. وا ڕاهاتبووم لەلایەوە ڕادەکشام و دیقەتم دەدا. هەندێك جار زەردەخەنە دەیگرت. قەت بە دەم خەوەوە قسەی نەدەکرد، لەبەرئەوەش نەمدەزانی بۆچی پێدەکەنێت. ئەگەر بمزانیایە چی لە خەودا هێندە دڵخۆشی دەکات، لەوانە بوو ئەو کاتانەی بە خەبەر بووین بمتوانیایە زیاتر دڵخۆشی بکەم.

*تای/* هێلین وا نەبوو. تەپاوتلی زۆر دەکرد. منیش کە دەخەوم جوڵە ناکەم. هەندێك جاریش لە نیوە شەودا خەبەری دەکردمەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی لەگەڵ بێندا دەنگیان دەهات.

*میراندا/* لەسەر چی دەنگیان دەهات؟

*تای/* خۆت دەزانیت. شتی هیچ و بێمانا. ئەو شتانەی لە بەینی خوشك و برادا هەیە.

*میراندا/* نەخێر، نازانم. هەندێك شت هەیە کە تەنها منداڵ نابێت بیزانن. لەسەرچی ئەوان..

*تای/* پێم وتی. هیچ..

*میراندا/* تای، پرسەم بۆ مێردەکەی خۆم گرت و دەشمزانی هەرگیز خۆشی نەویستبووم. ئەمە شتێك نەبوو خۆم بیزانم. خۆی پێی وتم، لە کاتێکیشدا پێی وتم کە خۆشی دەیزانی ناسکترین کاتی ئێمە بوو. من لەگەڵیدا کوڵ بووم. ئەمەوێت ئەوە بزانم کە دەبوو واز لە کێ بهێنێت. ئەو پیاوەم زۆر خۆشدەویست. مافی خۆشمە بزانم چ شتێکی نهێنی لە ئارادا بوە. تۆ ئەتوانیت پێم بڵێیت؟ زۆر ئاساییە ئەگەر نەتوانیت منیش گوێی نادەمێ، بەڵام ئەگەر بە ڕاستی بتوانیت..

(بێن و هێلین دەنگە دەنگیانە و قسەکانیان ڕون و ئاشکرا نابیستری)

*تای/* هەندێك جار کە لەسەر کار دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە گوێم لە ژاوەژاویان بوو، دەیانقیژاند بەسەر یەکتردا. کە گوێیان لە دەنگی ئوتومبێلەکە دەبوو بێدەنگ دەبوون، لەبەرئەوە هەرگیز نەمدەزانی لەسەر چی شەڕدەکەن. هێلین هەموو ڕوخساری فرمێسك بوو سوربویەوەو بێنیش لەولاوە وەستابوو سەری داخستبوو. جارێکیان کە هاتمەوە وەزعەکە زۆر خراپ بوو، تەنانەت تاکو لە ئوتۆمبێلەکەش دابەزیم، ئەوان هەر بەردەوام دەنگیان دەهات. لەپاڵ دەرگاکەدا وەستام، بەڵام ئەوان ئاگایان لە هیچ نەبوو.

(ڕوناکیەکە لەسەر تای کز دەبێت و ڕوناکیەکی تر دەکەوێتە سەر بێن. تای وەستاوە سەیری بێن دەکات لەگەڵ هێلین دا قسەدەکات. هێلین لە پشت پەردەوەیە)

*بێن/* نەفرەتت لێبێت. پێت وانیە من..

*هێلین/* (لە پشت پەردەوە) تۆ هەر دەیڵێیت و دەیڵێیتەوە! بەڵام نازانی من هەست بەچی دەکەم. (هێلین دێتە سەر شانۆ)

*بێن/* بێگومان دەزانم!

*هێلین/* دە کەوایە چارەسەرێك بدۆزەرەوە.

*بێن/* ئەتەوێت چیت بۆ بکەم، هێلین؟ هیچ شتێك نیە..

*هێلین/* ئەو کاتەی منداڵ بوین و لەژێر خانەکەدا خۆمان دەشاردەوە وا دەردەکەوت زۆر چاك ئەتوانیت بیر لە ڕێگە چارەیەك بکەیتەوە.

*بێن/* ئەوە تاوان بوو. ئەی مێردەکەت کە ئەڵێی خۆشم دەوێت؟

*هێلین/* دەمت داخە. خۆت دەزانیت ئەو هیچ پەیوەندییەکی بەمەوە نیە! ئەمە جیاوازە. ئەمە، ئەمە پەیوەندی بە من و تۆوە هەیە.

*بێن/* ئاخر لەبەر ئەوەیە ناتوانرێت هیچ شتێك بکرێت.

*هێلین/* کەس نەیزانیوە. خۆشت دەزانیت ئەگەر هەر شتێکیش بکرێت، کەس زەرەرمەند نابێت، بەڵام من بەم شێوەیە لە ناخەوە هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەم.

*بێن/* منیش هەروەها، بەڵام..

*هێلین/* باشە بیبڕەرەوە، بەس ئازارم بدە.

*بێن/* ئەمە تاوانەو لەبەرئەوەشە بە ئازارە. نابینیت؟ ناتوانین..

*هێلین/* ئەگەر تۆ وا هەستدەکەیت، هەر ئێستا ونبە لەبەرچاوم، ئەڵێم برۆ بۆ دۆزەخ.

(هێلین بە دەم هەنسکەوە بەرەو ڕوی بێن دەکەوێت بە زەویدا، هەردوکیان بە سکەخشکێ دەڕۆن بۆ لای یەکتر و باوەش دەکەن بەیەکداو دەست دەکەن بە گریان). (فلاش باکەکە تەواو دەبێت و تای دەست دەکات بە قسەکردن لەگەڵ میراندادا– وەرگێڕ).

*تای/* بە توندی دەرگاکەم دا بە یەکدا بۆ ئەوەی بزانن کە لەوێم. حەزم نەکرد بزانن دەمێکە گوێدەگرم. هەردوکیان بۆ ناوەڕاستی ژورەکەو بۆلای یەکتر چون. ویستم پرسیارێك بکەم، بەڵام بێن سەیرێکی کردم. چاوەکانی پڕبوون لە ڕق و پەشیمانی و حەسودی و ئیتر خۆت چی ناو ئەنێی بینێ. کاتێکیش ئەو ڕۆیشت، هێلینیش بە هەمان شێوە سەیری کردم. داوام لێکرد پێم بڵێ ئەو دەمەقاڵێیان لەسەر چی بوە، بەڵام وتی دوایی. هیچ کامێکیشمان هێندە بەغیرەت نەبوین تا جارێکی تر بچینەوە سەر ئەو مەوزوعە.

(کارین و ڕاندی دێنە سەر شانۆ)

*کارین/* دڵنیای لەوەی پێویستت بە ئێمە نیە بمێنینەوە؟

*میراندا/* پێویستە بڕۆن. لێرە هیچ شتێکی لێ نیە بۆ ئێوە جگە لە دایکێکی بۆڵە بۆڵکەرو ژەمەخواردنێك کە لە چێشتخانەی (دێنی)** یش بێت دەستتان دەکەوێت.

*ڕاندی/* چۆنت پێباشە با وابێت.

(ڕوناکیەك دەکەوێتە سەر بێن کە بە پێوە وەستاوەو پشتی لەمانە، تەنها ناوەناوە بۆ وەڵامدانەوە ڕویان تێدەکات).

*میراندا/* ویستم پێش ئەوەی بڕۆن بە تەنها شتێك بە کارین بڵێم، بەڵام لەبەرئەوەی منیش و تایش هەردووکمان هەموو شتەکانی ئێوە دەزانین

ئا لێرەدا دەیڵێم. ئەزانم هەستتان چۆنە بەرامبەر یەکتر. ئەوەی ئێوە دەیکەن جێی خۆشحاڵییە، بەڵام باوکتان مردوە، کەس نەماوە هیچ شتێکی بۆ بسەلمێنن. ڕاندی پێخۆشحاڵم کە تۆ زاوامی. لەبەر چەند هۆیەك حەزدەکەم زاوام بیت.

*کارین/* خۆمان دەزانین چی دەکەین و پێویستمان بە یەکترە، چۆن تۆش پێویستت بە باوکم بوو.

*میراندا/* ئەمەی ئێوە بەو شێوەیە نیە کە من باوکتم خۆشدەویست و خۆشت دەزانیت، بەڵام هیچ نەبێت هەردوکتان دەزانن. نامەوێت لەوە زیاتر قسە لەسەر ئەو شتانە بکەم، بەڵام تکایە، هەردوکتان، پێش ئەوەی هیچ شتێکی تر بکەن بیرێکی لێ بکەنەوە.

*کارین/* بیرمان لێکردۆتەوە.

*میراندا/* کەمێك زیاتر بیری لێبکەنەوەو واز لەو کەنیسەیەش بێنن، ئەوە دوا شتە کە پێویستتان دەبێت.

*تای/* باشتر وایە ئێستا بڕۆم، بەم شێوەیە لە کاتی لێخوڕینی ئوتومبیلەکەدا خەوم لێناکەوێت.

*کارین/* خاڵە تای، حەزدەکەم شتێکت پێبڵێم، ڕەنگە تۆ وا هەست بکەیت کە من نازانم تۆ چەند بۆ من گرنگی، بەڵام زۆر چاك دەزانم. هەموو کاتێك لە مێردی پورم زیاتر بوویت بۆ من. خەڵکیش چی دەڵێن با بیڵێن.

(کارین باوەش دەکات بە تای دا)

*تای/* بە قوربان منیش تۆم خۆشدەوێت، خەمت نەبێت سەردانتان دەکەم و ماوەیەکیش لاتان دەمێنمەوە. لە ڕاستیدا بیرم لەوە دەکردەوە کە وێنەیەك بگرین. وا بزانم ڕێگەمان ئەدەیت، ڕاندی؟

*ڕاندی/* زۆر ئاساییە. حەزدەکەیت کامێراشت بۆ دەهێنم.

*تای/* (بە میراندا دەڵێت) سەردانت دەکەم. ئاگات لە خۆت بێت.

*میراندا/* زۆر سوپاس. سەردانەکەت شتەکانی زیاتر ڕونکردەوە.

*تای/* ئەترسام وا نەبێت.

(دەچێتە دەرەوە)

*میراندا/* با بزانم ئێوە بڕیاری چیتان داوە.

*کارین/* ئێمە.

*ڕاندی/* ئێمە بەم زوانە سەر ئەدەینەوە.

*میراندا/* کارین، شتێك هەیە، نازانم ئەگەر حەزبکەیت بیزانیت یان نا، بەڵام هەرگیز باوکت، باوکت تۆی فێر نەکرد کە..

*کارین/* ئەزانم دایە. حەزم کرد درۆیەك بکەم تەنانەت ئەگەر درۆیەکی بچوکیش بێت چونکە هیچ نەبێت ئەو درۆیە خۆشییەکی پێدەبەخشیم، بەڵام ڕاستییەکە هیچ. دوایش بیرم کەوتەوە کە باوکم ڕقی لە بەفر بوە. لە باتی من سوپاسی خاڵە تای بکە.

*میراندا/* خۆشت سوپاسی بکە.

ئەملاولای یەکتر ماچ دەکەن و کارین و ڕاندی دەچنە دەرەوە. میراندا لە ڕوناکییەکەدا دەوەستێ و ڕوو ناکاتە بێن کە لە ڕوناکییەکەی خۆیدا وەستاوە ڕوی کردۆتە میراندا).

*میراندا/* ئێستا من چی بکەم ئازیزم؟ ئەو شتانەی کە تۆ نەت وتن. سوپاس بۆ خوا.

منالەکان پلانەکەی خۆیان پێ وتم. ئەگەر تۆ لێرە بویتایە لەوانە بوو شتێکی خراپ بقەومایە. خەیالّ نەکەیت تەنانەت یەك دەقیقەش هەبوبێت تۆم تیا خۆش نەویستبێت، بێن، چونکە ناتوانم. تورەم و ماندوم و هەستدەکەم وەك بینەرێکم لێهاتوە چونکە سەیری هەرلایەك دەکەم ڕوخساری تۆم لێوە دیارە. هەرگیز لە ژیانتدا بە وردی و لە نزیکەوە سەیری منت نەکرد کەچی ئێستا بە دە ملیۆن چاو دیقەتم دەدەی. چۆن دەتوانیت ئەوەم پێ بلّێیت؟ بێن، هیچ کاتێك هەستم نەکردوە دلّم بە هیچ شتێك خۆش بێت، بەلاّم ئیستا، من خاوەنی کەسایەتی خۆم بووم. حەزو ئارەزو و داواکاریشم هەبوو، هەمووی بوو بە قوربانی تۆ. خەتای خۆم بوو. زۆر خۆش دەبوو ئەگەر بۆ ساتێکیش بوایە ئەوەت بزانیایە. هەستدەکەم لەگەلّ وێنەکەی تۆدا خۆشەویستیم کردبێت. هەموو جارێك کارین دەلّێت ئەوە هەلّەیەکە زۆر کەسی تریش دەیکەن، بەلاّم بێگومان ئەو شتی جیهانی زۆر دەخوێنێتەوە، بۆ دەبێت نرخی زەواجەکەمان هەموو ئەو شتانەیە کە تۆ نەتکردن، بێن؟ بۆ تەنها یەك شت نەبوو، لە بەرامبەردا تۆش منت خۆش بویستایە. ئەو داوایە زۆر بوو بەلاتەوە ئازیزم؟ تەنانەت پێویستیشی نەدەکرد تۆ دەستپێشخەری بکەیت لە دەربڕینی خۆشەویستییەکەتدا. کاتێك منت خۆشویست، نکولّیم لەوە کرد کە تۆ بیر لە ژنێکی تر بکەیتەوە، بەلاّم لە ناخیشەوە دەمزانی کەسێکی ترت خۆشدەوێت. کەسێك کە تۆ خۆشت دەویست. ڕەنگە تۆ کەسێکی نەگونجاوت خۆش ویستبێت، بێن، بەلاّم خۆ هیچ نەبێت ئەو کەسە نەگونجاوەش لەبەرامبەردا تۆی خۆشویستوە. ئەو کەسەی من خۆشم دەویست ئەو لەبەرامبەردا منی خۆش نەدەویست. چۆن دەبێت ئەو کەسە هاوسەرەکەی خۆم بێت؟

(میراندا سەیری بێن دەکات، بێن ڕوی وەردەگێڕێت)

نەفرەتت لێبێت، بێن، ئێستاش وەك ئەو کاتانەی زیندو بویت هەر پشتم تێدەکەیت، ئێستا لێناگەڕێم پشتم تێبکەیت.

(بێن ڕوی تێدەکات، هەمان ئەو زەردەخەنەیە لەسەر ڕوخساریەتی کە نیشانەی لە خۆڕازیبوونی بوو وە لە هەموو وێنەکانیدا بەدیدەکرا).

تراژیدیای ژیانی من خۆشویستنی تۆ بوو. چی دەبوو ئەگەر تۆش بەختەوەرت بکردمایە؟ کارێکی وات کردبوو هەموو ئەو زەردەخەنانەش کە بە زۆر خرابوە سەر ڕوخسارمان لە هەموو شوێنێکدا وێنەی خۆتی تیا دیاربوو. ئەمەش وەك سەرابێك وابوو ئاواتە خوازبوویت ئەو کەسانەی پێ قایل بکەی کە لە نزیکەوە نەیاندەڕوانییە شتەکان. چی دەبوو ئەگەر کچێکی جوانت پێ ببەخشینایە کە تۆ پێت وابوو کەسێکی لاواز و نائاساییە؟ شتت بۆ دەکڕی بۆ ئەوەی قەناعەتی پێبکەیت کە تۆ باوکێکی باشی. ئەنجامی هەموو بەرتیلەکانت چی بوو؟ تەنها شتێکی خۆش کە دەربارەی تۆ لە بیری بێت ئەوە بوو، لە ڕاستیدا دەربارەی کەسێکی تر بوو. کەسێك کە تۆ خۆشت نەدەویست. بێن، بۆچی ڕقت لێی بوو؟ باشە چی دەبوو ئەگەر بیرت لە کەسێکی تر بکردایەتەوە؟ کێ سەرزەنشتت دەکات؟ هێلین ژنێکی شۆخ و شەنگ بوو. کارین

زۆر لـەو دەچێت و وردە وردە خەریکـە وەك ئـەوی لێدێت. بەرگـەی ئـەوە نـاگرم بیربکەمـەوە کـە ئـاخۆ ئەنجامی ئەمەش بەچی دەگەیشت. ئەگەر بشـزانین تۆ بویت کۆتاییت بە دەنگە دەنگەکە هێنا کاتێك هاوسەرەکەی گوێی گرتبوو، هەر جێـی خۆشـحاڵی نیە. دڵنیام لەوەی کە دەبوو لە جارێك زیاتر بڵێت "نەخێر". ئێستا هەردوکتان دەتوانن پێکەوە کاتی خۆتـان بەسـەربەرن و ئـامێری قیثـارە بـژەنن، پیرۆزبـایی لـە خۆتـان بکـەن بـۆ ئـەو خۆڕاگرییـە گەورەیـەتان. لـە هـەمان کاتیشـدا ئەوانـەی ئێوە لـە پاش خۆتان جێتان هێشتن دەتوانن بە ئاسـودەیی بژین، بە تەنها، و بـە ژمارەیـەکی زۆر وێنـەی تۆش دەورەدرابن.

(وەردە وردە ڕوناکییەکە لەسەر بێن نامێنێ)

بیرت لـە چـی دەکـردەوە، بینیـامین؟ بـیرت لـەوە دەکردەوە کە هەرگیز من نازانم؟ یا دەتزانی کاتێك بـۆم دەردەکـەوێت کـە کـار لـەکار تـرازاوە؟ نـاتوانم هیـچ بکـەم، بێـن. هیـچ. زوربـەی ژیـانی خـۆم بـە هاوسەری لەگەڵ بێن دا بردە سەر، هیچ شتێکی تر نـازانم. حـەزم دەکـرد منیـش ئێسـتا لەگـەڵ تـۆدا بمردمایـە، ئـازیزم. حەزدەکـەم ئێسـتا خـۆم بکـوژم، بـەڵام وا خۆشـم کوشـت، بـەو کـارەم کـێ هەڵدەخڵـەتێنم؟ ئـەوە شـتێکە هاوسـەرەکەی بێـن هـەرگیز نایکـات. لەبەرئـەوە جـارێکی تریـش ماڵەکەت پاك دەکەمەوە. لە کوێوە دەست پێبکەم؟

(پەردە دادەدرێتەوە)

## پەراوێز

*(B.M.O.C) کورتکراوەی (*Birmingham Mini Owners Club*).

**دێنی (*Denny's*) چێشتخانەو کافتریایەکی خێزانییە.

# ڕوباری گەرم

• ئێرسكن كالدوێل*
▪ له ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

كابرای شۆفێر هەر بەپاڵ پردەكەوە ڕایگرت، پردێكـــی پیـــادەڕۆ.. ڕوەو ئەوبـــەری ڕوبارەكـــە ئامـــاژەی بـــۆ كـــردم و ماڵەكـــەی پیشـــاندام. لـــە وێستگەوە تا ئێرە كە دوو میلمان بڕیبوو دەیكردە چواریـەكی كرێكـە.. دامـێ و لـە شـەمەندەفەرەكە دوركەوتمـەوە. كـە جێـی هێشـتم منـی تـەنیاو شـەوێكی تـەزیو و جریـوەی ئەسـتێرەكانی سـەر دۆڵەكەو ڕوبارێكی سـەوزی بـاوی پـان ماینـەوە.. ڕوبارێك كە لە ژێرەوە هەستم بە هەڵاوە گەرمەكەی دەكرد، بە چوار دەوریشما چیا سەركەشەكانی نێو ئەو شـەوە لـە چەند پەڵەهەورێكی ڕەش دەچوون. ئەگەر ڕێك سەیری ئاسمانم نەكردایە ڕەنگدانەوەی پرشنگی كاڵی ئەو زەردەپەڕەی دوای خۆركەوتنم نەدەدی.

هاوكـات لەگـەڵ هـەنگاوەكانما پردەكـە دەیقریشـكاند، ترپـەی هـەنگاوەكانم نقومـی نێـو چریك و هوڕو لەرزەلەرزی پردەكە دەبوون. ئەگەر بە پەلـە هـەنگاوم نەنایـە نـەمدەتوانی خـۆم بگـرم چونكێ پردەكە سەربەستانە لەمبەرەوە بۆ ئەوبەر ڕایدەژەنـدم، كـە دواجـار توانیـم ئـەودیو ببینـم.. سـەیرم كـرد بنـاری شـاخێك ڕك و ڕێـك تـا گـوێ ڕوبارە گەرمەكە داخزاوە، توند هەگبەكەم خستە بن باڵ و تا گۆڕم تیا بوو.. ڕامكرد.

هەتا ئەو حەلەش.. دوای ئەوەی كە كەوتمە سـەر ڕێیـەكی بـەردەڵانیش هـەر دەترسـام. مـن دەمزانی ئەگـەر ڕۆژ بوایـە بـێ تـرس و دڵـەڕاوكێ یەكشـەق لـە پردەكـە دەپەڕیمـەوە، بـەڵام لـەو شەوەداو لە دەوروبەرێكی ئاوا سەیرو ناشارەزا.. كە بە هەر چوار دەورمدا شاخی ڕەشباو لوتكەیان لـە ئاسمـان دەژەنـدو لەژێریشـەوە خوڕەمـی ڕوبـارێكی سـەوزو بـەربڵاو.. وایـان لێكـردم بەروەسـتی لەرزەلـەرزی هـەردوو دەسـتم

نەیەم و لەناوەوەش دڵی بێ ئۆقرەم سینەمی دەکوتا.

هەر زۆر بە ئاسانی ماڵەکەیانم دۆزیەوە. پێکەنینم بە خۆم هات کە ئاوا بەتاو لە ڕوبارەکە دورکەوتمەوە، هەر دوای پەڕینەوە لە پردەکە یەکەم ماڵ، خۆی، بوو، هەتا گەر وێڵیش بوومایە "گریشن" هۆ لەوێ وەستابوو بانگی دەکردم، بە ناوی خۆم بانگی دەکردم.. هاواری ئاشنای بە گوێم وای لێکردم تەریق ببمەوە.. شەرمی ئەوە بمگرێ کە لە چیاو خوڕەی ڕوبار ترساوم.

بە ڕاکردن غڵ بۆوەو لەسەر ڕێگە بەردەڵانیەکە پێشی لێگرتم.

"ها -ریچارد- لەسەر پردەکە ترسایت؟" پەرۆشانە ئەمەی وت و بەهەردوو دەست قۆڵی گرتم، بەنێو بەردەکاندا ڕووەو خانوەکەی بان هەورازەکە بەکێشی کردم.

"ڕاستیت دەوێ -گریشن- ترسام.. بەڵام بەهیوام کە لەو ترسە ڕزگارم بووبێ.."

"ئەوە حاڵی هەموو کەسێکە.. یەکەمجار، بەڵام کە جارێك پیاتێپەڕیت.. هەر لەوە دەچێ بەسەر گوریسێکی توند بەستراودا هەنگاو بنێی. من کە بچکۆلە بووم بەو یاریە ڕاهاتبووم.. لە گەنجینەکەدا گوریسێکمان هەڵدەبەست.. ئەی تۆ ریچارد.. وات نەدەکرد؟ بیرمە لەمبەرەوە بۆ ئەوبەر گوریسێکمان ڕایەڵ دەکرد.."

"منیش ئەو بەزمەم کردوە. بەڵام دەمێکە.. کێ بیری ماوە؟".

گەیشتینە پێپلیکانەکان و ڕووەو هەیوانەکە سەرکەوتین. گریشن ڕووەو دەرگاکە پەلی گرتم. یەکێك بەخۆو بە چرایەکەوە ڕووەو هۆڵەکە دەهات، پرشنگی چراکە دونیای ڕۆشن کردەوەو هەردوو خوشکەکەی "گریشن"م لەناو دەرگا وازەکەدا بینی کە وەستابوون، گریشن بە هەردووکیانی ناساندم:

"ئەمەیان "ئانا"یە.. خوشکی چکۆلەم.. ئەوەشیان ماریە".

لەناو ئەو تەنکە تاریکیەدا هەردووکیانم دواند، ڕووەو هۆڵەکە ملمان نا، باوکی -گریشن- لەتەك مێزێکدا وەستابوو.. لاتەریك و دوور لە خۆی و بەلایەکدا چراکەی ڕاگرتبوو تا بتوانێ جوانتر دەموچاوی من ببینێ، پێشتر قەت بە دیداری یەکدی شاد نەببووین.

ئەوەش باوکمە.. لەوە دەترسا تاریکی بوارت نەدا ماڵەکەمان بدۆزیتەوە".

"ڕاستی من ویستم بە چرایەکەوە بەرەو پیریت بێم، بەڵام گریشن وتی کە تۆ بێ کۆسپ و تەگەرە دەگەیت. خۆ بزر نەبوویت؟ زۆر سانا بوو.. دەمتوانی تا خوارەوە بە چرایەکەوە بێم".

بە دەم تەوقەوە دەستیم ڕاوەشاندو پێم وت کە من زۆر بە ئاسانی ماڵەکەیانم دۆزیەوە.

"ڕاستی کابرای شۆفێر لەوبەری ڕوبارەکەوە ماڵەکەی بۆ هەڵدام، چاوم لە تروسکایی ناو ماڵەکەتان نەدەتروکاند، ئەو تروسکاییە نەبوایە لەوەدا بوو لەو خوارەوە بەم تاریکیە ڕێ لە خۆم هەڵە کەم.. ئەوساش ڕێك دەخزامە نێو ڕوبارەکە".

لە سۆنگەی ئەوەی وا لەو ڕوبارە ترسابووم باوکی گریشن قاقا تریقایەوە.

"نا.. هەق نیە.. نەدەبوو وا سەغڵەت بیت. ڕوبارەکە شلەتێنە، هەتا زستانانیش.. لە ڕۆژانی بەفرو زوقمیشدا ئەم ڕوبارەی ئێمە بەقەد ژورێك گەرم و خۆشە. ئێمە هەموو شەیدای ئاوی ئەو ڕوبارەین".

گریشن کە هێشتا دەستی لەنێو دەستما بوو.. هەڵیدایە:

"نا.. ڕیچارد.. دڵنیابە نەدەکەوتیتە ڕوبارەکەوە، هەرکە لە شەمەندەفەرەکە دابەزیت من تۆم بەدی کرد.. یەك هەنگاوی خوارت هەڵنایە من بە ڕاکردن لەلات بووم".

حەزم دەکرد لەپای ئەو قسەیە سوپاسێکی گریشن بکەم، بەڵام کاتێکم زانی ڕوەو ژورێکی سەرووتر پێپلیکانەکانی بڕی و بانگی کردم، هەگبەکەم پێش خۆم داو دوای کەوتم. چرایەك لەوپەڕی هۆڵەکەو لەسەر مێزێکی نزم کز دەسوتا.. هەڵیگرت و بۆ یەکێ لە ژورەکانی لای پێشەوە ملی نا.

بۆ ساتێك وەستاین و لێکدی ڕاماین.. هەردوو بێدەنگ. "ڕیچارد.. ئاوی ناو ئەم سوراحیە پاکە. هەرچیەکی دیکەت پێویست بوو تکایە پێم بڵێ. وا بزانم هەموو شتێکم بۆ داناویت.. هیچ پێویستیەکم نەبواردوە". "چاکە گریشن.. دڵنیابە.. هیچی دیکەم ناوێ. ئەوەندەم بەسە کە لێرەم و لەگەڵ تۆدام.. هیچ شتێکی دیکەم ناوێ".

خێرا نیگایەکی کردم، پاشان چاوەکانی داگرت، هەردووکمان چەند چرکەیەکی دیکەش بێدەنگ وەستاین.. ئا لەو ئانوساتەدا هەردوکمان نەماندەزانی چی بۆ یەکدی هەڵڕێژین. ویستم پێی بڵێم کە چەندە شادم کە ئێستا وا بەیەکەوەین، هەتا گەر بۆ تەنها شەوێکیش بێ، بەڵام زانیم کە تۆزێکی تر هەر دەبێ ئەم ڕازەی لا بدرکێنم. گریشن چاك دەیزانی من بەو نیازە هاتووم.

"ڕیچارد.. چراکەت لا جێدێڵم، لە خوارەوە.. لەبەر هەیوانەکە چاوەڕێتم.. کە تەواو بوویت زوو وەرە خوارێ" ئان و سات لەبەرچاوم نەما، بەرلەوەی فریای ئەوە بکەوم چراکەی بۆ ڕابگرم تا لەسەر پێپلیکانەکان جوان بەرپێی خۆی ببینێ.. دەستم گەیاندە چراکە.. ئەو لە خوارەوە بوو.

گەڕامەوە ژورەکەم و دەرگام داخستەوە، دەست و دەموچاوم شۆری.. بە ئاو و سابون تۆزو گەردی ڕێگام شۆری، بە فڵچەیەکیش خۆڵی نیشتوی سەر جلەکانم داتەکاند، چەند خاولیەکی دەستکرد بەسەر عەلاگەیەکەوە بوون، یەکێکیانم ڕاکێشاو دەموچاو و دەستەکانم پێ وشك کردەوە.. قژم داهێناو پاشان دەرگام کردەوەو "گریشن" خۆت بگرە هاتم.

هەردووکیان لەبەر هەیوانەکە چاوەڕێم بوون، کە ڕوەو دەرگاکە هەنگاوم نا باوکی لەبەرم هەستاو لە نێوان خۆی و کچەکەی کورسیەکی بۆ دانام، گریشن کورسیەکەی بەلای مندا خزاند.. تا دەستی بەر باسکم کەوت.

باوکی کورسیەکەی وا وەرسوڕاند کە ڕوی بکەوێتە من و پاشان لێی پرسیم: "ڕیچارد.. دەڵێی ئەوە یەکەمین جارتە ڕوو بکەیتە ئەم هەرێمە شاخاویە؟"

"ڕاستی بە سەد میلیش نزیك ئەم ناوچەیە نەبوومەتەوە گەورەم.. سەبارەت بەم دەوروبەرەش دونیایەکی نائاشنایە بە مـن، بـەڵام وابـزانم جەنابیشت بە کەنار دەریاکەی لای خۆمان نائاشنای.. وانیە؟"

گریشن هەڵیدایە: "ئـۆە.. بـەڵام بـاوکم لـە "نۆرفۆك" ژیاوە.. وانیە باوکە؟".

"نزیکەی سێ ساڵ لەوێدا ژیاوم"

شتێکی تر مابوو بیڵێ، هەردووکمان چاوەڕێ بووین بیدرکێنێ. گریشن بە چرپەوە پێی وتم: "باوکە وەستایە.. سەبارەت بە میکانیکی شەمەندەفەر کارامەو لێزانە.. لە وەرشەکانیشی دەست بەکارە"

پاش قەیرێ وتی: "بەڵێ.. من لە زۆر هەرێمی جۆراوجۆر ژیاوم، بەڵام بۆ مانەوەم حەزم لێرەیە.."

یەکەم پرسیار کە بە خەیاڵمدا هات ئەوە بوو کە بۆ پتر حەز بەم ناوچە شاخاویە دەکات، بەڵام کتوپڕ هەستم بەوە کرد کە باوکەو کچەکەی بە ڕادەیەکی زۆر سەیر بێدەنگ و داماون. ناچار بە خامۆشی هەردووکیان منیش ڕامام.

زۆری پێنەچوو کەوتەوە قسە، بەڵام نەك بۆ من یان بۆ گریشن-ی کچی، بەڵکو لەوە دەچوو لەو بەرهەیوانە بۆ کەسێکی دیکە ڕازی دڵی بدرکێنێ، کەسی چوارەم کە من نەمدەتوانی لەنێو تاریکی شەوێکی ئاوادا بیبینم. چاوەڕێ بووم، گرژو بێ ئۆقرەو هەڵچوو.. چاوەڕێی ئەوەی ڕازی پەنهان بدرکێنێ.

گریشن چەند قولانجێکی دیکە کورسیەکەی بەلای مندا خزاند، بەڵام نەرم و لەسەرخۆ.. بێ هەراو خشەخش. هەڵاوی گەرمی ڕووبارەکە بەرزدەبۆوەو وەك بەتانیەك لەو شەوە تەزیوەدا هەرسێکمانی دادەپۆشت.

"دوای ئەوەی هەردوو کچەکەی تر بەجێیان هێشتین.." ئەمەی وت و بەسەر هەردوو ئەژنۆکانیدا خۆی لار کردەوە.. نیگاکانیشی بەسەر ڕووبارە سەوزو پانوپۆڕەکەدا هەڵدەفڕین.. بە ئاستەم لێی حاڵی دەبووین.

"بەڵێ.. کە دایکیان نەما گەڕامەوە نێو ئەم چیاوچۆڵە، نەمتوانی لە "نۆرفۆك" بمێنمەوە، بگرە "بالتیمۆر"یشم لێ خۆش نەدەهات. لە هەموو دونیادا هەر لێرە ئارام و ئاسودەم. هەڵبەت گریشن یادی دەکاتەوە، بەڵام هیچ کامتان ناتوانێ لە حاڵی من بگات. من و دایکی هەر لێرە لەدایك بووین، نزیکەی بیست ساڵیش دەنێو ئەم شاخانەدا پێکەوە ژیاین. لە پاش مەرگی لێرە نەمام و دوورکەوتمەوە، نەفام بووم.. وام دەزانی دەتوانم لەبیری خۆمی بەرمەوە، بەڵام نەخێر.. زۆر هەڵەو یاغنیش بووم. هەڵبەت هەڵە بووم.. پیاو ناتوانێ دایکی منداڵەکانی لەیاد بکات.. هەتا گەر بشزانێ جارێکی دیکە هەرگیز چاوی بە چاوی ناکەوێتەوە.

گریشن زیاتر لێم نزیك کەوتەوەو خۆی بەلای مندا خست، لە تەنیشتەوە نەمدەتوانی چاو لەو لاڕوومەتەی بتروکێنم.. ئەو لا ڕومەتەی تاریکی ببوە چوارچێوەی. ڕووبارەکەش بێ نرکەو ناڵە، بەڵام هاڵاوی گەرمی دڵنیای دەکردم کەوا هێشتا بە خوڕەو هۆ وا لەوێ.

باوكی پتر خۆی چەماندەوە تا هەردوو باسكی لەسەر ئەژنۆكانی سرەوتن، لەوە دەچوو بیەوێ لەوبەری ڕووبارەكەوە كەسێك ببینێ.. بڵندو بەرز لەسەر لوتكەی چیاكە. دوورتر چاوەكانی هەڵبڕی، ئەو پرشنگەی لە دەرگاكەوە دەڕژایە سەر ڕوخساری لە چاوەكانیدا باق و بریق دەدرەوشانەوە. ئەو فرمێسكانەش كە بەسەر ڕومەتیدا دەڕژان وردە ئەستێرە ئاسا دەبریسكانەوە، هێشتا گەرم بەسەر هەردوو دەستە لەرزۆكەكانیدا دەبارین تا لەوێ دەكوژانەوە.

ئا لەم ساتەدا، كپ و بێدەنگ، هەستایە سەرپێ و ڕووەو دەرگاكە ملی نا، بەر لەوەی بچێتە ژورەوە بۆ ساتێ وەستاو سێبەرە زەبەللاحەكەی من و گریشن-ی داپۆشی. ڕووم وەرسوڕاندو ڕێك سەیری ئەوم كرد. گەرچی دیارنەما، بەلام من چاوم لە تارماییەكەی هەر نەتروكاند.

گریشن پتر لێم نزیك بۆوە، پەنجەكانی داچەقاندە نێو لەپی دەستم و ڕومەتی لە شانم هەڵدەسو وەك بڵێی شتێكی پێوە بێ و ئەم بیەوێ بە ڕومەت بیماڵێ، ترپەی هەنگاوەكانی باوكی بە ئاستەم دەهاتنە بەرگوێ، دواجار نەمان. لە شوێنێكداو لەو خوارەو بە كەناری ڕووبارەكەوە قریشكەی شەمەندەفەرێكی تیژڕەو دۆڵەكەی پڕكرد، زرم و كوت.. زریكەی خامۆشی ئەو شەوەی دەڕەواندەوە. جاروبار لێرەو لەوێ پەنجەرەی ڕوناكی دەخستە نێو تاریكایی و پرشنگی بەسەر ڕووبارە سەوز و بەربلاوەكەدا دەپرژاند.. چوون ئەستێرەكانی قوتبی باكور، هاڕەو سەدای ئاسنینانەی هەیكەلی پۆلاینی بەڕووی چیا بەرزەكانەوە چ گرمەو گەواڵەیەك بوو.

گریشن بە هەردوو دەست توند دەستەكانمی دەگوشی.. بگرە تا سەر پەنجەكانیشی دەلەرزین.

"ریچارد بۆ هاتیت بمبینی؟"

دەنگی تێكەڵ بە سەداو ناڵینی ئاسنینانەی شەمەندەفەرەكە بوو كە ئەو حەڵە لەوە دەچوو دووركەوتبێتەوە.

وام مەزەندە دەكرد كە سەیری سەرو سیمام بكا، بەلام كە سەیرم كرد، بینیم دوور دەیڕوانی.. ڕووەو قولایی دۆڵەكە.. خوارتر تا ئەوبەری ئاوی گەرمی ڕووبارەكە. ئەم دەیزانی بۆ هاتووم، بەلام حەزیشی نەدەكرد پێی بڵێم و ئەو هۆیە بدركێنم. وەڵێ هەنوكە تێناگەم بۆ هاتووم بیبینم. من گریشن-م خۆش دەویست، لە هەموو كەس پتر دەمزانی كە من ئەوم گەرەكەو ئارەزووی دەكەم. بەلام نەمدەتوانی پێی بڵێم خۆشم دەوێ، بە تایبەتی دوای ئەوەی كە باوكی ئاوا لە عیشق و ئەوین دوا، دوای ئەوەی بەم تەرحە باسی دایكی گریشن-ی بۆ كردین.. ئەمێستا تەواو پەشیمانم كە هاتووم.

من دەمزانی گریشن بە ڕۆح و بە گیان هی منەو ئامادەیە خۆی بە قوربانم كا، چونكێ خۆشی دەویستم، بەلام من.. لەبری ئەو هەموو خۆشەویستیە هیچم نەبوو پێی ببەخشم. چەندە شۆخ و نازداریش بوو، پڕ بەدڵ ئارەزوم دەكرد.. ئەوەیان زووتر.. بەر لەم ساتەوەختە. ئێستاكە دەمزانی كە ناتوانم وەك جاران بیری لێبكەمەوە..

وەك ئــەو ســاتەی كــە بــەرێوە بــووم و بــەر لــەم دانیشتنە.

"ریچارد.. نەتوت بۆچی هاتیت؟"

"بۆچی..؟"

"ئا.. ریچارد.. بۆچی؟"

چاوەكانم داخست، ئەوەی هاتەوە بەر دیدەی چــاوانم جریـــوە جریـــوی ئەســـتێرەكانی ســـەر ئاسمـــانی دۆڵەكـــە بـــوو، گـــەرمی ڕوبارەكـــەی ژێرەوەمان، یاری پەنجەكانی لەسەر باسكم.

"ریچــارد.. تكــات لێدەكــەم پێــم بڵــێ: بــۆ هاتیت؟"

"نازانم بۆ هاتووم گریشن".

"ریچارد گەر بەقەد من خۆشەویستی لە دڵتا هەبوایە.. چاك دەتزانی بۆ هاتووی"

پەنجەكانی لەنێو دەستما دەلەرزین. دەمزانی منی خۆش دەوێ. هەر لە سەرەتاوە هیچ گومانێكم لە عیشقی ئەو نەبوو.. گریشن خۆشی دەویستم.

"ڕەنگــە نــەهاتنم باشــتر بوایــە.. گریشــن مــن نەدەبوو بێم، هــاتنم هەڵــە بــوو. دەبوایــە لــە تــۆوە دووربم".

"بەڵام تۆ بۆ تەنها شەوێك هاتویت.. ریچارد.. بــەیانی زوو جێم دەهێڵــی.. نــاكرێ بــۆ وەختێكــی ئــاوا كــورت پەشــیمان بوویبیــت.. بڵــێ ڕیچــارد.. پەشیمانیت؟"

"گریشـن.. مـن لـەوە پەشیمان نیـم كـە لـێرەم، بــەڵام نــەدەبوو بێــم، خۆشــم نــازانم چ دەكــەم و مەبەستم چیە، من هیچ هەقێكم نیە بێمە ئێرە. ئەو كەســانەی یــەكدیان خـــۆش دەوێ.. هـــەر تەنـــها ئەوانە.."

"بەڵام هیچ نـەبێ تۆزێك منت خـۆش دەوێ.. بڵێ وا نیە. ها ڕیچارد..؟ ڕەنگە بەقەد ئـەوەی مـن تۆم دەوێ تۆ منت نەوێ، بەڵام ناكرێ نكوڵـی لـەوە بكـەیت كـە تەنها كـەمێك منـت خـۆش نـەوێ، هیـچ نـەبێ ئەوسا كـە جێـم دێڵـی هەسـت بـەوە دەكـەم تۆزێ ئاسودەترم.. ها ڕیچارد..؟"

بە لێوەلەرزەوە پێم وت: "نازانم".

"ڕیچارد. تكات لێدەكەم".

توندتر دەستەكانیم گوشی، كتوپڕ بۆ تاوێك حاڵـەتێكی سـەیر دایگـرتم. خێرا هـەموو هەسـت و نەسـت و بوونـی داگـرتم.. لـە دڵـی دام، وەك بڵێـی قســەكانی بــاوكی كــە تۆزێــك لەمەوبــەر دركــاندی ئێســتا لەبــەر دڵ و دیدەمــدا ڕوونــتر دەركــەوتن. لەمەوبـــەر قـــەت نـــەمدەزانی خۆشەویســـتی وا هــەبێت.. ئـەو خۆشەویستیەی بـاوكی لێـی دەدوا. مـن لـەو بڕوایـەدا بـووم كـە پیـاوان قـەت نـاتوانن ئافرەتیان خۆش بوێ بەهەمان ئەو گوڕوتینـەی كە ئافرەتێك پیاوێكی پـێ خۆشـدەوێ، بـەڵام هەنوكـە تێگەیشتم كە هیچ جیاوازیەكی ئەوتۆی نیە.

هەردوو بێدەنگ دانیشـتبووین، دەسـت لـەناو دەسـت.. زۆری پێچـوو. نیوەشەویشـمان ڕەتكـرد، چونكە چراكانی بـەری دۆڵەكـەش كوژابوونـەوە.. بـــەڵام ســـەبارەت بـــە هـــەردووكمان كـــات هیـــچ بایەخێكی نەمابوو.

زۆر بە ناسكی پێمەوە نوسا، دەیڕوانیە سەرو سیمام، هێشتا ڕومەتیشی بە شانمەوە گیركردبوو. وەك هەر ئافرەتێك كە تا ئەبەد شەیدای پیاوێك بێ ئاواهی دەمزانـی هـی خۆمـەو بـۆ منـە، بـەڵام هـەر ئەوسا تێگەیشتم كە من قەت زاتی ئەوە ناكەم خۆم

بخەمە دەریای پڕ گێژەنەی خۆشەویستی ئەمەوە.. لە نەزەر من ئەوەیان سەرکێشی بوو، سەرەڕای ئەوەش.. گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە من هەرگیز بارتەقای ئەو خۆشەویستیم لەلا نەبووە.. بەو زەخمەی کە ئەو منی ویستوە.. بە هەمان زەخم من ئەوم وا نەویستوە، کە هاتیشم قەت شتی وام بە خەیاڵدا نەدەهات. من ئەو هەموو ڕێگەیەم بڕی تا بۆ چەند سەعاتێك بیگرمە باوەش و پاشان لەبیر خۆمی بەرمەوە.. گەر بکرێ هەتا هەتایە.

کە وەختی ئەوە هات بچینە ژوورەوە، هەستامە سەرپێ و باسکم تێوەئالاند، کە دەستم بەریکەوت ئەم لەرزی، بەڵام کە بەرم نەدا پتر خۆی پێوە نوساندم، تەواوێ هەستم بە لێدانی دڵی دەکرد.. زرم و کوت ترپەی دەهات، وەك بڵێی تاو دوای تاو کەسێك لە دڵی گریشن-ەوە، لەنێو قەفەزی سینەیەوە ڕووەو دڵی من سنگێك دابکوتێ.

پاشان وتی: "ریچارد.. بەرلەوەی بڕۆیت ماچم کە" ڕووەو دەرگاکە غاری دا، بۆ پێشوازیم کردیەوە، لامپای سەر مێزەکەی هەڵگرت و پێشم کەوت، ڕووەو ژوورەکەی سەرەوە ملی نا. لەبەر دەرگای ژوورەکەمدا چاوەڕێ بوو تا منیش چراکەی ئەو داگیرسێنم.. پاشان چراکەی خۆمی دامەوە.

دەمم هەڵێنایەوە: "شەوت باش.. گریشن"

"شەوت باش ریچارد.."

فتیلەی چراکەم بۆ داگرت نەبا دووکەڵ بکات، پاشان بەنێو هۆڵەکەو ڕووەو ژوورەکەی هەنگاوی نا.

ریچارد.. بەیانی لە وەختی خۆیدا بانگت دەکەم تا فریای شەمەندەفەرەکە بکەویت"

"باشە گریشن.. مەهێڵە لە خەودا بمێنمەوە.. چونکە کاتژمێر حەوت و نیو وێستگەکە جێدەهێڵێ."

"مەترسە.. زووتر وەئاگات دێنم"

دەرگای لەسەر خۆی داخست، منیش ڕووەو ژوورەکەم چوم و دەرگام لەسەر خۆم داخست، بە شێنەیی جلەکانی بەرم داکەند، فوم لە چراکە کردو خۆم بەردایەوە سەر پێخەفەکەم، بێ ئۆقرەو نارەحەت ڕاکشام، چاك دەمزانی کە خەوم لێناکەوێ، هەر لەناو پێخەفەکەدا خۆم گێل کردەوە و جگەرەم بە جگەرە دادەگیرساند، بەودیو تەلی پشت پەنجەرەکە دوکەڵم بەبادا دەدا،ماڵیش کپ و خامۆش، جاروبار وام هەست دەکرد کە گوێم لە خشەو دەنگە.. دەنگی جۆرە جوڵەیەکی کپ و خنکاو کە بە ڕاڕەوەکەداو لە ژوورەکەی گریشن-ەوە بێتە بەرگوێم.. وەلێ تەواویش دڵنیا نەبووم.

نازانم چەندی پێچوو کە هەر ئاوا لە ڕۆخی پێخەفی خۆمدا چەقی بووم، بەردەوامیش لە خەیاڵی گریشندا بووم، کتوپڕ هەستامەوە سەرپێ، دەرگام کردەوەو ڕووەو ڕاڕەوەکە غارم دا، دەرگای ژوورەکەی گریشن داخرابوو، بەڵام من دەمزانی کە کلیل نەدراوە، بێ خشەو لەسەرخۆ دەسکی دەرگاکەم بادا، لولەی تەنك و باریکی پرشنگێك لەو کەلێنەوە ڕژا، پێویستی نەدەکرد لەوە پتر دەرگاکە بکەمەوە، چونکە بە چەند هەنگاوێك لەودیو دەرگاکەوە گریشن-م بینی، کە

ئەگــەر باڵــەکانم بــۆی بکردایەتــەوە دەســتەکانم دەیگەیشتنێ، بۆ تاوێ چاوانم داخست، بیرم لە حاڵی گریشن کردەوە.. هەروەك چۆن بە درێژایی سەفەری ئەو ڕۆژەم بۆ تاوێك لەبەر دیدەی خەیاڵمدا لا نەچوە.. هەر لەوێوە تا ئێرە.

گریشن گوێی لە تەقەی دەرگاکە نەبوو کە کردمەوە، نەشیدەزانی لەوێ وەستاوم، چرای سەر مێزەکە گەش دەسوتا.

چاوەڕێ نەبووم وەئاگا بێ، وای بۆ چووم کە ئێستا لەنێو پێخەفەکەیدا ڕاکشابێ، لەسەر نیمدەرێك و لەتەك پێخەفەکەیدا کرۆشکەی کردبوو، سەری خستبوە سەر هەردوو باسکی و ئازای جەستەی بە دەم قوڵپی گریانەوە ڕادەتەکی.

یەك قەفی بە قردێلەیەکی شینی کاڵ قژی بەسەر سەریەوە بەستبوو.. سەربەستانە بەسەر شان و ملیدا پەخش و بڵاو بوو، کراسی شەویشی ئاوریشمێکی سپی، دامێنیشی نەخشین بە قیراجێکی ناسك، بە دەوری گەردنیدا یەخەی ئۆیەداری کرابۆوە.

ئەوسا کە بەو حاڵەوە دیم دەمزانی چەند شۆخە، هەرچەندە لەبەر دیدەی من هەمیشە دڵگیر بوە، هەرگیز لە گریشن شۆخترم نەدیوە.

تا ئەو حەڵەش نەیدەزانی من وام لەبەر دەرگاکە، گوێی لە ترپەی هەنگاوەکانیشم نەبوو. لە تەنیشت پێخەفەکەیدا باسکەکانی لە هەردوو کلاوەی ئەژنۆی وەرێنابوو.. بەکوڵ دەگریا.

سەرەتا کە دەرگاکەم کردەوە خۆیشم نەمدەزانی بە نیازی چیم، بەڵام ئەمێستا کە لە ژورەکەی خۆیدا دیم، سەر لەسەر ئەژنۆو لەتەك پێخەفەکەی وەك بڵێی لە نوێژدا بێ، بێئاگا لەوەی من سەیری دەکەم و گوێم لە هەنسك و کسپەی دڵیەتی، ئا لەوکاتەدا دڵنیا بووم لەوەی کە هەرگیز کەسێکی دیکە وەك ئەو نابێ بە خولیاو خەمم، تا ئەو حەڵە نەمدەزانی، بەڵام بۆ چەند ساتێك ئەو حەقیقەتە لە دڵ و دەرونمدا درەوشایەوە.. حەقیقەتی ئەوەی کە من بە ڕاستی ئەو کچەم خۆش دەوێ.

بێ خشپەو هێدی دەرگاکەم داخستەوەو چومەوە ژورەکەی خۆم. کورسیەکم ڕاکێشاو لەبەر پەنجەرەکەدا لێی دانیشتم و چاوەڕێی گزنگی بەیانی بووم. لە پەنجەرەکەوە ڕوەو قولایی دۆڵەکە دەمڕوانی، دۆڵی ڕوباری گەرم لە باوەش. کە چاوەکانم بە تاریکی ڕاهات هەستم دەکرد تا دێ نزیك و نزیکتر دەبمەوە.. وا نزیك کە دەتوانم بچمە دەرەوەو هەردوو دەستم لە ئاوی ڕوبارە گەرمەکە نقوم کەم.

درەنگی شەو و نزیك بەرەبەیان وام هاتە بەرگوێ کە یەکێك لە ژورەکەی گریشندا بە هێواشی و لەسەرخۆ دێت و دەچێ وەك بڵێی لە مابەینی هەردوو پەنجەرەکەدا پیاسە بکات. پاشان دڵنیابووم وا لە هۆڵەکەو دواجاریش ئەوەتا لەبەر دەرگای ژورەکەم.

کە خۆر لەسەر ترۆپکی چیاکان گزنگی دا هەستام و خۆم گۆڕی، پاشان هەستم کرد گریشن ژورەکەی خۆی جێهێشت و بە پێپلیکانەکەدا غل بۆوە، زانیم بە پەلەیە نانی بەیانیم بۆ ئامادەکا بەرلەوەی بە گەیشتنی شەمەندەفەرەکە تەنگەتاو بم، قەیرێ چاوەڕێ بووم، دوای چارەکە سەعاتێك

سەرکەوتەوە، بە نەرمی لە دەرگای ژورەکەمی داو چەند جارێکیش بانگی کردم.

بە قەڵەمبازێك گەیشتمە دەرگاکەو کردمەوە.. ڕوبەڕوو.. بە خەیاڵی خۆی دەبوایە من هێشتا لە گەرمەی خەودا بم.. کە لەناو دەرگاکە بینیمی تەیارو ئامادەم کۆڵی سەرسام بوو، بۆ ساتەوەختێك لە حەیبەتا دەمی بەسترا.

هەردوو دەستیم گرت و پێم وت: "گریشن.. پەلەت نەبێ لەوەی زوو وەدەرم نێی -ئەم بەیانیەش ناگەڕێمەوە- من خۆیشم نازانم دوێنێ شەو بۆ وام کرد.. هەنووکە من چاك لەوە حاڵی بووم کە من تۆم خۆش دەوێ.."

"بەڵام.. ڕیچارد.. تۆ شەوێ وتت.."

"دەزانم شەوێ وتم: من بەیانی زوو دەگەڕێمەوە، گریشن.. بەس خۆیشم نەمدەزانی چی دەڵێم، من تازە ناڕۆمەوە تا تۆش لەگەڵ خۆمدا نەبەمەوە، با نانەکە بخۆم ئەوسا چیم لە دڵدایە هەڵیدەڕێژم، بەڵام پێش هەموو شتێك پڕبەدڵ حەز دەکەم ڕێی ڕوبارەکەم پیشان بدەی، هەر ئێستا دەمەوێ خۆم بچم هەردوو دەستەکانم بخەمە نێو ئاوی ڕوبارەکە تا بزانم تا چ حەدوسەدێك گەرمە.!"

## پەراوێز

کالدوێل: خاوەنی ڕۆمانی "بڕە زەویەکەی خودا، کۆچەری، گرفتێك لە گەلاوێژدا.. هتد". وەك نوسەرێکی ناوداری ئەمریکی لەتەك (شتاینبێگ و هێمنگوای) هاوتایەو شان لە شانیان دەدا، بۆ ئەم نوسەرە ئەمریکای باشور بەو ژیانە ڕەنگاوڕەنگ و پڕ هەرایەی خۆی ئیلهام بەخشی بوو، ئەمەیان وای کرد نوسینەکانی هەواو مۆرکی تایبەت بە خۆیان هەبێ، جیا لە نوسەرانی دیکە. ئەمیش وەك (شێرود ئەندرسن) کەوتە دوای ڕێبازی -ناچرالیزم- کە دەکا وردبوونەوە لە ژیان، وردبوونەوەیەکی زانستیانەو بێ داپۆشینی ئاکارو شتە هەرە پیس و ناشیرینەکانی" لەپاڵ بڕواهێنانی بە ئەدەبی خۆماڵی. لەساڵی (*1903*)داو لە -جۆرجیا- لەدایك بوو، لەوێدا باوکی قەشە بوو.. لە دانیشگای ڤرجینیاو پێنسلڤانیادا خوێندی، ماوەیەك لە ئەمریکای ناوەڕاستدا بوە بە چاقاغچی چەك، سەراوو دەراوی زۆری بینی و لەوەوە فێری دەرسی گەورەی ژیان بوو، ماوەیەك یاریزانی تۆپی پێ، لۆکەچنین، ڕاپۆرت نوسین، خزمەتگوزاری شانۆ، جگە لە نوسین بۆ تەلەفزیۆن و سینەما، ماوەیەك بوو بە پەیامنێری جەنگ لە گۆڤاری ژیان و (*C.B.S*)

## سەرچاوە

***Famous Writers***

***New- york***

***Page: 123-132***

# پیاوێك لەنێو دارسێودا

• زیگ فرێید لینتس*
▪ لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی

گەلۆ! لەم شارەی ئێمە "زولایکێن" دارێکی سەیری لێیە، عاجباتی ترین داری جیهانە. خورافات و پڕوپوچ بەسەر لق و پۆپەکانیەوە دەشنێتەوە و ئەوان ..-ئیزنم دەنێ هەموویتان بەڕێ و جێ بۆ دەگێڕمەوە- "ئادام ئارباتسکی" ئەو جۆرەی کە هەواڵیان داوە خاوەنی چل و سێ دارسێوە، بەڵام ئەو دارەی کە نوساوە بەماڵەکەیانەوە لە هەموو دارەکانی دیکەی خۆشتر دەوێ و زیاتری پێ ڕادەگا. پێوەندیەکی سەیروسەمەرە -هەموو شتێ لە دوورەوە وەبەرچاو دەکەوت- لە نێوان ئەو دارەو ئادام ئارباتسکیدا بوو. خۆ وانەبوو کە زۆرتر ئاو و کوود بکاتە ژێری، یان کوودی چاکتر لەوانی دیکەی پێبدا. بەڵکو لە شەوانی سایەقەو بەستەڵەکدا کورەیەکی زوخاڵی چکۆڵەی لە پەنادا دادەناو ئەو جۆرەی کە زۆر کەڕەت دیترابوو قسەی لەگەڵ دەکرد. ئەو هێندە بێموبالات قسەی لەگەڵ دارەکە دەکرد، تاکو ڕۆژێك "سۆفیا"ی ژنی کە ئافرەتێکی جوان و جحێڵ بوو، پێی زانی و بەو هۆیەوە دەستی کرد بە پرتەوبۆڵەو سەرکۆنە کردنی:

"ئادام! لە زستانی ساڵی ڕابردوودا حیسابم ڕاگرت و بژاردم، تۆ لە هەوای تاو و ساودا چوار ڕستەو لە هەورو هەڵاو باراندا حەوت ڕستەت قسە لەگەڵ من کردوە. بەڵام بەم گوێچکانەی خۆم بیستومە، لەگەڵ ئەم دارە کە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ئەستورتر دەبێ و هەر ئێستاش بەر پەنجەرەکانی گرتوە، زیاتر لە دە ڕستە قسە دەکەی. هەر بۆیە تکات لێدەکەم بۆم ڕون بکەوە، خۆ کارێکی زۆر دژوار نیە.

ئادام ئارباتسکی زەردەیەکی گرت و هێندێ بیری کردەوە، پاشان زۆر لە سەرەخۆ گوتی: "ئەو دە ڕستەیە کە لەگەڵ ئەو دارە قسەم کردوە، لە ڕاستیدا قسەم لەگەڵ خۆم کردوە. چونکە ئەو دارە هەر خۆمم. بۆیە ئاگاداریی لێدەکەم تاکو کاتی

مردنم بتوانم بچمە هەرۆڵەکەیەوەو ئاگام لەتۆ بێ سۆفیا گیان! چونکە تۆ هێشتا جوان و جحێڵی و جحێڵیش ئەگەر بۆی بلوێ هێندێ گەوجێتی و پێداکێشی دەکا. ئەمڕۆ دەمەوێ هێندێکت لەو مەترسیە ئاگادار بکەم. ئەم دارە کە منم دەتوانێ سەر بە هەموو پەنجەرەکاندا بکات و نێو ژورەکان ببینێ. ئەگەر دوای مردنم ڕووداوگەلێك ڕوویدا، بە شێوەیەك خۆم نیشان دەدەم".

ئەم قسانە لە ڕۆژی سێ شەممەدا کران. ئادام ڕۆژی چوارشەممە بەجێوبان کەوت.

ڕۆژی پێنج شەممە دوکتۆریان هێنا سەری و چونکە بڕوای بە دوکتۆرو شتی وا نەبوو، نوسخەکەی تووڕهەڵداو نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە کۆچی دوایی کرد. لە ڕاستیدا بە تەواوی پیریش ببوو.

سۆفیا ئەو ژنە دەستەوستانە کارێکی کرد تاکو شوێنێکی جوان بۆ ئادام تەرخان بکەن. دەرمانی مۆریانی لە جلوبەرگەکانی داو خۆی خەمبارو سەبور نیشان دا لە سەرەتاوە. بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەمی لە دڵ دەردەکرد -چونکە هێشتا زۆر جحێڵ بوو و نەدەکرا تا ئاخری عومری هەر خەم بخواو ڕەشپۆش بێ- وەلحاسڵ خۆی بۆ گرنگترین تایبەتمەندی ژیان ئامادە کرد. هەروا ژیانی تێپەڕ دەکرد و خۆی بە کاروبارەوە سەرقاڵ دەکرد. جێی سەرسوڕمانیش نیە ئەگەر ئەم خۆخەریك کردن و ڕۆژ تێپەڕکردنەی بەرەو دارەکەی ئادامی بەرێ. بەڵام بە جێی ئەوەی سەتڵێك کودی باشی بکاتە ژێر، یان لە شەوی سەرماو سەغڵەتدا کورەی پشکۆی بۆ بەرێ، زۆر بە سوکی چاوێکی لێدەکرد و کە بەلایدا تێدەپەڕی لیێکی لێ دەکردەوە. بە لەقە لە دارەکەی دەدا، یان هەر کارێکی پێی خۆش بوایە لەگەڵی دەکرد. تاکو بۆی دەرکەوێ ئەو دارە چەندەی لە وجودی ئادام ئارباتکسی پیر لە خۆی گرتوە. بەوەدا کە بە هۆی ئەو کردەوەو حەولانەوە هیچ شتێکی نائاسایی ڕووی نەدا، هیچ ناڵەیەك، نوکەیەك، خشپەیەك یان جنێوێکی بەرگوێ نەکەوت. هەر بۆیە ئەو دار سێوە وەك دڕکێك وابوو کە لە چاوی هەڵچەقیبێ. هەر بۆیە ڕۆژێك یەکێك لە دەست و پێوەندەکانی بانگ کردو پێی گوت: "ئەم دارە بێ قەڵافەتەم بۆ ببڕەوە، چونکە جوان نیەو تازە لەوەش زیاتر گەورە نابێ و هیچ کەسیش ناتوانێ سێوە تام ناخۆشەکانی بخواو بەر پەنجەرەکانی گرتوەو ماڵەکەی لێ تاریك کردووم".

یەکێك لە دەست و پێوەندەکانی "سبریسنی" بوو، چوو تەورێك و مشارێك و گوریسێکی هێناو ویستی ئادام ئارباتسکی نێو دارەکە بە یەکجاری ببڕێتەوە، تاکو لەمەولا هەموو شتێ بە باشی بەڕێوە بچێ.

ئێستا لە ئێوە دەپرسم، گەلۆ! لەنێو ئێمەدا کێ هەیە بێئەوەی متەقی لێوەبێ دانیشێ و تەماشا بکات، "سبریسنی"یەك گوریسی لە مل بخات و بە مشار لاقی ببڕێتەوە. من پێم وایە هیچ کەس لەوەها کاتێکدا بێدەنگ ڕاناوەستێ. هەر بۆیە نابێ چاوەڕوانی ئەوەش بین کە ئادام ئارباتسکی نێو دارەکە بێدەنگ ڕاوەستێ و متەق نەکا. بۆیە هەرکە ڕەعیەتەکە ددانەی مشاری لەسەر دارەکە داناو دانەوی تاکو دەست بکا بە

بڕینەوەی، لقێکی وشك کەوت بە تەپڵی سەریداو وای پێداکەوت نەیتوانی هەستێتەوە. "سبریسنی" یان بە دارە تەرم بردەوە بۆ ماڵێ و ئیتر لەو کاتەوە نەیوێرا بەلای دارسێوەکەدا بچێ.

"سۆفیا" بە پەشۆکاوی چوە ژێر دارەکەو چەن ساتێك گوێی هەڵخست لە هەموو بارێکی دارەکەی ڕوانی و پاشان لەسەرەخۆ و بە نەرمی گوتی: "ئادام! ڕەعیەتی هەژاری سبریسنی هەمیشە لە هەڵگرتنی بەرهەم و ڕنینی بێستاندا یاریدەی داوین. گژوگیای وشکی بۆ کێشاوین. نەدەبوو ئاوا بێبەزەییانە بکوتی بەسەریدا. چونکە زەبری ئەو لقەدارە زۆر لە زەبری مست و چەپۆك بە ژان ترە".

دارەکە متەقی لێوە نەهات و سۆفیای جحێڵ و شۆخوشەنگ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ و کەوتە بیرکردنەوە.

بیری کردەوە، پێی بڵێ یان نا. -مەبەستی ئەولاوە بەهێزە واتە "ئیگۆن ساگێل"ی چوار شانەو جوانچاك بوو- دەکرێ بیهێنیە بەرچاو ئەو لاوە چەندە ڕوودار و پێراکێشە.

لە ئاکامدا سۆفیا هەستی بە دڵتەنگیەکی لە ڕادەبەدەر کرد و ئۆقرەی لێهەڵگیرا. هەر بۆیە هاتە سەرئەوەی بە "ئیگۆن ساگێل" بڵێ شەوبێ بۆ لای.

بەم شێوەیە ئیگۆن ساگێل -ئەگەر بۆ گوتن ببێ- بە بیری گەماری خۆیەوە پێی نا ماڵەکەوە و لەوێ بێشەرمانە ئەو کارانەی کرد کە لە پیاوێکی لاوی ڕەبەن دەوەشێتەوە.

بەڵام لەو کاتەدا کە زۆری شایی بە خۆی بوو و بە شانازییەوە باوەشی لە سۆفیا وەرهێنا بوو و هەڵی دەسوڕاند و بەمدیو و ئەودیویدا دەتلاندەوەو ئارەقیان دەردابوو، دەزانی چی ڕویدا؟ هەر ئەوەی کە چاوەڕوانی لێدەکرا؛ ئادام ئارباتسکی بە لقەکانی لە پەنجەرەکانی ڕاکێشا، بە خۆڕاوەشاندن و هەژاندنی خۆی لاولاوەی پەنجەرەکانی وە جیڕەجیڕ خست و بە لقە باریکەکانی چنگی لە سەربانە گڵەکە گیر دەکرد. ئەو کارەی هێندە بە تووڕەیی و پەیتاپەیتا بوو، ئارامی لە سۆفیا بڕی، لەسەر جێگاکە هەستاو بە پیاوە ڕەبەنەکەی گوت: "ئیگۆن ساگێل"! بێزەحمەت بچۆ ئەو تەورە هەڵگرەو لق و پۆپی ئەو دارە هەمووی بقرتێنە. بە تایبەت ئەو لقانەی کە هەراسی پێ هەڵگرتووین".

پیاوە سەڵتەکە وتی: "ڕاوەستە هەر ئێستا جێبەجێی دەکەم". کێردێکی لە چێشتخانەکە هەڵگرت و چوە بن دارەکە تاکو لقە ملۆزمەکان ببڕێتەوە. لەو کاتەدا ئادام ئارباتسکی بە جۆرێك خۆی ڕاوەشاند کە لاوەکە هەموو گیانی خوساو ویستی بە دوو سێ شەقاو خۆی بکێشێتە جێیەکی ئەمن. بەڵام ئادام ڕێی لێگرت. -ڕوونتر بیڵێم- ڕیشەکەی لەبەرپێیدا قیت کردوە بە جۆرێ کە لاوەکە لێی هەڵەنگوت و سوڕێکی خواردو درا بە عەرزدا. بە جۆرێك بە پشتا کەوت کە کێردەکە ڕاست لە سمتی مەبارەکی هەڵچەقی.

بێوەژنی جحێڵ ئەو هەقەی بە خۆی دا کە چەقۆکە دەرکێشێ و جوان بیسڕێ. ڕەنگە گوتنی

ئەوەش بێجێ نەبێ، پیاوی ڕەبەن هەر هەستاو بەبێ ئاوڕدانەوە هەڵات.

ورده ورده قسەوباس سەبارەت بە دارسێوەکەو کردەوەکانی کەوتە سەر دەمی خەڵك و کەم کەس لە "زولایکێن" هەڵدەکەوت کە بەلای دارسێوەکەدا بڕواو زۆر بە ڕێزەوە سڵاو نەکاو هێندێ لەگەڵی نەدوێ. لە هەموو شتێ گرنگتر، ئیتر هیچ کەس وەك بێوەژنێکی تەواو چاوی لە سۆفیا نەدەکرد -هەر ئەوەش ئۆقرەی لە سۆفیا هەڵگرتبوو و خەفەتبارو داماوی کردبوو- ئەو دۆخەی بۆ چەند ساڵ هێشتەوە، بەلام شتێك لە مێشکیدا وەك مێش ویزەویزی دەهات و زۆری نەخایاند لەپڕ نەخشەیەکی بە فکر گەیشت. نەخشەکەی ئیتر دارەکەی تەفروتونا دەکرد. ناردی بە شوێن ڕەعیەتێکدا لە "شیو و میر"، ئەو پیاوە ترسناکە ناوی "ئیشتریش نینسکی" بوو. خەبەری لەو حەیس و بەیسە نەبوو. ڕایانسپارد کە مەشخەڵێك لەبن دارەکەدا دانێ و ئاگری تێبەردا.

ئیشتریش نینسکی پارچەیەك پەڕۆی لە دارێك پێچاو لە نەوتی هەڵکێشا، ئاگری تێبەرداو فڕێی دا بن دارەکە. ئێستا باوەڕدەکەن یان نا: مەشخەڵەکە کەوانەی کردو بە پرتاو درا بە دەموچاویدا، وای لێکرد بە هاوارهاوار دەستی کرد بە هەڵاتن. سۆفیای جحێڵ و بێوەژن دیسان چوە نێو باخچەکەو زۆری جنێو بە ئادام ئارباتسکی نێودارەکە دا. بەلام ئەو هەروا بێدەنگ و کڕ مابوو متەقی نەدەکرد.

سۆفیا هاتبوە سەر ئەوەی بۆ هەتاهەتا خۆی بداتە دەس ئەو چارەنوسە؛ تا ڕۆژێك باخەوانێکی شادو بە دەماخ بە ناوی "بۆتسریێت" کە لەو دەردەی سۆفیا ئاگادار ببوو هات بۆ لای و گوتی: "ئەوەی سەبارەت بە ئادام ئارباتسکی نێودار بۆتە دەنگۆ بەجێی خۆی، بەلام پرسیاری من ئەوەیە، تۆ کەسێکت پێ شك دێ هەست بە مەترسی بکات و دەست نەکاتەوە؟ بە بڕوای من دەبێ بە شێوەیەکی دیکە لە گەڵی بجوڵێینەوە. ئەگەر هەقدەستێکی باشم پێبدەی ئەو ئەرکە وەئەستۆ دەگرم.

سۆفیا گوتی: "لە زووترین کاتدا هەقدەستەکەت دەدەمێ".

باشە دەتوانم بڵێم چی؟ ئەم باغەوانە شادو بەدەماغە، ئەم پیاوە کچکەلانەیە دەستی سۆفیای گرت و گوتی: "ئەم دارە زۆر جوان دەڕازێنمەوە، خاترجەمبە پەشیمان نابیتەوە، هیچ شتێك بە زۆری بەڕێوە نابەم".

چوو بۆ لای دارەکەو بە شێوەی جۆراوجۆر دەستی کرد بە متوربەکردن.

سەرەتا بۆ ئەوەی ڕەسەنایەتی دارەکە نیشان داو فێڵ و تەڵەکەکەی سەربگرێ، دەستی کرد بە هەڵکەندنی گیا سندەو فریزووی بن دارەکە. پاشان لە هەموو لایەکەوە لقی لێ متوربە کرد. لایەکی فندق، لایەکی هەرمێ و بەڕوو، لایەکی گێرس و قەیسی و.. تەنانەت تۆوی چیمەنیشی لەژێریدا چاند.

تەواوی ئەو متوربەکردنەشی بە مەرایی کردنێکی بەردەوامەوە ئەنجام دەداو دارەکەش ڕێگەی هەموو کارێکی پێدەدا. -هەموو کەس دەزانێ دارەسێو بە ئەو فێڵ و تەڵەکەیە چەواشە ببوو- دارەکە ورده ورده پەلوپۆی هاویشت و زۆر

گەورە بوو. بەڵام چۆن گەورە بوونێك؟ لایەكی فندقی پێوە بوو، لایەكی سێو، لایەكی بەڕوو، لایەكی گێلاس و.. بە كورتی ئادام ئارباتسكی نێودارەكە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گۆڕاو لەگەڵ گەورەبوونیدا بە چەشنێ هاتەوە سەر باری ئاسایی خۆی، تەنیا شتێكی كە لێی مابۆوە ساقەتەكەی بوو. گەلۆ! ئێوە بڵێن، ئایا لاق بە تەنیا دەتوانێ ببێتە هۆی بەڕێوەبردنی ئەرك؟! بەم شێوە ئادام ئارباتسكی تەواوی وزەو هێزی خۆی بۆ كارگەلێكی چكۆڵەو بێبایەخ بەفیڕۆ داو گوێی بە شتە گرنگ و بنەڕەتیەكان نەداو بەو چەشنە بوو بە چەن بەشەوە؛ چونكە دژایەتی لەگەڵ متوربە نەبوو.

ئێستاش هەركەسێ ڕێی بكەوێتە "زولایكێن" چاوی پێی دەكەوێ و خاترجەم دەتوانێ سەیروسەمەرەترین داری جیهان ببینێ.

## پەراوێز

*زیگفرێید لینتێس ساڵی *1926* لە شارۆچكەی لیك (مازۆرن) لەدایكبوە. ئێستا لە شاری هامبۆرگ خەریكی كاری نوسەرییە. ئەو دوای تەواوكردنی قوتابخانەی كۆتایی ساڵی *1943* چوە هێزی دەریاییەوەو دوو ساڵ دوایی لە لایەن هێزی ئینگلیزەوە بەدیل گیراو، دوای تەواوبوونی شەڕو ئازادبوونی، خوێندنی زمانی ئینگلیزی و فەلسەفەی لە هامبۆرگ درێژە پێدا. بەڵام دوای ماوەیەك وازی لە خوێندن هێناو دەستی كرد بە نوسەری و ڕۆژنامەگەری.

یەكەمین ڕۆمانی زیگفرێید لینتێس بە ناوی (واشە بە ئاسمانەوە بوون) ساڵی *1953* بڵاوكرایەوە. كتێبەكانی دیكەی ئەو نووسەرە بریتین لە: (پیاوی نێو ڕوبار)، (سەعاتی ئەدەبیات)، (قسەی شار)، (چەن خۆشەویست بوو زولایكێن)، (ڕاوچی ڕشقنجار)، (پاپۆڕی ئاگر)، (كایەی ڕوخێنەر).

## سەرچاوە

كتێبی (مندالانیش غەیرە نیزامین) كۆمەڵە چیرۆك. چاپی یەكەم *1998* بڵاوكەرەوەی پەژوهەندە تاران. وەرگێڕانی بۆ فارسی: كاوە كوردونی و یەحیا نەجەف وەند.

# چەند پارچە شیعرێکی فرێدریك نیچە

■ لە ئیسپانییەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ



نیچە

## 1-درەختێ ئەدوێ

زۆر بە تەنیایی گەورە بووم و
زۆریش بڵند هەڵچووم،
چاوەڕوانم،
لێ چی ورەی چاوەڕوانیم پێئەبەخشێ؛
ئەوانەش وا لە منەوە نزیکن
سەر بە هەورن و.. چاوەڕێی یەکەمین بروسکە ئەکەم

## 2-کۆچبەر

چ ڕێگایەك نیە.!
دورییەك وا لە نێوان ئەوەی ڕابوردو بێدەنگیدا
چ درکێکت پێ نەکردوە!؟
تەواو خۆت داوەتە دەست ئەو ڕێگایە!؟
ئەی کۆچبەر، نیگاکانت بە خاوێنی و ساردی
بپارێزە..
گەروا هەست ئەکەی لە مەترسیدایت، ون ئەبیت!!

## 3-ئاشوبی جیهان

لەنێو کێڵگەکەدا بە خەمساردیەوە
پاڵی لێمەدەرەوە..
هەروەها زۆر بەرەو بەرزیش هەڵمەزنێ
جوانترین لێڕوانینێکی ئەم جیهانە،
وا لەنێو جەرگەی ڕێگادایە..!

### 4-ئا ئەوەیە مرۆڤ

بەڵێ، ئەزانم من لە کوێوە هاتووم
بەرپا بووم هەروەکو مەشخەڵێ
ئەسوتێم و فەنا(1) ئەبم
ڕوناکی؛ هەموو بوونێکم پێئەبەخشێ
ژیلەمۆش؛ هەموو ئەو میراتیەی لە پاشم جێئەمێنێ
ئاه، کە بە ڕاستی من مەشخەڵێکم..!

### 5-ڤینیسیا

بەسەر پردەکەوە، سەرم شۆڕکردبۆوەو
بەنێو نوتەکی شەودا ڕۆچوبووم
ئەو دەمەی گۆرانیەك لە ناخما سەری هەڵدا؛
تنۆکەی ئاڵتون ئەرژێتە سەر
پەڕەیەکی لەرزیو..
بەلەمی -گۆندۆلێ(2)-ەکان، ڕوناکی، مۆسیقا
هەموو پێکەوە سەمایان لەگەڵ
سەرمەستی خۆراوابونا ئەکرد..
ڕۆحم هەروەکو هارمۆنیای نۆتەی گیتارێ
لە خۆشی ئەو سەماو سەرمەستیە پەنهانیەدا
گۆرانی ئەچڕی..
سترانێکی نهێنی لە سترانی دەریاوانەکان،
کە لە خۆشنودی و شادیا، موچڕکەی لەرزیان پیادا
دێ..
بەڵام ئاخۆ کەسێ هەبوو گوێی بۆ ڕادێرێ!!

### 6-بەختەوەریم

لەو دەمەوەی گومانم لە بەدوادا گەڕاندا هەیە
فێری ئەوە بووم کە ببینمەوە..
لەو دەمەوەش "با" دوژمنایەتیم ئەکا
خۆم کردۆتە چارۆکەیەك و
بەگژ هەموو "با"کاندا ئەچمەوە..!

### 7-بۆ پیاوچاکان

چاکیەکانیشمان، پێویستە هەروا سوکەڵە بن
هەروەکو پەندی نێو هۆنراوەکانی هۆمیرۆس..
کە جارێك دێن و، جارێکیش دەڕۆن..

### 8-گۆرانی سەرمەستی

وریا بە ئەی مرۆڤ!
بزانە لە شەوانی دوورو درێژەوە
گوێ بیستی چی ئەبیت!؟
"من نوستم. من نوستم
وا ئەمێستاکەش لەو خەوە دوور و درێژە
ڕاپەڕیووم؛
ئەم گەردوونە قوڵە،
قوڵتر لەوەی ڕۆژگار درکی پێئەکرد
ئازارت بە ئێش و قوڵە
ئازار و ئێشێ- زێتر لە ژانی دڵێ
ئازار ئەڵێ: تێپەڕێنە، دەرباز بە
هەموو ئازارێ بەرەو نەمریی ئەچێ
نەمریش، بە قوڵی بەرەو ناوجەرگەی
هەتا هەتاییدا ڕۆئەچێ..!

### 9-نەبەز

لەهەر کوێیەکیت،
چاڵێ بەرەو قوڵایی هەڵکەنە

کانی، وا لە قوڵاییدایە
با خەڵکی نیشتەجێی قوڵایی
هاواریان لێهەستێ و بڵێن؛
لێرە، لەم قوڵاییەدا هەمیشە دۆزەخە..!

## پەراوێزەکان:

*1*-فەنا. بە مانای لەناوچوون و نەمان دێ، لێ فەنا-م بەلاوە ئاوازدارتر بوو.
*2*-گۆندۆڵ- بەو بەلەمە تایبەتیە ئەوترێ کە تەنها لە شاری ڤینیسیا/ی ئیتالیادا بەکاردێ.

### *فرێدریك نیچە/*

بیریارو مەزنە فەیلەسوفی ئەڵمانیی *1844- 1900* سەرەڕای ئەوەی لە سەرەتای نوسینداو هەر لە ساڵی *1871*-ەوە تا دوا ساڵی نوسینی لە *1888*دا، شێواز و ستایلی شیعریانەی لە دوتوێی سەرجەمی کتێبە فەلسەفیەکانیدا ( بە تایبەتی لە کتێبی ئاوا زەردەشت دوا دا) بە زەقی دیارەو، بە کاریگەری ئەندێشەو باکگراوندی شاعیرێتی خۆی سەپاندوونی بەسەر دونیا و جیهانی فەلسەفەدا، لێ نیچە دیوانێکی بچوکی (نامیلکەیەکی) شیعری نوسیوە بە نێوی "ستایشەکانی دیۆنیزۆس"ەوە. ژێدەری ئەم دەقە شیعریانە بریتیە لە: هەڵبژاردەیەك لە شیعری نیچە/ لە نامیلکەی مانوییڵ ئا. سوارێش لە ئەڵمانیەوە کردوونی بە ئیسپانی و لە *ABC* ناوبراوە وە کە وەرگێڕ، پاشکۆی ڕۆژنامەی ئا بێ سێ.
ژمارەی تایبەت بە یادی *150* سەدو پەنجا ساڵەی لەدایکبونی- ف. نیچە-ەوە لە ساڵی *1994*داو لە مەدرید بەچاپگەیەندراوە.



# لەگەڵ میشێل فۆکۆدا

-سنوربەزێنی فەلسەفە: میشێل فۆکۆ

▪ و. لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

ڕۆجێ پۆل دروا *Roger- Pol Droit* ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ میشێل فۆکۆدا سازداوەو، لە بەرواری *3*ی ئەیلولی *1986* واتە لە دوای دوو ساڵ لە کۆچی دوایی فۆکۆ لە ڕۆژنامەی لۆمونددا بڵاوکراوەتەوە، فۆکۆ لەم وتووێژەدا بیروڕاگەلێك سەبارەت بە ئەدەب و شێوازەکانی ڕزگاربوون لە داخرانی فەلسەفە دەردەبڕێت.

چالاکیی فۆکۆ هەزار ڕووی هەبوو، ناوبراو دۆزەرەوەی ئەرشیفگەلێك و ئاشقی مۆزیك و خەباتگێڕو ڕۆژنامەنووس و.. هتد بوو. کاروانە فەلسەفییەکەی لە زیندوێتییەکی فرەشێوەدا ڕەگوڕیشەی داکوتا. یەکێك لە نیشانە دانسقەکان ئەوەیە کە مردن تەنها یەك تاقە دەمامکی بۆ بەجێنەهێشت، ئەمەش وا دەکات کە (دەستنیشانکردنی) دژوار بێت -لێرەدا وشەی دەستنیشانکردن لایەقی فۆکۆ نیە- هەر بۆیە وەکی هەر جەنگاوەرێك هەر بە یاخی دەمێنێتەوە لە مانۆڕەکانی گەمارۆدان.

ئەم گفتوگۆیە لە ڕۆژی *20*ی حوزەیرانی *1975*دا واتە لە پاش بڵاوکردنەوەی کتێبی (چاودێری و سزا) لە شوباتی *1975* و بەر لە بڵاوکردنەوەی کتێبی (ئیرادەی زانین) لە کانونی یەکەمی *1976* ئەنجام دراوە.

پێویستە لێرەدا ئەو بارودۆخە ڕۆشن بکەینەوە کە هامرای ئەوە بوو. من لە حوزەیرانی *1975* لەگەڵ میشێل فۆکۆدا دەربارەی کتێبێکی چاپێکەوتن کارم دەکرد. مەسەلەکە وابەستە بوو بە دیاریکردنی پرسیارگەلێکەوە کە کارەکانی ئەو بە هەڵپەسێردراوی جێی هیشتبوون، هەروەها بە تیشك خستنە سەر هەندێ خاڵی نارۆشن و قوڵکردنەوەی هەندێ ئاراستەو ڕێچکە کە ئەو لێرەو لەوێ هێڵە سەرەکیەکانیانی دانابوو. بە کورتی ئێمە دەمانویست لە ڕێگای گفتوگۆوە کتێبێکی بە جۆرێك لە جۆران جیاواز دابنێین.

هاتم سەرلەنوێ هەموو دەقەکانی فۆکۆم خوێندەوەو، نزیکەی دە جاریش لە دانیشتنی ئیشوکاردا

چاوپێکەوتنمان کرد، ئەوەی کە مایەوە پانزە کاتژمێر بوو لە تۆمارکردن و نەقڵکردنی بۆ سەر سێ سەد لاپەڕەی ژمارە لەسەر دانراوو لەو کاتەوە هەمووی لە ئەرشیفەکانی مندا هەڵگیراون.

بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك کە دەکرێ بە چاکی دەرکیان پێ بکرێت و شیکردنەوەیان دژوارە، ئەم هەوڵە بێ ئاکام بوو، فۆکۆ دەیویست بەرەو پێش بچین و شتی تازە ئەنجام بدەین، بەڵام پرسیارەکانم دەیانگەڕاندەوە بەرەو کارەکانی و ئەویان لە شوێنی شرۆڤەکار دادەنا. ئەم پرسیارانە دەربارەی کاروانەکەی -بە هۆی کەم شارەزایی من و قەڵسبوونی ئەو بە "دواندن و بە قسەهێنان"- پاڵیان پێوە دەنا بەرەو سەرگورشتەی خودیی ڕۆشنبیری کە ئارەزووی نەدەکرد، ئیدی بە ڕێکەوتنێکی هاوبەشی نێوان هەردوو لامان واز لە پرۆژەکە هێنرا.

ئەم وتوێژە لێی نەقرتێنراوە یاخود جارێکی تر نەنوسراوەتەوە کە دەکرا فۆکۆ پیایدا بچێتەوە، هەر بۆیە تەنها بە هەڵبژاردنی چەند بڕگەیەك سەبارەت بە ئەدەب کە لە شەشەم کاسێتە دەنگیەکەوە گوڵبژێرکراوە بەسم کردوە. هەندێ درێژ دادڕیشم لابردوە. هەرچی بەشەکانی تریشە دەست تێوەردانەکەی من لە سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ڕستە زارەکیەکاندایە بە گوێرەی ڕێسای گوزارشتی نووسین.
کەواتە من بەرپرسی یەکەم و تاقە بەرپرسیارم لەم دەقە، دواجار سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە ئەم دەقە لە پێکەنین و ئاماژەو گەرموگوڕیی فۆکۆی کەمە، کە هەروەها لەسەر ئاستێکی فراوان هونەرمەندیش بوو -هەر تەنها بینینی لە کاتی وانەوتنەوەدا بەس بوو- تاقە هیوایەکیشم ئەوەیە کە لێرەدا بەڵگەیەك بمێنێ بۆ ڕۆشنیی فۆکۆ.

***پرسیار- لەنێو ئەو لێکۆڵینەوانەدا کە کردووتن، دەقە ئەدەبییەکان چ پلەوپایە یاخود چ سیستەمێکیان هەیە؟***

**وەڵام- من لە "مێژووی شێتیی" و "وشەکان و شتەکان"دا تەنها هێمام بۆ دەکردن، بە شێوازێکی ڕاگوزارانە ئاماژەم پێدەدان، دروست وەك ئەو گەشتیارە وابووم کە دەیوت: "کەواتە لێرەدا، وەك دەبینن، دەکرێ تەنها باس لە *Le neveu de Rameau*[1] بکەین" بەڵام من لە کۆنترۆڵکردنی خودی سیاقەکە خۆیدا هیچ ڕۆڵێکی نادەمێ.**

**هەمیشە ئەدەب بەلای منەوە بابەتی بینین بوە نەك بابەتی شیکردنەوە یاخود کورتکردنەوە یاخود ئاوێتەکردن لە خودی کایەی شیکردنەوە خۆیدا، پشوو وێستگە و دروشم و ئاڵا بوە.**

***پرسیار- ئایا ناتەوێت کە ئەم تێکستانە ملکەچ بە ڕۆڵی گوزارشتکردن یاخود پەرچدانەوەی ڕەوتە مێژووییەکان بکەیت؟***

**وەڵام- نەخێر.. (بێدەنگبوون و بیرکردنەوە) ڕەنگە پێویست بکات کە لەسەر ئاستێکی دیکە باس لە مەسەلەکە بکرێت.**


فۆکۆ

**لە ڕاستیدا ئێمە هەرگیز لە ڕێگای بارستایی ئەو شتانەوە کە دەوترێت، لە میانی ئەو گوتارگەلانەوە کە بە کردەوە هەن، ئەوەمان شی نەکردۆتەوە کە ژمارەیەکی دیاریکراو لە گوتارگەلەکان "گوتاری ئەدەبی، گوتاری فەلسەفی" بە پیرۆزو بە**

وەزیفەی تایبەت دەکرێن. پێدەچێ کە ئێمە، بە شێوەیەکی باو، وامان لە گوتارە ئەدەبی و فەلسەفیەکان کردبێت کە وەکی ئەلتەرناتیڤ گەلێك، یاخود وەکی بەرگێکی گشتی بۆ هەموو گوتارەکانی دیکە کاربکەن و، دەبێ ئەدەب ئەوە پڕبکاتەوە کە ماوە.

هەندێك بە تێپەڕبوون بە ڤۆنتینال *Fontenelle* یاخود ڤۆلتێر *Voltaire* یاخود دیدرۆ *Diderot* یاخود *La Nouvelle Heloise*[2] و هتددا بەروار نوسی بۆ ئەوە کردوە کە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەوترا. یاخود هەروەها ئەم تێکستانەی بە گوزارشتێك لە شتێك لە شتەکان دادەنا، کە دواجار ناکرێ لەسەر ئاستێك دابڕێژرێتەوە کە دەکرا زۆر ڕۆژانەتر بوایە.

لە بەرامبەر ئەم چەشنە هەڵوێستە لە پێشبینی کردندا "واتە ئاماژە کردن بۆ ئەدەب لە هەر کوێیەك بێ، بەبێ دیاریکردنی پەیوەندیەکانی بەوەوەی کە ماوە" ڕاشکاوانە چوومە سەر هەڵوێستێکی نێگەتیڤانە، ویستم بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانە سەرلەنوێ هەموو ئەو گوتارگەلە ئەدەبی یاخود نیمچە ئەدەبی (*Paralitteraires*)انە بخەمە پێشچاو کە بە کردەوە توانیبووی لە دەورانێکی دیاریکراودا دروست ببێ و، ئەدەبیشم دورخستەوە. بۆ نمونە لە (چاودێری و سزا)دا مەسەلەکە تەنها وابەستەیە بە ئەدەبی خراپەوە.

***پرسیار- چۆن چۆنی ئەدەبی خراپ لە ئەدەبی چاك جیادەکرێتەوە؟***

وەڵام- دروست، دەبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان باس لەوە بکرێت، لە لایەك پێویستە بپرسین کوتومت ئەو چالاکییە بەرجەستەبوە چیە لە ڕەواجدان بە ئەندێشەو قەسیدە و نوسینە گێڕانەوەییەکان.. لە کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکاندا، هەروەها پێویستە پرۆسەیەکی تریش شی بکرێتەوە کە ئەمەیە: لەنێو ئەم هەموو نوسینە گێڕانەوەییانەدا چی وا دەکات کە ژمارەیەکی دیاریکراویان پیرۆز بێت، کە ئیدی وەك "ئەدەب"ێك دەکەوێتە کارو، دەسبەجێ لەنێو دامەزراوەیەکدا وەردەگیرێتەوە کە لە بنچینەدا زۆر جیاوازە: ئەویش دامەزراوەی زانکۆییە کە ئێستاکە لەگەڵ دامەزراوەی ئەدەبیدا دەستی کردۆتە چوونە یەك بوون و هامڕایی.

لەنێو ڕۆشنبیریی ئێمەدا هێڵێکی دابەزینی زۆر ئاشکرا هەیە. بۆ نمونە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، زانکۆ ئەو توخمە بوو کە لە نێویدا ئەو شتە دروست دەبوو کە پێی دەوترێت ئەدەبی کلاسیکی، ئەو ئەدەبەی کە بە گوێرەی پێناسەکەی خۆی، ئەدەبێکی هاوچەرخ نەبوو، بە تاقە ڕێساو بنەمایش دادەنرا بۆ ئەدەبی هاوچەرخ و، هاوکات ڕەخنەیەکیش بوو لەم ئەدەبە. لەو گەمە سەیرو سەمەرەی سەدەی نۆزدەیەم لە نێوان ئەدەب و زانکۆ، لە نێوان نوسەرو زانکۆییدا.

ئینجا هێدی هێدی هەردوو دامەزراوە جوت بوەکە، وێڕای دوژمنایەتی نێوانیان، ئارەزوی ئاوێتەبونی تەواویان کرد. ئەمڕۆ هەموومان زۆر چاك دەزانین ئەو ئەدەبەی کە پێی دەوترێت ئەدەبی پێشڕەو تەنها زانکۆییەکان دەیخوێننەوە، هەروەها دەشزانین ئەو نوسەرەی کە لە تەمەنی سی ساڵی تێپەڕاندوە خوێندکارگەلێك دەورەی دەدەن کە بڕوانامەکانی خۆیان لەسەر کارەکانی

ئەو ئامادە دەکەن. دەشزانین کە نووسەران لانی زۆر لەسەر وانەوتنەوە و بە سیفەتی زانکۆیی بوونیان دەژین و گوزەران دەکەن.

کەواتە ئێمە لە ڕاستیدا شتێکمان لەلایە، ئەویش ئەوەیە کە ئەدەب بە هۆی گەمەی هەڵبژاردن (انتقاء) و پیرۆزکردن و نرخاندنی زانکۆییەوە وەك ئەدەب کاردەکات، زانکۆش لەم سەروبەندانەدا ڕۆڵی بزوێنەر و پەسەندکار دەبینێ.

***پرسیار– ئایا پێوانەگەلێك هەن کە وابەستە بن بە ناوەوەی دەقەکانەوە، یان مەسەلەکە لەوە تێناپەڕێ کە پرۆسەیەکی پیرۆزکردنەو دامەزراوەی زانکۆیی دەیکات؟***

وەڵام– من هیچ شتێك نازانم، تەنها دەمەوێت ئەمە بڵێم: بۆ ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەکی دیاریکراو لە ئەفسانە دابڕێین، بە سیمای گوزارشتیانەی ئەدەبیشەوە، دانانی ئەم پرەنسیپە گرنگە زۆر گرنگ بوو، ئەویش ئەوەیە کە ئەدەب تەنها پەیوەندی بە خۆیەوە دەکات، ئەگەر پەیوەندی بە نووسەرەکەیشیەوە بکات ئەوە وابەستە دەبێ بە شێوازی مردن و بێدەنگبوون و، تەنانەت بە لەنێوچوونی ئەو کەسەوە کە دەنووسێ.

لێرەدا گەڕانەوە بۆ لای بلانشۆ *Blanchot* یاخود بارت *Barthes* مان بەلاوە گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ بەهای ئەم پرەنسیپەیە، واتە تێنەپەڕیی ئەدەب *intranstivite*. دروست ئەوە یەکەمین قۆناغ بوو کە توانیمان بە هۆیەوە لەو بیرۆکەیە ڕزگاربین کە دەڵێ ئەدەب شوێنی هەموو تێپەڕبوونێکە (*lieu de tous les transits*)، یاخود ئەو خاڵەیە کە هەموو تێپەڕبوونێك دەچێتەوە سەری، یاخود گوزارشتە لە گشتایەتیەکان (*expression des totalites*).

بەڵام پێم وابێ لە قۆناغێك بەولاوە هیچی تر نەبوو. چونکە بە قەتیسکردنی شیکردنەوە لەم ئاستەدا، ناگەینە تێکوپێکدانی ئەو ڕستە پیرۆزکردنانەی کە لکێنرا بە ئەدەبەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پیرۆزیی زیاتری بەسەردا دادەبڕین. دروست ئەوەی کە لە ساڵی *1970*دا ڕوویدا هەر ئەمە بوو. سەرنجم دا کە بەکارهێنانی ژمارەیەك لە بابەتەکانی بلانشۆ یاخود بارت، بە جۆرێك لە ستایشی زۆر لیریکی و بە ئەقڵانی کردنانە بۆ ئەدەب، وەك بونیادێکی زمانەوانیانە بۆ خۆیان و لە خودی خۆیانەوە نەبێ شی ناکرێنەوە.

هەڵبەت تیۆرەگلانی سیاسیانەش نائامادە نەبوو لەم ستایشەدا کە بە هۆیەوە گەیشتنە ئەوەی کە بڵێن نوسین خۆی لە خۆیدا، تا ئەم ئاست و ئەندازەیە سەرفرازبوو لە هەموو دەستنیشان کردنەکان و، پرۆسەی نووسینیش خۆی لە خۆیدا پرۆسەی تێکوپێکدانەو، نوسەر لە پێڕەوکردنی خودی ئەم پرۆسەیەدا بەردەوام مافێکی هەیە لە تێکوپێکداندا.

بەم پێیە نوسەریش دەبێتە کەسێکی شۆڕشگێڕو، بە ئەندازەی نوسینێتی نوسینیش، لە تێنەپەڕێتی خۆیدا دەتەنێتەوەو، بزاوتی شۆڕش بەرهەم دەهێنێ! تۆ بۆ خۆیشت دەزانیت کە ئەمانە شتگەلێکن بە داخەوە وتران..

دروست میتۆدی بلانشۆ و میتۆدی بارت ئارەزووی دامالینی سیفەتی پیرۆزیی لە ئەدەب

دەکەن بە هەڵوەشاندنی ئەو پەیوەندیانەی کە لە جێگای گوزارشتی ڕەهادا دایدەنێن. ئەم دابڕانە وا دەگەیەنێ کە بزاوتی پشتیوان داماڵینی سیفەتی پیرۆزییە لە ئەدەب بە شێوەیەکی تەواو، هەروەها لە ڕێگای بارستایی گشتی ئەوەی کە گوتراش هەوڵبدەین بزانین کە چۆن و بە چ شێوەیەك لە کاتێك لە کاتەکانداو بە شێوەیەکی دیاریکراو ئەم ناوچە تایبەتەی زمان توانی دروست ببێ، ئەو ناوچەیەی کە نابێ داوای ئەوەی لێبکەین کە بڕیارەکانی ڕۆشنبیرییەك لە ڕۆشنبیرییەکان لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت. بەڵکو دەبێ ئەم پرسیارەی ڕووبەڕو بکەین: چۆن ڕۆشنبیرییەك لە ڕۆشنبیرییەکان دەتوانێ بڕیار لەسەر ئەوە بدات کە ئەم پلەوپایە دەگمەن و سەیرە بە ئەدەب ببەخشێت؟

*پرسیار- بۆچی سەیرە؟*

وەڵام- ڕۆشنبیریی ئێمە بە واتایەك لە واتاکان بەش (نصیب)ێکی هێندە سنوردار دەدات بە ئەدەب کە شایانی سەرسوڕمانە. ژمارەی ئەو کەسانە چەندە کە ئەدەب دەخوێننەوە؟ ئەو پلەوپایەیە چییە کە ئەدەب بە کردەوە لەنێو درێژبوونەوەی گشتی گوتارەکاندا داگیری دەکات؟

بەڵام خودی ئەم ڕۆشنبیرییە بۆ ئاراستەبوون بەرەو ڕۆشنبیری و لەکاتی خوێندندا ئەوە بەسەر نەوەکانی خۆیدا دەسەپێنێ کە بە نێو تەواوی ئایدیۆلۆجیایەکدا تێپەڕبن کە ئایدیۆلۆجیای ئەدەبە، لێرەدا جۆرێك لە لێکدژی زۆر ئاشکرا هەیە.

ناکرێ ئەوەش لەوە جیابکرێتەوە کە دەگوترێت نووسین تێکوپێکدەرانەیە، ئاشکراکردن و ڕاگەیاندنی ئەوەش لەلایەن کەسێکەوە لە گۆڤارێك و یەکێکی تردا هیچ بایەخێك یاخود دەنگێکی نیە. بەڵام ئەگەر لە هەمان کاتدا هەموو مامۆستاکان هەر لە مامۆستایانەوە هەتا ئوستادەکانی کۆلیژ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ پێت بڵێن کە گەورەترین بڕیارەکانی ڕۆشنبیرییەك لە ڕۆشنبیرییەکان و ئەو خاڵانەی کە لەلای دەچەمێتەوە.. پێویستە لەلای دیدرۆ یاخود ساد ***Sade*** یاخود هیگل ***Hegel*** یاخود ڕابلی ***Rabelais*** بە دوایدا بگەڕێین، ئەوکاتە زۆر بە چاکی دەبینیت کە دواجار مەسەلەکە وابەستەیە بە هەمان شتەوە. هەموان وا لە ئەدەب دەکەن کە بە هەمان شێوە کاربکات. کاریگەرییەکانی پشتگیری کردن لەم ئاستەدا ئاڵوگۆڕە، ئەوەی کە گروپگەلە پێشڕەوەکانی پێدەڵێن، لەگەڵ جەماوەری زانکۆدا هاوبۆچوونن، ئەم مەسەلەیەش ئابلۆقەیەکی سیاسی زۆر توندی دروستکردوە.

*پرسیار- تۆ چۆن لەم ئابلۆقەیە ڕزگار بوویت؟*

وەڵام- سەرەتا شێوازی من لە وەرگرتن و باسکردنی گرفتەکەدا لە کتێبەکەمدا سەبارەت بە ڕایمۆن ڕۆسێل ***Raymond Roussel*** و، ئینجا بە تایبەت لە کتێبەکەمدا دەربارەی پێیر ڕیڤیێر ***Pierre Riviere***دا بەرجەستە بوو، لە ویڕا لە نێوان هەردوو کتێبەکەدا هەمان پرسیار هەیە. لە چ ئاستێکەوە گوتارێك لە گوتارەکان (ئێدی گوتاری

نەخۆشـێك بێـت یـاخود تاوانكـارێك و.. هتـد) دەستدەكات بە ئیشكردن لەنێو كایەیەكدا كە بە كایەی ئەدەبی ناوزەد دەكرێت؟

بۆ ئەوەی كە بزانم ئەدەب چیە، نامەوێت لە بونیادە ناوخۆییەكەی بكۆڵمەوە، بەڵكو دەمەوێت جوڵەو بزاوت بگرم، دەمەوێت ئەو ڕەوتە بگرم كە لە ڕێگایەوە جۆرێك لە گوتاری نائەدەبی و فەرامۆش كراوو لەبیركراو، هەر لەگەڵ داڕشتنیدا داخڵ بە كایەی ئەدەبی دەبێ.

لێرەدا چی ڕوودەدات؟ ئەو شتە چیە كە دەستبەكار دەبێت؟ چۆن چۆنی لە ڕێگای دانپێدانان پیایدا وەك گوتارێكی ئەدەبی، كۆششەكانی دەگۆڕدرێت؟

*پرسیار– تۆ دەقگەلێكت بۆ كارگەلێكی ئەدەبی تەرخان كردوە كە لەوێدا ئەو پرسیارە ناكرێت، من بە تایبەت مەبەستم لە وتارگەلە بڵاوكراوەكانتە لە ڕەخنە Critiqueدا دەربارەی بلانشۆ، كلۆسۆڤسكی Klossowski، باتای Bataille، ئەمانە ئەگەر لەیەك بەشدا كۆیان بكەینەوە ڕەنگە وێنەیەكی نائاسایمان لە بارەی كاروانی فەلسەفی تۆوە بداتێ..*

وەڵام– بەڵێ، بەڵام.. (بێدەنگبوون) ڕەنگە قسەكردن لەسەر ئەم مەسەلەیە دژوار بێت، لە ڕاستیدا بلانشۆ و كلۆسۆڤسكی و باتای، ئەم سێ كەسە كە من لە كۆتایی ساڵانی شەستەكاندا بایەخم پێدان، بەلای منەوە لە كارگەلێكی ئەدەبی یاخود گوتارگەلێكی نێو ئەدەب زیاتر بوون، ئەوانە گوتارگەلێكن لە دەرەوەی فەلسەفەدان.

*پرسیار– مەبەستت چیە؟*

وەڵام– با نیچە بە نمونە بگرین، نیچە سەبارەت بە گوتاری فەلسەفی زانكۆیی، ئەو كەسەیە كە دەست لە گەڕاندنەوەی لایەنی دەرەكی بەرەو لای خۆی هەڵناگرێ. هەڵبەت سەرپاكی سیاقێكی فەلسەفەی خۆرئاوایی دەتوانێ لەلای نیچە ئاشنای خۆی بێ‌و خۆی بناسێ. ئەفلاتون و ، سپینۆزاو، فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەیەم و، هیگل.. هەموان بە نیچەدا تێدەپەڕن، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی كە وابەستەیە بە فەلسەفەوە نیچە خاوەنی توندی و سادەییەكی زبرو دەرەوەگەرانە *Exteriorite* و جۆرێك لە دێهاتیی چیاییە كە وای لێدەكات بە شان پیاكێشانێك و بێ‌ئەوەی كە ئەوە بە هیچ كلۆجێك ناچیزە بێت، بە توندییەك كە ناتوانین خۆمانی لێلابدەین، بڵێت: (ئەوە هەمووی قسەی قۆڕە..).

ڕزگاربون لە فەلسەفە بە زەرورەت مانای بێ ئابڕوویەكی لەم چەشنەیە. ئێمە بەوە لە فەلسەفە دەرناچین كە لە ناوەوەیدا بمێنینەوە، نەخێر، بەڵكو بە بەرهەڵستی كردنی بە جۆرێك لە گەوجێتی سەرسوڕهێن و خۆش و، بە چەشنێك لە قاقای پێكەنین كە تێیناگەین و، كە دواجار ئەو تێدەگات، یاخود بەهەرحاڵ كە دەشكێنرێت، بەڵێ كە زیاتر لەوەی تێبگات دەشكێنرێت، ئەوجا لە فەلسەفە دەردەچین.

هەروەها بە حوكمی ئەوەی كە من كەسێكی زانكۆیی و ئوستادی فەلسەفە بووم، هەر بۆیە پاشماوەی ئەو گوتارەی كە مابوو، گوتاری فەلسەفی باو، لەو كارەمدا كە دەربارەی شێتیی

کـــردم جارِســـی دەکـــردم، لـــێرەدا جۆرێـــك لـــە پاشمـــاوەی هیگـــڵ بـــەدی دەکـــەین، چونکـــە دەرخســـتنی شـــتگەلێکی نـــاچیزەی لـــە نمونـــەی راپۆرتـی پۆلیس، رێوشوێنی بـەندکردن، هـاوار و قیـژەی شێتگەل، ئەمانـە بە زەرورەت بـەس نین بۆ دەرچوون لە فەلسەفە. کەسانی وەك نیچە، باتـای، بلانشۆ، کلۆسۆڤسکی بـەلای منـەوە شـێوازگەلێك بوون بۆ دەرچوون لە فەلسەفە.

لـەوێرا لـە توندوتیـژی باتـایدا، لـە چەشـنە شـیرینیە فێـڵاوی و نائارامـەکانی بلانشـۆدا، لـە زەمبەلەکـەکانی کلۆسۆڤسـکیدا شـتێك هـەبوو کـە هاوکـات لـە فەلسـەفەوە دەردەچوو، ئیـدی بـەکاری دەبرد و دەیخستە شوێنی پرسیارەوە، ئینجا لێی دەرچوو دەگەڕایەوە.. لەوێرا شتێکی وەك تیـۆرەی موعاناتەکـەی لای کلۆسۆڤسـکی هەیـە کـە بـە ژمارەیـەکی بـێ شـومار لـە دەزوو فەلسـەفەی خۆرئـاوایی شـەتەك دەدات، پاشـان بـە شـێوەیەکی تەواو لە رێگای هونەری دەرهێنان (الاخراج) و، لە رێگای دارِشتن و ئەو شێوازەی کـە لـە *Baphomet* کـاری لەسـەردەکات لێـی دەردەچێـت، ئـەو شێوازەیش ئەمەیە:

ئـەم هاتوچوونـە لـە دەوری کـەناری خـودی فەلسـەفە وا لـە سـنوری نێـوان فەلسـەفی و نافەلسـەفی دەکـەن کـە شـایانی بـەزاندن بێـت، واتە دواجار دەیکەن بە سنورێکی ناچیزەی کـەم بایەخ؟

## پەراوێزەکان

*1*–ناونیشانی کتێبێکی دیدرۆیە.

*2*–ناونیشانی کتێبێکی رۆسۆیە.

## سەرچاوە

گۆڤاری "العرب و الفكر العالمی"

ژمارە (*9*) زستانی *1990*

# لەگەڵ فەیلەسوف "پیتەر زلۆتەردایك" دا

▪ لە ئەڵمانییەوە: بەکر عەلی

**پیتەر زلۆتەردایك**، تەمەن *54*، ڕێکتۆری کۆلیژی پێکهێنان لە کارلیرۆ کە تێیدا وانەی فەلسەفەو تیۆری میدیا دەدات. بەر لە دوو ساڵ بە گوتاری "چەند ڕێسایەك بۆ باخی مرۆڤ" توانی دێباتەیەکی فەلسەفی گرنگ لەمەڕ شوێنەوار و کاریگەریەکانی جێنتەکنیك بوروژێنێت. کاری سەرەکی ئەو کە بەر لەو گوتارە دەرکەوت، بریتیە لە "ڕەخنەی عەقڵی گاڵتەجاڕی– لە دوو بەرگدا" هەروەها "کایە–لە دوو بەرگدا". لە دیارترین و چالاکترین فەیلەسوفی ئەڵمانیایە، لە ڕووی ئاڕاستەیشەوە ناکۆکیەکی توندی لەگەڵ هابرمازدا هەیە و هەمیشە ڕەخنە لە مۆدێرنەو قەیرانە مۆڕاڵی و تەکنیکیەکانی دەگرێت، کاریگەری گەورەی نیچەو هایدیگەری پێوە دیارە. گۆڤاری *Wirtschaftswoche* گفتوگۆیەکی لەگەڵدا سازکردوەو ئەمەی خوارەوە کوردیەکەیەتی..

***پرسیار: بەڕێز پڕۆفیسۆر زلۆتەردایك، بەر لە دوو ساڵ ئێوە زاراوەگەلی "باخی مرۆڤ–Menschenpark"تان وروژاند، کە بە تایبەت بواری ئەدەب و هونەری گرتبوە خۆی، ئایا ئێوە لەوەدا تەبا دێنەوە کە هەنوکە سیاسەت ئەم تێمایە لە ئامێز دەگرێت؟***

**وەڵام: سیاسەت لەوەدا ڕۆڵی خۆی تەنیا وەك پێشکەشکەر و نمایشکەری سیستەمی پێوانەکان لەناو پڕۆسێسی ڕێکخستنەوەدا دەبینێت، ئەو پڕۆسێسەی لەم ساتەوەختەدا کۆمەڵگا چەواشە دەکات.**

**پرسیار: ڕێکخستنەوە بۆچی؟ ئەوەی لێرەدا جێگەی باسە بریتیە لە دەرفەتە تەکنیکیە نوێکان؟**

**وەڵام: ڕاستە، بەڵام ئێمە هەمیشە لە بەکارهێنانی چەمکی ڕێکخستنەوەدا فێری ئەوە بوین پەیوەستی بکەین بە نادەوڵەتیکردنێکی درەنگوەختانەی ئەرك و فەرمانەکانەوە، لە کاتێکدا ڕێکخستنەوە تێگەیشتنی گەلێك فراوانتری هەیە. ڕێکخستنەوە لە میانەی نوێکاریەوە بریتیە لە وەرگرتنی بنەڕەتیانە و جەوهەریانەی فینۆمێنەی بەهێزی مۆتۆڕی مێژوو. سەرجەمی مۆدێرنەش بریتیە لە ئەزمونێکی مەزن سەبارەت پێناساندنی نوێی کولتوری ئەو تەکنیکانەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تاقی نەکراونەتەوە.**

***پرسیار: ئێوە کام شوێنگەیە دەگرن؟ کاتێك بەر لە دوو ساڵ هەندێك لە ڕەخنەگران***

***ئێوەیان بە پاڵپشتیکەری جینتەکنیك – بۆماوەزانی– دانا؟***

وەڵام: ئەوە بەدحاڵیبونێك بوو، چونكە شیاو نیە فەیلەسوف لەپاڵ یاخود لە دژی تەكنیكدا بوەستێتەوە، بەڵكو قوڵتر لە تەكنیك گەیشتن، ئەمە سەروكاری فەیلەسوفە. من لەو گوتارەمدا "چەند ڕێسایەك بۆ باخی مرۆڤ *Regeln fur den Menschenpark*" خواستیاری ئەوە بووم بە شێوەیەكی بەرپرسیارانەتر لەم ڕەوتە فراوان و گشتیەی جێنتەكنیكدا قوڵبینەوە. لێرەوەیە پێویستە لەسەرمان ئێمە لە بنەڕەتەوە خۆمان ڕێنمایی و ڕێكخەینەوە.

***پرسیار: لە دێباتە -وتوێژ-ی جیندا، دیارە ڕەوشت تەوەرێكی زاڵە، ئەوەتا سەرۆكی وڵات (یۆهانز راو) ترسی لە شكۆ و پایەی مرۆیی – Menschenwurde هەیە و راوێژكاریش (گێردهارد شرویدەر) بەرامبەر ئەوە هەڵی كاردەستكەوتن دەبینێتەوە؟***

وەڵام: یەك مۆڕال یان مۆڕالی تاك بوونی نیە. ئەمەش لەم وتوێژەدا تەواو ڕونمان ناكاتەوە، چونكە ئێمە هەمیشە وەها ڕەفتار دەكەین، وەك ئەوەی ڕەوشت دواهەمین وشە بێت كە لە شێوەی تاكدا هەیە، ئەمە لە كاتێكدا مۆڕال كتومت هەروەكو كۆمەڵ شتێكی كۆیە.

***پرسیار: بە شێوەیەكی نزیكەیی ئەمە وەها دەزرنگێتەوە، وەك ئەوەی ڕەوشت بریتی بێت لە ویستن؟***

وەڵام: نەخێر، ئەو لە ڕیشەكانی خۆیدا لە ویستنەوە زۆر نابێت، هەرچەندە ڕیشەو سەرچاوەی گەلێك زۆری هەیە كە لێیانەوە جۆگەلەی پێوانەكانمان ڕۆدەكەین. یەكێك لەوانە بریتیە لە بواری شێوە ژیانی ماڵداریانە، واتە ئاكاری بواری نزیك كە هاتووچۆی نێوان مرۆڤ لەنێو كاتیگۆرە هاوسێكاندا ڕێكدەخات. باڵاترین بە گشتیكردنی ئەم سەرچاوەی مۆڕالە بریتیە لەو هیومانیزمەی لەم كاتەدا هەوڵدەدات وەك ئاكارێكی جیهانی *Weltethos* یاخود جیهانبەهایەك چێبێت، بەبێ جەختكردنە سەر ئەوەی كەوا لە ڕاستیدا ئەو تەنیا كەرتێكی بازنەی بواری مۆڕال لێكدەداتەوە. سەرچاوەیەكی تر بریتیە لە زانست و هونەری دەوڵەت و دەوڵەتایەتی، دەوڵەت هەرێمێكی فەرمانی خۆی هەیە كە ڕاپەڕاندنی ڕێكخستنەكانی لە بەگشتیكردنی بەهای خێزان كەمناكاتەوە. هەروەها مۆڕالە جۆراوجۆرەكانی ئایینە باڵاكان دیسانەوە سەرچاوە و ژێدەری تایبەتیان هەیە كە نە بۆ هیومانیزم و نە بۆ لۆگیكی دەوڵەت ناگەڕێتەوە.

***پرسیار: داخۆ لە دێباتەی جینتەكنیكدا ژێدەرەكانی مۆڕال خولقاندن دەبینرێتەوە؟***

وەڵام: ئەمە ساتێك ڕوودەدات كە كۆمەڵگا ڕوبەڕوی بەرەنگاربوونەوە و بەگژداچوونەوە دەبێتەوە، ساتێك كە سەبارەت ڕێبەریكردنی نوێی دڕندانەی گۆڕانە گەورەكەی تەكنۆلۆجیای كۆمەڵایەتی لێدوان دەكرێت. لێرەوەیە ئێمە لە ناوەندی جیهانێكی فانتازیدا دەژین، كە تیایدا شوێن ئەو ئەزمونە باوە دەكەوین كە وەك تۆڕی گرێچنراوی هەقیقەت دەچنرێت و هەروەها وەك كۆمەڵگایەك لەناو پرۆسێس بەردەوامی خۆدۆزینەوەیە بەرەو ڕێنیسانسێكی ڕەوشتی دەدات.

***پرسیار: ئایا ئەم پرۆسێسی خۆدۆزینەوەیە بەرەو ڕێنیسانسێكی ڕەوشتی دەڕوات؟***

وەڵام: نەخێر بەرەو ئەو ڕێنیسانسە بەم مانا تەمومژاویەوە نا، وەك ئەوەی ئیدی مرۆگەل چاك ببنەوە ڕەوتی زەمانە خۆی بەدبێت، من ئەمە بە بێهودە دادەنێم. بەڵام بەرەو ڕێنیسانسی کۆمەڵگای وتوێژ بڕوات، کە ئێمە وا ماوەیەکە لێی تەکیوینەتەوە، چونکە ئێمە *20* ساڵێکە لەناو کۆمەڵگای ئەڵمانیدا کەمتەرخەمی لە زێدە تەبایی *Hyperkonsens* شارستانیبوون دەکەین.

*پرسیار: ڕاوێژکار (گێرهارد شرویدەر) ئەنجومەنی ئاکاری نەتەوەیی Ethikrat دامەزراند. ئایا ئەمە ڕێگەیەکی دروستە، یاخود ئەمەیش دەکەوێتە ناو ئەو گوتەزایەی ناوتنا، زێدەهاوکۆیی یاخود زێدەهاوتەبایی؟*

وەڵام: وا پێدەچێ ئەنجومەنی ئاکار بەجێ نەگات، چونکە وەرگەڕانی مامەڵەی یاسایی و ڕاوێژی دژی ئەم ڕەوتە ئاشکرایە کە لەناو پەرلەماندا بەسەرچوە. ئەو ئەنجومەنە یاخود بڵێین ئەو دەستەیە کارەکتەرێکی ئینسترومێنتالی هەیە، ئەمەش وادەکات کە حکومەت دەنگە ئەزمونکراوەکان بکڕێتەوە. ئەوەی لەمەدا بەشداری بکات دەبێت پرسیاری ئەوەی لێبکرێت، داخۆ ئەو کاڵا تایبەتانەی خۆی، کە بۆ فرۆشتن نمایشی کردوون بە تەواوەتی پشکنیوە و تاقیکردۆتەوە؟

پرسیار: ئەنجومەنی ئاکار لە هیچ بارێکدا ڕێ لە هاوڵاتی و سیاسەتمەدار ناگرێت کە بەردەوامی و چالاکانە سەبارەت جینتەکنیك دەمەقاڵێ بکات؟

وەڵام: من پێشوازی لەمە دەکەم. هەڵبەت دەکرێت مرۆ بۆ ماوەیەکی کورت باوەڕ بهێنێت کەوا ئێمە کۆتایی وتوێژ -واتە کۆمەڵگای دیموکراتی-مان بینی. دیارە هەنوکەش ئێمە لە پێشدەم تەکنیکی گرنگدا ڕاوەستاوین، لێرەوەیە ئێمە دووبارە نمایشێك دەبینینەوە کە لە قوڵایی کۆمەڵگای وتوێژەوە سەریهەڵداوە.

*پرسیار: وتوێژ سەبارەت جینتەکنیك وەك سەرچاوەیەك بۆ لاوکردنەوە و گەنجکردنەوەی کۆمەڵگا؟*

وەڵام: کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەرەو بنەڕەتی خۆیان دەگەڕێنەوە، ئەمەش بریتیە لە لەدایکبونی کۆمەڵگا لە ململانێی هۆشیاریەوە یاخود لە ململانێی پارتە ڕاستەقینەکانەوە.

*پرسیار: ئایا ئێمە چیدی پارتی ڕاستەقینەمان نیە؟*

وەڵام: پارتی ڕاستەقینە تەنیا لەوێدا هەیە کە بەرژەوەندی جودای ڕاستەقینە هەیە. لەم ساتەوەختەدا ئێمە کەم تا زۆر جۆش و خرۆشی فێربوون و پێکهێنانی حیزبی دەژین. گەر ئێمە چاودێری بەفۆڕمبوونی ڕەوشتیانەی پارتەکان، هەوارگەی نارەسمی پارتێك لەگەڵ پارتێکی تەکنۆفۆبی (ترس لە تەکنیك) و یەکێکی تەکنۆفیلی (تەکنیکدۆست)دا بکەین، دەبینین لەم کاتەدا پارتی تەکنۆفۆبی *Technophobie* لەسەر دەسەڵاتە، ئەگەرچی ڕاوێژکار شرویدەر سەر بە ڕەوتی تەکنۆفیلە *Technophil*.

*پرسیار: شرویدەر بە دروشمی "ئاسایش لە وەرچەرخاندا" هەوڵدەدات هەردوولا لاقی ڕاست و چەپانەو بە پڕی بۆ SPD پارتی سۆسیال دیموکرات، والا بکاتەوە؟*

وەڵام: ئەوە کارێکی زۆر لێزانانەیە، چونکە بۆ ئەوەیە ئەتمۆسفێری جەمسەرەکان هاوسەنگ بکات، تاوەکو کۆمەڵگا بەرنەبێتەوە ناو شەڕێکی مەدەنی سیمەنتیکی -دەلالی- یانە لەسەر ڕەوتە بنەماییە شەڕانگێزەکان.

*پرسیار: ئەم شەڕی ناوخۆیە وا دەردەکەوێت لەسەر جینتەکنیك بێت، پێشتریش CDU پارتی دیموکراتی مەسیحی، دەرکی بەوە کردبوو؟*

وەڵام: خاڵێکی دژواریش لای سەوزەکان هەیە، ئەگەرچی زۆرینەی گەورەی ئەوان تەکنۆفۆبین، کەچی ڕەوتی ئەم دین گۆڕینە کە 10- 15 ساڵێکە لەناو حیزبدا ڕێدەکات، هەندێك لە سەوزەکان بەرەو باوەڕهێنان بە تەکنیك دۆستیەکی موعتەدیل بردوە.

*پرسیار: هەمان ئەو کردەیە لای SPDیش ڕێدەکات؟*

وەڵام: بەڵێ، چونکە SPD وەك پارتێکی کۆنی دابەشکەر Umverteiler دەڕوانێتە هاوپەیمانە چارەنوسسازەکەی (لە ڕوی ئیدیۆلۆگیەوە نا بەڵکو لە ڕوی سیستەمیەوە)، ئەوسا دەکرێت بە هەبوونی بازاڕێکی بوژاوەوە وەدوی ڕاوێژکار بکەویت.

*پرسیار: ئایا پێکهێنان و فێربوونی ڕەوشتی نارەسمیانەی پارتەکان لە چوارچێوەی وتوێژی جیندا کاریگەری لەسەر هەوارگە تراديسیۆنەکەی حیزب هەیە؟*

وەڵام: سەرەتا دەرەنجامەکە ئەوەمان نیشاندەدات کەوا ئێمە چوار پارتی سۆسیال دیموکرات و یەکی لیبرال ئابوریمان لە پەرلەماندا هەیە. ئەمەو لەناو PDS- دیموکرات سۆسیال- دا بەرەیەکی دژ بەرانبەر چەپە فاشیستەکان هەیە، بەرەیەك شیاوی ژماردن نیە، چونکە ئەو کینەیەك دژی کاپیتالیزم ئۆرگان دەکات، کە ناکرێ مرۆ هیچ شتێکی سەبارەت بڵێت، داخۆ ئەو چەپ دەگرێت یاخود ڕاست. هەر سیاسەتێك لە کینەو بوغزەوە دەربچێت، بە شێوەیەکی جەوهەری ئەو ڕوخسارە وەردەگرێت کە ئێمە بەهەڵە وەك ڕادیکالیزمی ڕاستڕەو ناوی دەنێین، لە ڕاستیدا ئەوە ڕادیکالیزمی هەڵچوونە Affektradikalismus یاخود رادیکالیزمی بەرپەرچدانەوەیە Verweigerungsradikalismus کە تیایاندا دەشێت چەپڕەو کتومت وەك ڕاستڕەو بێت. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هەنوکە PDSیش کەوتۆتە سەر کۆرسی بە سۆسیال دیموکراتیبوون.

*پرسیار: ئەمە چۆن بەردەوام دەبێت؟ ئایا دێباتەی جین دەتوانێت کەشوهەوایەك بسازێنێت کە بەرەو هاوپەیمانیەکی سۆسیال دیموکرات مل بنێت؟*

وەڵام: بەلای منەوە ئەمە کتوپڕییەك نیە. سۆسیال دیموکراتەکان لەو کاتەوەی بە ئاشکرا باوەڕیان بەرەو ئیدیۆلۆگیای ڕێگای سێهەم گۆڕی، لەودەمەوە بوونە بلێری (سەر بە تۆنی بلێر). بلێریزمیش بریتیە لە دەرەنجامی جوتبوونی لابور Labour و تاتشەریزم. ئەمەش دیسانەوە مانای پێدانەوەی ئەو قەرزە کۆنە دەگەیەنێت کە لە سەدەی بیستدا شێوەی کاری درێژخایەنی لەناو ئابوری گەرمکراوی دەوڵەتە سۆسیالیستەکاندا دارشت. بەم وەرچەرخانە سۆسیال دیموکرات توانیویەتی سەربەخۆیی خۆی لە ڕێی کۆمەڵگای خۆشنودیەوە بە گەمەیەکی بێکۆتایی ئابوریانە لەناو قوماری بێکۆتایی بازەڕەکاندا مسۆگەر بکات. لیبرالیزم و سۆسیال دیموکرات دوو ڕووی یەك دراون، چونکە هەردوکیان ناکۆتادارن Infinitis.

*پرسیار: ئایا دەشێت بگوترێت، ئەوان سنوور ناناسن؟*

وەڵام: بەڵێ، ئەوان سیاسەتمەداری سنوربەزێن و گەشەسەندنن. گەشەسەندن بریتیە

لە چەمکێکی بێلایەنکراو بۆ سنوربەزاندن و سنوردواخستن. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا هەمیشە پرۆسێس بەرەو هەڵکشان کراوەیە، لەبەرئەوەی لەوێدا هیچ سنورێك بۆ هاوردە *Einkommen* نیە. سنورێك بۆ قایلکردن و سەنگپێدانەوە و سنورێك بۆ خۆبەدیهێنان نیە. بە پێچەوانەی گریمانکاری *Hypothese* ی سەردەمی ئەنتیکەوە، کە مرۆڤ دەشیا تێربێت، ئەمەش بنەمایەکی ئەنترۆپۆلۆگی دونیای کۆن بوو، لە کاتێکدا مرۆڤ لە مۆدێرنەدا لە وەدوکەوتنی ئامانجەکانی تێر نابێت.

*پرسیار: کەواتە سۆسیال دیموکراتەکان دەخوازن ئەم سیاسەتی تێرنەبونەی nimmersatte سنوربەزاندن درێژە پێبدەین؟*

وەڵام: لەگەڵ (سەوزەکاندا) هەروا ئاسان ناکەوێتەوە، وەك لەگەڵ لیبرالەکاندا وایە.

*پرسیار: ئەی سۆسیال دیموکراتەکان دابەشکەر Umverteiler نین؟*

وەڵام: ئەوانیش دابەشکەرن، ئەوان تێبینی ئەوە دەکەن کەوا دابەشکردنەوە بە شێوەیەکی ناکۆتا پابەندە بە بەها ئەفراندنەوە. لێرەوەیە چ کتوپڕیەك لەوەدا نیە کاتێك سەرەك وەزیرانی سۆسیال دیموکراتیش لە ڕێبەرایەتیکردنی ئاراستەی تەکنۆلۆژیای نوێ لادەدات. کتومت ئەوەشی تازە لەناو بوارێکی هەستیاری وەك هیومانبیۆتەکنیك (تەکنیکی زیندەگیانەی مرۆ)دا ڕوودەدات، ڕەنگە کەمێك بەدکارانە بێت، بەڵام لە دواجاردا وەدوی بەرژەوەندی تایبەت دەکەوێت.

*پرسیار: ئایا لە سەردەمی گلۆبالیزەکردندا هەرچۆنێك بێت ناشێت ئەوە شیاو بێت کە ڕێ لە هەڵفریواندنە تەکنۆلۆژیە نوێکان بگیرێت؟*

وەڵام: بەڵێ، گلۆبالیزاندن لەسەر ناردنە دەرەوەی زۆر سەرکەوتوانەی کاڵا هەڵکشاوەکانی زیندەگیانەی ئەوروپا هەڵچنراوە. ئەوروپیەکان دەسەد ساڵێك دەبێت بەرهەمگەلێکی ئەوتۆیان گەشەپێداوە، بە ڕادەیەك کە دەشێت بگوترێت زۆر دراماتیکیانە شێوەژیانی هەموو لایەکی گۆڕیوە، کاتێکیش مرۆ بەهای بەکارهێنانی ئەم بەرهەمە نوێیانە دەناسێتەوە ئیدی دروست لە پێناوی چونە ناو ئەم ناوەندەوە بە ڕێسای ململانێی خانەدڵیدا (غیرە– *Eifersucht*) تێدەپەڕێت.

*پرسیار: ململانێی خانەدڵی چۆن؟*

وەڵام: هەموو ململانێکان بریتین لە پرۆسێسی خانەدڵی، گەورەترین ململانێ، ململانێ نیە بۆ چاکە، بەڵکو بەر لە هەر شت ململانێیە بۆ ئەو شتەی بە خەڵاتکردنی مەعنەوی و نامادیانە ناودەهێنرێت. هیگل ململانێی بە مۆتۆڕی ڕاستەقینەی مێژوو ناساندوە.

*پرسیار: ئەی بۆچی بریتی نەبێت لە ئێرەیی -حسد Neid– مۆتۆڕی مێژوو؟*

وەڵام: هەڵبەت هەردوو چەشنەکە هەن، بەڵام بۆ ئەوە خانەدڵی گوزارەیەکی گونجاوترە، چونکە دەکرێت بڕوا بەو دەرفەتانە بهێنین کە پێشبڕکێچیەکان لە پێشبڕکێیاندا بۆ چاکەیەکی دیاریکراو بتوانن بکەونە بەراییەوە. ئەوەش ساتێك دەبێت کە لە بەربەرەکانیەکەوە فێری چنۆکیەك بین لەو شتانەی کە هەمانە. لە ئێرەیی پێبردنیشدا خانەدڵی لە لوتکەی ئەفراندنیدا پیادا دەکێشرێت و کەمبوونەوەی ئەوانی تر کاریگەری لەسەر زەمینەی بەردەم ئەودا دەبێت.. ئەوەی من نیمە، ئەوی تریش نابێت هەیبێت.

*پرسیار: پاشان دەشێت خانەدڵی پتر بە دەرفەتی ئازادیەوە بەسترابێتەوە، لە کاتێکدا ئێرەیی بە یەکسانیەوە؟*

وەڵام: بەڵێ، دەکرێت بەدایەتی دەستبەرداربوون ئاسانتر بە گشتی بکرێت.

*پرسیار: کەواتە کۆمەڵگا حەسودەکان لە ڕێی دابەشکردنی زۆرتر و لە ڕێی ڕێژە بەشی دەوڵەتەوە Staatsquote هەڵ دەکێشن، دەکرێت ئەڵمانیا ئێرەیی بە ئەمریکا ببات و کۆمەڵگایەکی خانەدڵیش بێت؟*

وەڵام: بە دڵنیاییەوە وایە. دەوڵەتیش لێرەدا وەك ڕێکخەرێك بەپێی پرەنسیپی سنوردارکردنی گشتی کاریگەری خۆی دەبێت.

*پرسیار: هەنوکە گلۆبالیزاندن پاشەکشەکردنەوەی دەوڵەت پێویست دەکات و بۆ ئەمەش ناڕاستەوخۆ هانی دامەزراندنی کۆمەڵگای شارستانی دەدات؟*

وەڵام: چونکە دەوڵەت فەرمانبەرێکی بە زەبرەو هەرواش دەمێنێتەوە، ئەمەش چ ئەلتەرناتیڤ و جێگرەوەیەکی نیە. لای ئێمە ئابوریناسی مرۆیی بە هیچ جۆرێك لە کایەی ئابوریدا نازێت، بەڵکو لە نەخۆشخانە دەوڵەتیەکاندا لەدایك دەبێت و لەناو خێزاندا پێدەگات و لە خوێندنگا دەوڵەتیەکاندا پەروەردە دەکرێت و لە زانکۆ دەوڵەتیەکاندا فێردەکرێت، پاشان کاتێك دەگاتە تەمەنی هۆشیاری، خۆی درندەیەکی لێدەردەچێت و لە مەیدانی بازاڕدا بەجێدەهێڵرێت، بەڵکو گەر بلوێت بۆمان و بڵێین، ئەوا پێویستە بگوترێت لەسەر دووەم ڕێی فێرکردندا ژیانی دووەم دەستپێدەکات بۆ ئەوەی ئەو ڕەخنەکاری و بەهاپێدانە مۆڕالیە فێربێت کە سەر بەون، هەروەها بۆ ئەوەی لەو دیمەنەی تردا توانای جوڵەی هەبێت.

*پرسیار: کۆمەڵگای ئێمە بە شێوەیەکی ئەوتۆ بونیادنراوە کە نەتوانێت خۆی لە سەرپەرشتیکاری دەوڵەت ڕزگار بکات؟*

وەڵام: هەرچۆنێك هێندە دوور نیە. ڕاپەڕاندنی ڕێکخستنی دەوڵەتیمان بە شێوەیەکی وەها بەرفراوان و سەرانسەری و لێك جودا کە بە چاوێکی دووربینانەی لە ڕادەبەدەر داوای هێزەکانی بازاڕ دەکات، دەشخوازێت ئەمە بە دەرهێنانێکی تایبەت بە خۆی ڕاپەڕێنێت. هەندێکیش لەو پێوەرانە بۆ نادەوڵەتیکردنەوەی خوێندنگاکان و زانکۆکان و زانستەکان شتێکی سودمەند دەبوو. ئەمەش پێشوەخت بریتی نیە لە کارەساتێکی کولتوری، گەر زانکۆ ئێلێمێنتی – توخم– زیاتری ئابوری تایبەتی دامەزراوەیەکی کارگێڕانە قبوڵ بکات، ئەگەر زاناکانیش کەمێك کەمتر پابەندی بیرۆکراتی بن، بە دڵنیاییەوە ئەمەش لە ئەڵمانیادا دەبێت.

*پرسیار: ئەمە چۆن دەکەوێتەوە، لە کاتێکدا ئێمەی ئەڵمان باوەڕی پتەومان بە دەوڵەت هەیە ، کەمێك پێچەوانەی وڵاتە ئەنگلۆسەکسۆنیەکان؟*

وەڵام: ئەمە پابەندە بەوەی کەوا ئێمە وەك هەموو میللەتانی کیشوەرەکان هەرێمگەریەکی – Terriroialismus– زۆر پتەومان لە بیرۆکەی دەوڵەتدا گەلاڵە کردوە. واتە دەوڵەت لەبەر ئەوە هەیە کە دەبێت مرۆ لە پێناویدا بمرێت، دواجاریش دەوڵەت دەبێتە یەکەیەکی قوربانی یاخود تێگەیەکی قەدەری، ئەمەش شتێکە پێشتر کولتورە کەنار دەریاییەکان –

ئەنگلۆسەكسۆنیەكان– ئەم شێوەیەی كۆچەری نوێیان –neunormadisch– بێگومان بەر لە هەموان ئینگلیزەكان و ئەمریكیەكان -هەرگیز وەها بەجێ نەگەیاندوە. بەڵام لەم كاتەدا ئێمەش خۆمان لەو دەوڵەتە زەبەلاحەی كە مەرگ دەبەخشێت و قوربانی داوا دەكات دادەبڕین.

*پرسیار: گەر بڕوانینە ئەو پێوانە گەشەكردوەی "هەڵهاتن لە باجدان"، مەبەستم ئیشی ڕەشە Schwarzarbeit، ئەوا دەبینین ئەڵمانەكانیش هەمیشە هێندە ئامادە نەبوون ببنە قوربانی مادییانە بۆ دەوڵەت.*

وەڵام: بەڵام ئەمەیان پابەندە بەوەی كە پلەكانی باجدان لە ئاستە مێژوییەكەیاندا زۆر بەرزن، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی پێی دەگوترێت قازانج و دەستكەوتی باشتر، ئەوا لە دەستكەوتدا تەنیا پلەی باشتر *Komperativ* هەیە، لە كاتێكدا لە باجداندا پلەی باشترین *Superlativ* هەیە. مرۆ بۆ سەركەوتن سزا دەدرێت، ئەمەش ئاماژەیەكی هەڵەیە، كەوا هەمیشە لەو دەوڵەتە زەبەلاحەی هەیە بە بیرۆكەیەكی هاوبەشی گەورەوە و بە ئیدیۆلۆگیای دابەشكردنەوە دێتە دەرەوە و ئەوساش بریندارکردنی ماڵداریتی هاوڵاتیان شتێكی بیانوودار و پاساودار دەبێت، بەڵام ئارامگرتنی هاوڵاتیان بەرامبەر بەم سەرزەنشت و تەعەدا كردنە هێوردەكاتەوە، لەبەرئەوەی "باج" هەمیشە تەنیا وەك ئازارێك دەمێنێتەوە.

*پرسیار: كەواتە ئەوە چۆن دەشێت، هاوڵاتیان كەمتر ئازار بكێشن و حەزیش لە باجدان بكەن؟*

وەڵام: ئەمەش پابەندە بە ئەركەكانەوە، واتە باجەكان دەبێت بە زوبیەكت بكرێن تاوەكو نەك هەر كزبوونی شتێك لەوەوە بدرێتەوە كە پاشەكەوت كراوە، بەڵكو بۆ ئەمەشە تا مرۆ بتوانێت ئامانجێك لە ئامێز گرێت. لێرەدا ئامێزاندن *Sponsoring* نمونەیەكی شیاو پیشان دەدات.

*پرسیار: ڕەنگە ئەمە سیستەم بەزاندنێك بێت، باجەكان ناكرێن خزمەتی ئامانجێكی كۆنكرێت بكەن، بەڵكو هاریكاری سەرجەمی كارەكانی دەوڵەت دەكەن.*

وەڵام: بە دڵنیاییەوە، كاتێك كە دەوڵەت تەنیا وەك خەیاڵسازی بەڕێوەبەری گشتی كۆمەڵگا هەموو دەستكەوتەكان ڕابكێشێت و نەشڵێت چیان لێدەكات، ئەوا ناچالاكی باج *Steuerpassivitat* سەرهەڵدەدات و لە كۆتاییشدا هاوڵاتی لە ڕێی هەڵاتن لە باجەوە خۆی دەكێشێتەوە. ئەوەی شتێك سەبارەت دیاریكردن و تەرخانكردنی زیرەكانە تێبگات، ناتوانێت لەوەدا تەبا بێت كە چۆن ئەم كردەی دابەشكردنانە سازدەكرێن. گەر لێرەدا حكومەتەكان وریاتر و زرنگتر نەبن ئەوا ئێمە دەبێت هەمیشە چاودێری هێزی ئەم كاریگەریە سۆسیالسایكۆلۆگیە نامۆیە بكەین كە هەمیشە وا دەكات مرۆڤە خۆشنودەكان نائاسودە بن.

*پرسیار: پێدەچێت دەوڵەت بەوە هەرەشە لەو هەبوونە تایبەتیەی خۆی بكات كە تیایدا ئەو متمانەیەی كۆمەڵگای لەسەر هەڵچنراوە تێكدەشكێنرێن.*

وەڵام: بەو جۆرەیە، بوارێكی بێشوماری دابەشكردن هەیە كە دەتوانن لەگەڵ ناوەندەكانی تردا كاری گەلێك كاریگەرانەتر و زیرەكانەتر بكەن، من بیر لەو پارەی بێكاریە دەكەمەوە كە پێویست

دەکــات لەگــەڵ تــەواوی دەوڵــەتی سۆســیالدا، کــە زۆرتــر بــە مانــای هــاندانی خاوەنکاریــەو کەمتریش لــە شـێوەی بـەکارهێنانی دەوڵەتیدایـە، ڕێکبخرێن.

***پرسیار: ئایا فیکری خاوەنکارێتی دەوڵەتی سۆسیال قوتار دەکات؟***

وەڵام: بـــەڵێ، ئێســـتا خاوەنکـــار دەبێتـــە ئومێدبـــەخش. بـــەبێ بزوتنەوەیـــەکی خاوەنکــاری وەك لـــەوەی جــاران بزوتنـــەوەی کرێکاری هـەبوو، ئـەوا ئـابوری کۆمـەڵگا بەرانبـەر ئـەوە چیـدی نـاتوانێت ڕونکردنـەوەی گونجـاوی هەبێت.

***پرسـیار: ئـەی شـەفافیەت Transparenten لەسەر چی بەندە؟***

وەڵام: "خاوەنکارانی دونیا، یەکگرن" هیچی تر. لەم ساتەدا تەنیا خاوەنکاران دەتوانن بایـەخی پەیکـەرە دروسـتکراوەکان، واتـە بـەها خوڵقـاوە ڕاستەقینەکانی پیشەسازی و ئەرکە خزمەتیـەکان بەرانبــەر ئــەم ســەرخانە تارمــایی ئامێزانــەی ئابوری مادی شیاوانە *Phantomatishen Uberbau* بەرجەستە بکات. تەنیا بزوتنەوەیەکی خاوەنکاران دەتوانێت بە جۆرێك لـە جۆرەکـان کاربکاتـە سـەر دژە سەرمایەداری، کە ئێستا ئەوە پێویستە. ئێمـە پێویسـتمان بـە خاوەنکـارێکی دژە کاپیتالیزمـە *Antikapitalismus- Unternehmer.*

***پرسـیار: ئایـا خاوەنکـار وەك ئەلتـەرناتیڤی وێنـەی شـێوێنراوی گلۆبـالیزاندن و هەڵڕشـتنی پارەی نادیار بە دەوری جیهاندا دەردەکەوێت؟***

وەڵام: دەبێت خاوەنکاران ئەوە پیشان بدەن کــەوا بنــەمای ئــابووری بــازاڕ دەکەوێتــە نــاو ئابوریـەکی ئۆپـەراتیڤی (چالاك و بەکار)یـەوە نـەك دیکتاتۆریەتی پاشاکانی یانسیبەوە *Lottokonige.* ئایـا لەمـە تێدەگـەن؟ ئەمـە دۆخەکەیـە، بـەم پێیـە خاوەنکـاران بریتـین لـە سۆسـیال دیموکراتـەکانی سبەینێ.

***پرسیار: ببەخشن، چۆن؟***

وەڵام: بێگومان وایـە، ئەگـەرچی لـەم کاتـەدا خاوەنکـــاران وەســـفە خۆییـــەکانی نیـــو لـــبرال دەسازێنن، کەچی ساڵ بـە سـاڵ خـۆی پـتر هەڵـە پیشـاندەدات، لەبەرئـــەوە ئەنجامـــەکانی دواتـــر دەشـــێن تـــەنیا وەك بەرهەمـــهێنراوێکی بـــەها خولقـاندن پاسـاویان بدرێتـەوە، کـە خزمـــەتی دیوەکەی تری دابەشکردن دەکەن.

***پرسیار: بەم پێیە ئیدی خودی ئابوری خۆی هەڵدەستێت بە جێگیرکردنی کۆمەڵگا؟***

وەڵام: دروست وایە. ئێمـە سـێ میکـانیزمی دابەشــکردنمان هەیــە، بــاج، بۆرســەی بــازاڕ و دامــەزراوەکان. دابەشــکردن پێویســتە هــەبێت، ئەگەرنا دەوڵەتایەتی و یاساکانی مەدەنی گەر بە تــەواوەتی هاریکــاری مــادی نــەکرێن ئــەوا هــەژار دەکــەون. لـەپاڵ یەکـەم شـانۆی دابەشـکردنەوەی سۆسـیال دیموکراتـیزمدا، کـە چیـتر قەناعــەتێکی درێژخایــەنی نیــە، ئــەوا ئــابوری بــاڵی دوەمــی دابەشکردنی هێناوەتە ئاراوە، کـە بـە سیسـتەمی بەشـــداری یـــاخود خاوەنبـــەش *Shareholder* ناودەبرێت.

***پرسـیار: کەواتـە ئـەو دوو شـانۆیە بریتـین لـە کاپیتالیزمی بەشداری و دابەشکردنەوەی دەوڵەت، ئەی شانۆی سێیەم چیە؟***

وەڵام: من ئـەوە بـە چەمکی زوبیـەکتیڤی بـاج ناودەنێم. لـە دونیـای ئەنگلۆساکسـۆنیدا نمونـەی گونجاومــان لەبەردەســتدایە کــە جۆرێــك لــە

تەقلیدیەتی کاپیتالیزمی جەنتلمانی پێوە دیارە. ئەوەی هێزی کالڤینیزم بوو کە بوە هۆی پەیدابوونی جۆرێك شێوەی مرۆڤ کە ئامادەبوو وەك جەنتلمان -نەجیبزادە-یەکی مەسیحی سەرمایەدارێك پێنج ملیۆن پاوەند بەدەست بێنێت تاوەکو هەموو بەشداربوان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا چوار ملیۆن پاوەند لە ڕێکخراوەکاندا خەرج بکەن. ئێمە پێویستە خەڵکە دەوڵەمەندەکانمان لە ڕووی کولتوریەوە سەرلەنوێ فێربکەینەوە و سازبکەینەوە و ئەوەیان لا ئاشکراکەین، کە تەنیا دەوڵەمەندبوون بەس نیە.

*پرسیار: ئێوە داوای کالڤینیزمێکی نوێ دەکەن؟*

وەڵام: کالڤینێکی نوێ؟ نەخێر ئەو لاوێکی بەسام و وەڕس بوو. گەر وەها بێت ئەوا پێدەچێت من تێکەڵی لە نێوان دەرهێنەرێکی ئۆپێرا و ئەلبێرت شڤایتزەردا بکەم، واتە یەکێك کاریزما پێشکەش دەکات و هەروەها ئومێد بە ملیۆنێران دەبەخشێتەوە؟

*پرسیار: بۆ ئەوەی پێبەخشینیش خۆشی تێدا بێت؟*

وەڵام: دەوڵەمەندی پێویستە خۆشی تێدا بێت، بە جۆرێك کە وشەی "خۆشی" لە خۆی دەردەچێت و بەرەو هەندکاری -جدیەت- تێپەڕێت. دەوڵەمەندی، لەو کاتەدا ڕێ بە بەجێهێشتنی کولتوری خۆشی یان بەخیلی یاخود دڵەڕاوکێ دەدرێت، دەبێتە جیدیەتێکی زۆر. بەڵام بە داخەوە خەڵکی بەوە نازانن کە تاکە هەستێك پاساوی ژیان بداتەوە بریتیە لە هەنگاونانی گەورەی بەردەوام. لە وڵاتی ئێمەدا خەڵکانێکی زۆر هەن کە هێشتا لەو ئاستەی دەوڵەمەندیدا نین، تاوەکو ئەم زیرەکیەی قازانج و ئەم هەنگاوە گەورەیە بکەنە بەخشندەیی و دڵئاوایی "سخاء-*Genorositat*".

*پرسیار: ئەمە دەشێت وەها ڕونبکرێتەوە، ئەڵمانەکان هەرگیز وەکو ئەمرۆ خۆشنود نەبوون، کەچی لە هەمان کاتدا ئاسودە نین؟*

وەڵام: بەڵێ خەڵکی بەمە وڵات دەخەنە ناو زیندانێکی سۆسیال سایکۆلۆگیەوە و تاکە دەرفەتێکیش لەوەدا هەبێت، ڕەنگە بریتی بێت لە شەهوانیەتی زەوتکردنی نوێی شوێنە ڕەسمیەکان لەناو کولتوری هەنگاوی گەورەی ڕەسمیانەدا یاخود گشتیانەدا. ئەوسا دەوڵەمەندی پاساوێکی نوێی دەبێت.

*پرسیار: ڕەنگە مرۆگەلیش دروستتر ببنەوە؟*

وەڵام: من نامەوێ بڵێم زەوقە خراپەکە دەڕەوێتەوە، چونکە ئەو زۆر ڕۆچۆتە ناو سیستێمەوە. ئێمە لە دواجاردا کارمان لەگەڵ قەبارەی گەورەی کاپیتالیزم و ماشێنی بەخیلی و ماشێنی خانەدڵیدایە. ئەم بنەما لەقاندنە ناکرێت وەلانرێت، بەڵام بە گشتی خراپەیەکی زۆر بەرز لادەبات، ئەگەر لەو شوێنەی کە پارە خەرج دەکرێت ئازادی زۆرتر و هەنگاوی گەورەی زۆرتر بژی، ئەم زیندەخەونەش بەخشینێکی جێگیرمان بۆ دەهێنێتەوە، واتە، ئیدی پێویستە گۆشەگیربوونی ڕۆحیانەی مرۆڤی دەوڵەمەند لە کۆمەڵگاکەماندا بشکێنرێت.

**سەرچاوە**

*Wirtschaftswoche 19.07.2001*

# چەمکی ڕۆشنگەری و ماناکانی لە هزری ئەورووپیدا

• هاشم ساڵح

▪ لە عەرەبییەوە: زریان عومەر دەشتەکی

توێـــژەرەوەی بـــەلژیکی "ڕۆلان مۆرتێیە" باوەڕی وایە، کە ســـەدەی هەژدەهـــەم یەکـــەمین سەدەیە لـە مێـژوودا هەسـتی بـە خودگـــــەرایی و قـــــەوارەو یەکگرتوویی خۆی کردبێت.

هـــەروەکو چـــۆن هەســـتی بەوەیش کردوە، کە ڕاسپێردراوە پـــەیامێکی گرنگـــی مرۆڤایـــەتی بگەیەنێت، ئەویش ڕۆشنگەریە.

یەکەمین سـەدەیە بەرنامـەی کـــاری لـــە ڕێگـــای کتێبـــی فەیلەســـــوفەکان و شـــــەرە فیکریەکانیانەوە دارشـتبێت، کـە سیمایەکی دیاری هەبووبێت.

زاراوەی ڕۆشـــنگەری هـــەر خۆی بۆ ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە. بۆ ئـەوەی لێـی تێبگـەین، ئـەوا پێویســـتە بـــەراوردی ڕونـــاکی/ تـاریکی، یـاخود دیـار/ نادیـار بکەین. هەر ئەو زاراوەیـە مانـای مـۆرالی ئەپسـتمۆلۆژی لـە خـۆی دەگرێـــت، بـــەوەی کـــە ئـــەو دژایەتیـەی لـە نێـوان ڕونـاکی و تـاریکیدا هەیـە، لـەو دژایەتیـە دەچێـت، کـە لـە نێـوان چـاك و خـراپ، ڕاسـتی و هەڵـە، زانـین و نەزانیندا هەیە.

وا دەردەکەوێت ئەو زاراوەیە زاراوەیـەکی ئـاینی بوبێـت پێـش ئـەوەی فەیلەسـوفانی سـەردەمی ئەقڵ واتـە سەدەی هەژدەهـەم بـە تایبـەتی ئیشـیان پێـی کردبێـت. "واتـە خسـتبێتیانە نـاو کایـەی ئەقڵەوە -وەرگێڕ". بۆ نمونـە لـە "سفر التكوين"دا ئەم پەرەگرافـە دەخوێنینـــەوە: "ئینجـــا خـــودا ئەوەی بەدی کرد، کـە ڕۆشـنایی چاکەو لە تاریکی جیاکردەوە".. بەوەی کە خودا خۆی خوڵقێنەری ڕوناکیـــە، هـــەموو ســـیفەتە جوانـەکانی خـۆی تێـدا دۆزیـەوە. هـەر بۆیـە خـودا لـە "تـەورات"دا خۆی بە "ڕونـاکیی هەمیشـەیی" دەناسـێنێت و ڕویشـی پرشـنگ دەداتـەوە. وتەکانی ڕونـاکن.. لـە دوای ئـــەم ئینجیلیـــش هـــات و هـەمان وێنـەی دوبـارە کـردەوە، بـەوەی کـە مەسـیح لـە بـارەی خۆیەوە وتی: من ڕوناکی دنیام، ئەوەی پەیڕەوم بکات، هەرگیز بە

تاریکیدا ناڕوات، بەڵکو ڕوناکی ژیانی دەستگیر دەبێت".

"مۆرتیە"ی پرۆفیسۆر دەڵێت: "ئەم تێگەیشتنە ئاینیە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست لە کتێبی لاهوتیانی مەسیحی و سۆفیەکان و کەسانی ئاینیدا بەردەوام بوو. ئەمەش مانای سروش "وحی"ێکی ڕوناك، یاخود گەش دەگەیەنێت، کە سروشتی مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە و ئامانجەکانی ئەم دنیاو ئەو دنیاشی دەردەخات، بگرە هەر بەم پێودانگە ئەرکەکانیشی بۆ دیاری دەکات".

لاهوتیەکان لە بارەی "ڕوناکی خواوەندی"، یاخود "ڕوناکی باوەڕ"ەوە دەدوێن، کە لە هەندێك کەسایەتی جیاوازی مێژوودا وەکو پێغەمبەران و سۆفیە گەورەکاندا دەردەکەوێت.

بەڵام ئەم چەمکە ئەوەیش دەگەیەنێت، کە لە کەلتوری ئاینی کەنیسەی مەسیحیدا بەکارهاتوە.. هەر بۆیە هەندێکیان وتویانە: "ڕوناکی باوەڕ و ئینجیل کۆتاییان بە تاریکیەکان و نابینایی ڕەگەزی مرۆڤایەتیان هێنا".

ئێستا ئەم پرسیارە دەخەینەڕوو: چۆن ئەم چەمکە بەناوبانگە لە فەرهەنگی کۆنی ئاینیەوە بۆ فەرهەنگی فەلسەفی نوێ گوێزرایەوە؟

بە مانایەکی تر چۆن خرایە کایەی "عەلمانیەت" و "ئەقڵ"ەوەو بە دەستپێشخەریی کێیش؟

وا دەردەکەوێت کە "دیکارت *1596–1650*" یەکەمین کەسە چەمکی ڕۆشنگەریی یاخود ڕۆشنایی بە مانایەکی نوێی جیاواز لە مانای ئاینی "ئینجیلی" بەکارهێناوە. بۆ نمونە ئەو لە ڕۆشنایی سروشتی دواوە، کە مەبەستەکەی ئاوایە: "سەرجەمی ئەو ڕاستیانەن کە مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەقڵەوە پێیان دەگات".. بەڵام "دیکارت" ئەو چەمکە وەك چەکێکی دژ بە ئاین یاخود دژ بە کەسانی ئاینی بەکارناهێنێت، وەکو چۆن "ڤۆڵتێر" و "دیدرۆ" دواتر بەکاری دەهێنن، بەڵکو لە چوارچێوەی ڕێزگرتنێکی تەواوی ترادیسیۆنی ئاینیدا کاری پێدەکات. بۆ نمونە لە کتێبی "پرنسیپەکانی فەلسەفە"دا دەڵێت: "مەلەکەتی مەعریفی، کە خودا پێی بەخشیوین و بە ڕۆشنایی سروشتی ناوی دەبەین، هەرگیز سەرنجی هیچ شتێك نادات، ئەگەر ئەو شتە ڕاست نەبێت".



لایبنتز

دوای ئەو "لایبنتز *1646–1716*" هات تا هەمان بیرۆکە دووبارە بکاتەوە، ئەوەتا دەڵێت: "ئەقڵ ڕاستییەکە بە هۆی ڕوناکی سروشتیەوە، کە خودا پێی بەخشیوین، دەیناسین".. بەڵام لەناو هەموو قوتابیەکانی "دیکارت"دا سەرنج دەدەین، کە "مالبرانش *1638–1715*" ئەو چەمکەی بەکارهێناوە و تا ڕادەی سەرسامی خۆشیویستوە، بە شێوەیەکی یەکجار زۆر لەلای دوبارە دەبوەوە، کە بەربەرەکانی چەمکی ئەقڵ و سروشتی دەکرد.

لێرەدا سەرنجی ئەوە دەدەین، کە

ئەو زاراوەیە لەلای پیاوێکی ئاینی گەورەی وەکو "مالبرانش"دا بەسەر زاراوەی "داد" و "تاوان"یش دەکەوێت.

ئێستا با چەند نمونەیەك بهێنینەوە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو چەمکە لەلای نوسەری کتێبی "گەڕان بە دوای ڕاستیدا". "پێویستە مرۆڤ بەپێی ڕۆشنایی دەرونی حوکم لەسەر هەموو شتێ بدات، بەبێ ئەوەی گوێ لە شایەتییەکی هەڵە بگرێت، کە ئاوێتەی هەست و خەیاڵەکانیەتی". هەروەها دەڵێت: "ئێمە بە ئەقڵ بانگەوازی ڕۆح دەکەین، کاتێ بەکاری دەهێنین، بە مانایەکی دیکە کاتێ خودا بەکاری دەهێنێت، لە ڕێگەی ڕوناکیەوە دەیدرەوشێنێتەوە".. دواتر لە بارەی خوداوە دەڵێت: "ڕۆشنایی ئەو بە هەمان ئەو ئەندازەیەی گەش و ڕەونەقدارە، پاك و بێگەردیشە، بەڵام ئارەزوەکانمان هەمیشە لە ئاستیدا کوێرمان دەکەن و دەمانخەنە تاریکیەوە، ڕێگاشمان لێدەگرن، بە ڕۆشناییەکانی بدرەوشێینەوە". نمونە زۆرن، بەڵام لێرەدا سەرنج دەدەین ڕۆشنایی سروشتی ئەقڵی مرۆڤ پشبەستە بە ڕوناکی خودایی. یاخود بە شێوەیەك پێوەی بەندە، کە لێی جیانابێتەوە. هۆیەکەشی دیارە. "مالبرانش" ئەقڵیەتێکی دیکارتی پتەو و باوەڕێکی ئاینی جێگیر لە خۆیدا ئاوێتە دەکات. بێگومان لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت، کە ئەو لە نرخی پێشبینی و خەیاڵ و سۆزەکان دادەشکێنێت، بۆ ئەوەی تەنها بایەخی ئەقڵ بخاتە بەرچاو. هەر بۆیە عەقڵیانەتی ئەو بە وشکەڕۆیی ناودەبرێت، لەگەڵ ئەو گرنگیەی ئەم و دیکارتیەکانیش لە مێژووی هزردا هەیانە.

دوای ئەوەی بیرەوەرانی پرۆتستانتی "پێرل بایل *1647-1706*" دێت هەتا بۆ یەکەمین جار لە مێژووی هزردا ڕۆشنایی سروشتی لەسەر ڕۆشنایی بان سروشتی زاڵ بکات، بەبێ ئەوەی دوەمیشیان فەرامۆش بکات. ئەو کارە بە هەنگاوێکی نوێ دادەنرێت بە ئاراستەی ڕزگارکردنی لە لاهوتی ئاینی و دواتر گەیشتن بە عەقڵانیکردنێکی تەواو. پوختەی وتەکانی "بایل" ئاوایە: ئێمە ناتوانین بگەین بە تێگەیشتن لە خودی "خودا" و باوەڕپێهێنانی، ئەگەر پێشووتر ڕوناکی سروشتی ئەقڵمان نەبووبێت. کەواتە ئەقڵ بنەمایە، بەڵام "بایل" نەیوێرا لەمە دوورتر بڕوات بۆ ئەوەی بە تەواوی ڕوناکی بەرزایی "واتە ڕوناکی ئاسمان-وەرگێڕ" لە ڕوناکی ئەقڵ جیابکاتەوە، چونکە لەو سەردەمەی ئەودا مەحاڵ بوو، بیر لەمە بکرێتەوە. بەڵام لە سەردەمی "ڤۆڵتێر" و "دیدرۆ"دا، واتە سەدەیەك دوای ئەوە، ڕێی تێدەچوو بیری لێبکرێتەوە. بەم شێوەیە دەبینین هۆشمەندی لەسەرخۆ هەنگاو دەنێ، بەڵام پێشیش دەکەوێ. ئەقڵی مرۆڤ بە یەکجار لە لاهوتی ئاینی مەسیحی ڕزگاری نابێت، بەڵکو چەند جارێکی گەرەکە، ئەمەش بە شێوەیەکی ڕۆشن دیارە. ئەزمونی بیری ئەوروپی، کە لێرەدا نیشانی دەدەین.. لە ڕاستیدا وشەی کۆی "ڕوناکیەکان" بەربەرەکانی وشەی تاکی "ڕوناکی" دەکرد، بەڵکو زۆرجار جێگای ئەوی دەگرتەوە. بەم شێوەیە وای لێهات لە سەردەمی ڕۆشنگەری، یان

فەلسەفەی ڕوناکی، یاخود ڕوناکی سروشتی ئەقڵ و.. هتد دەدوان.

هەرچۆنێك بێت چەمکی ڕۆشنگەری قۆناغ بە قۆناغ لە خەرمانەی ئاینی مەسیحی ڕزگاری دەبوو، تا تەعبیر لە تەواوی سەردەمەکە بکات: ئەو سەردەمەش ڕزگاربوونی ئەقڵ و بیر بوو لە سەدەی هەژدەهەم. ئەو کات شێوەی پرۆژەی هزر و تێکۆشانێك بە خۆیەوە بگرێت، کە بیەوێت مرۆڤی ئەوروپی و هی دەرەوەی ئەویش لە تاریکایی سەدەکانی ناوەڕاست و دەستەڵاتی پیاوانی کەنیسە ڕزگار بکات. بێگومان ئەو پرۆژەیە شاراوە بوو نەوەك ئاشکرا، بە هۆی بوونی ترسی فەیلەسوفەکان لە دەسەلات و لە کەنیسە، کە بە شێوەیەکی ئۆرگانی پێیەوە بەند بوو. ئەو پرۆژەیە بە نهێنی مایەوەو دواتر لەسەر دەستی "کوندورسیە" ئاشکرا کرا، ئەمەش لە کتێبە بەناوبانگەکەی "مانیفێستی مێژوویی بۆ پێشکەشکردنی گیانی مرۆڤایەتی"، یاخود "بیری مرۆڤایەتی *1794*"دا دەردەکەوێت.

بۆ ئەوەی مەودای نێوان بیریارانی سەرەتای ڕۆشنگەری، ئەوانەی ڕێگایان بۆ ڕۆشنگەری خۆش کرد و بیریارانی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەری دەربخەین، ئەوەندە بەسەر بەراوردی نێوان "پێرل بایل" لە لایەك و "ڤۆلتێر" و "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ" لە لایەکی دیکەوە بکەین، کە دوای ئەو هاتن و درێژەیان بە کاری ئەو دا.

ڕاستە "بایل" لە فەرهەنگە مێژوویی و ڕەخنەییەکەیدا، وێناکردنی عەقلانیەتی ئاینی پەسەند کردو ڕەخنەی لە هەیبەتی پیاوانی کەنیسەو لەو دەستەڵاتەیان گرت، کە بەسەر عەقڵدا سەپاندبوویان. ڕاستیشە ئەو بانگەشەی پشکنینی سەربەستانەی کتێبە پیرۆزەکان و داوای ئازادیی بیروباوەڕی کرد، لە کاتێکدا فەرەنسا لەوپەڕی دەمارگیریەتی ئاینیدا دەژیاو چەوسانەوەی ڕۆشنبیران بە شێوەی دڕندانە بەرێوە دەچوو، کە "بایل" خۆی یەکێك بوو لەوان.. بەڵام جورئەتی نەکرد ئەو قەڵەمبازە بدات، ئەو قەڵەمبازەی سەرجەمی ئەقڵی لەژێر دەستەڵاتی لاهوتی کەنیسەدا ڕزگار دەکرد. ئەو دیلی تێڕوانینی ڕەشبینانەو مەسیحیانەی مێژوو و مرۆڤ بوو. ئەو گومانی لە ئەقڵی مرۆڤایەتی دەکرد و لەوە دەترسا ئەو سنورە ببەزێنێت، کە خودا بۆی داناوە. ئەقڵی مرۆڤایەتی بەبێ پشتگیری ئەقڵی خواوەندی بە لاڕێدا دەچێت و لە ڕێگومکە "متاهە" بێکۆتاییەکاندا گوم دەبێت.

ئینجا پرسیارێك دێتە ئاراوە: ئایا ڕۆشنگەریی ئەوروپی زیادەڕۆیی نەکردوە و بە ئاڕاستەی پێچەوانەدا نەڕۆیشتوە، وەکو کاردانەوەیەك لەسەر ئەقڵیەتیی تاریکی و دادگاکانی پشکنیندا..؟ ئایا نابێت ئێمە بۆ ڕۆشنگەرییەکی هاوسەنگ بگەڕێینەوە: مەبەستم ڕۆشنگەرییەکە، کە ڕوناکیی ئەقڵ و ڕوناکی باوەڕی لە یەکەیەکدا کۆکردبێتەوە.

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط، عدد *8585*،

*2002/5/31*

# "ڕیمۆن ئارۆن" و پرسی دیموکراسی

• جۆرج تەرابیشی

▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

زۆرجار بڵاوکردنەوەی بەرهەمی نوسەرێك لە پاش مردنی، دەبێتە دەرفەتێك بۆ ئەوەی ئەو نوسەرە سەرلەنوێ بێتەوە ئاراو ناوی بکەوێتە ناو ناوان، بە تایبەت ئەگەر هاتوو لە ماوەی ژیانیدا تەریك کرابێت.. "ڕیمۆن ئارۆن" یەکێکە لەوانەی نەوەی ئێمە پەیوەندی لەگەڵ دابڕی بوو، چونکە ئێمە پێمان وابوو ئەو نوێنەری فیکری (ڕاستڕەوەکان)ەو بەم پێیەش هەموو ڕاستگۆییەکی زانستی و فەلسەفیمان لەبەر داماڵیبوو، لە بەرامبەر ئەمەدا هەموو دەنگی خۆمان دابوە پاڵ "ژان پۆڵ سارتەر" کە گەورەترین ڕکابەری "ئارۆن" و نوێنەری



ڕیمۆن ئارۆن

نمونەیی فیکری (چەپ) بوو لەو کاتەدا.

بەڵام ئەمڕۆکە دوای ئەوەی هەردوو وتەزای (چەپ) و (ڕاست) بڕێکی زۆری باقوبریقی خۆیان لەدەستدا، "ڕیمۆن ئارۆن" بەوپێیەی یەکێکە لە نوێنەرە مەزنەکانی ئەنتلجنسیای فەرەنسی لە ماوەی پاش جەنگی دووەمی جیهانیدا، سەرلەنوێ دێتەوە ناوناوان و باسی لێدەکرێت.

ئەگەرچی یەکەمین کتێبی "ئارۆن" کە لە ساڵی *1938*دا بڵاویکردۆتەوە بە ناوی (سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی مێژوو)ەوەیە، ئەوا ئەم کتێبەی تری کە پاش چواردە ساڵ لە مردنی خۆی بڵاودەکرێتەوە، دەیەوێت ناونیشانەکەی (سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی سیاسی) بێت و تاکە بابەتی سەرەکیشی بریتی بێت لە (دیموکراسی): دیموکراسی بە

گێڕانەوەی بۆ لای خۆی لە لایەك و بە پەیوەندیشی بە شۆڕشەوە لە لایەکی ترەوە.

هۆکاری سەرەکی سەرکەوتویی "ڕیمۆن ئارۆن"یش ئا لێرەدایە: ئەو تا لە ژیاندا مابوو، ئایدیای (شۆڕش) بە ماوەیەکی زۆر لە پێش ئایدیای (دیموکراسی)یەوە بوو، بەڵام ساڵی *1983* و لەگەڵ مردنیدا پێودانگەکان سەرلەبەر گۆڕان.

لە کاتێکدا (شۆڕش) بوو بە هاوتای نشوستی و نائومێدی، (دیموکراسی) وەکی بوکێك بە هەموو فەزیلەتەکانی سیاسەت خۆی ڕازاندەوە. بابەتی ئەم کتێبە چەند لێکچەرێکە کە "ئارۆن" ساڵی *1954* لە (قوتابخانەی نەتەوەیی بۆ بەڕێوەبردن) پێشکەشی کردوە، ئەم مەڵبەندە بەرزترین پەیمانگایەکە لە فەرەنسادا بۆ پێگەیاندنی سیاسەتمەداران لەو وڵاتەدا.

لەم لێکچەرانەیدا "ئارۆن" لە موفارەقەیەکەوە دەست پێدەکات کە ئاراستەی تەواوی هەڵوێستی ئەو دیاریدەکات. ئەو مەسەلەیەی ئەو داکۆکی لێدەکرد (واتە مەسەلەی دیموکراسی)، ئەوکات لەوپەڕی لاوازی و لەرزۆکیدا بوو. هەربۆیە دەیویست داکۆکی کردنەکەی لە ڕوی زانستی و ئەبستمۆلۆژیەوە زۆر تۆکمەو پتەو بێت، ئەمەش لەبەرئەوەی "ئارۆن" ڕقی لە ئایدیۆلۆژیا دەبوەوەو پێی وابوو (ئەفیونی ڕۆشنبیران)ە.

لێرەوە "ئارۆن" لە تەواوی ئەو سیانزە لێکچەرەیدا سوور بوو لەسەر ئەوەی پێناسەیەکی ئیجرائی پەتی دیموکراسی بکات و خۆی لەوە لابدات هیچ جۆرە هەرایەکی ئایدیۆلۆژی بنێتەوە، بە تایبەتی کە لەسەرەتای پەنجاکاندا و لە ناوەندی ڕۆشنبیری فەرەنسیدا شەڕێکی گەورە لەسەر ئەم چەمکە دروست ببووبوو.

"ئارۆن" پێی وایە هەر پێناسەکردنێکی ئایدیۆلۆژی (دیموکراسی)، لەباریدایە هەرایەك بنێتەوە و دووبەرەکی بخاتەوە. بۆ نمونە پێناسەکردنی (دیموکراسی) بەوەی بریتیە لە (سەروەری گەل) دەچێتە چوارچێوەی پێناسەکردنی دوو چەمکی ئاڵۆز کە هەریەکەیان پێویستی بە پێناسەکردن هەیە، ئەو دوو چەمکەش بریتین لە: (گەل) و (سەروەری).

بۆیە لە ڕووی زانستی و لۆژیکیەوە چاکتر وایە (دیموکراسی) بە دامودەزگا نەك بە بیروبۆچوون پێناسەبکەین. بە کورتیەکەی دیموکراسی (سۆسیۆلۆژیانە نەوەك ئایدیۆلۆژیانە) بریتیە لە ململانێیەکی هێمن و شێلگیرانە لەسەر دەسەڵات. لە هەموو کۆمەڵگەیەکداو لەوکاتەوەی کۆمەڵگەو دەسەڵات هاتۆتە ئاراوە، کەسانێك هەن مومارەسەی دەسەڵات دەکەن. ئەو مۆرکە تایبەتیەشی دامودەزگای (دیموکراسی) پێدەناسرێتەوە، ئەوەیە کە مومارەسەکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای ململانێ و کێبڕکێی مەدەنیانە ڕێکدەخات، بێ ئەوەی لەم پرۆسەیەدا بگەڕێتەوە سەر ڕەگەز و ڕەچەڵەك (وەکو لە کۆمەڵگە ئۆرستۆکراتیەکاندا هەیە)، یاخود پشت بە زەبر و هێز ببەستێت (وەك لە کۆمەڵگە میلیتاری و ئەو کۆمەڵگەیانەدا لە ئارەدایە کە لەسەر شەڕو پەلاماردان دروست

بوون)، نە دەشگەڕێتەوە سەر باوەڕو عەقیدە (وەکی ئەوەی لە کۆمەڵگە ئاینیە کۆنەکان و کۆمەڵگە ئایدیۆلۆژیە تازەکاندا لە ئارەدایە).

جگە لەو تیروپشکەی لە دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆی ئەسینادا پەیڕەو دەکراو ڕەنگە لە کاتی پەیڕەوکردنیدا سەرلەبەر ڕۆڵی کەسایەتی و بەهرەو لێوەشاوەیی وەلاوە نابێت، ئەوا لە دیموکراسیەتی ناڕاستەوخۆ (نوێنەرایەتیکردن)دا، هەڵبژاردن تاکە پرانسیپێکی ئەو گەمە مەدەنیەیە. بۆ ئەوەی کێبڕکێکە بەردەوام بێت و گەمەکە بە کراوەیی بمێنێتەوە، نابێت هیچ هەڵبژاردنێك بە دوا هەڵبژاردن بزانرێت. هەر گەمەیەکیش گەر ڕێزی یاساو ڕێساکانی نەگیرێت، لە یاری دەردەچێت و کۆتایی پێدێت. جا بۆئەوەی گەمەکە بەردەوام بێت و درێژەی هەبێت، پێویستە قەناعەتێکی وا لای دەستەو تاقمە سیاسیەکانی دەرەوەی دەسەڵات دروست بێت کە ئەوان هەموو هەلێکیان لەدەست نەداوە بۆئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەنە دەسەڵات.

تاکە ئەزمونێکی مێژوویی هەبێت کە تاقمێکی سیاسی دیاریکراو دوای سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردندا و دوای خۆیان ڕێگەیان لە هاتنە سەرکاری هێزێکی سیاسی دی گرتبێت، ئەزمونی نازییەکانی ئەڵەمانیایە. لەپای ئەم ئەزمونەشدا گەلی ئەڵەمانیاو تەواوی گەلانی دنیا باجێکی زۆرو زەوەندیان دا.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەمەش بەردەوام خاڵی لاوازی (دیموکراسی)یە، چونکە (دیموکراسی) ئەوکاتە دەتوانێت بەردەوام بێت کە هەموو لایەنەکان پێکەوە یاسای گەمەکەیان قبوڵ بێت. بەڵام دیموکراسی (لانی کەمی لە ڕوی تیۆریەوە) ناتوانێت ئەو حیزب و لایەنانە لە مافی هەڵبژاردن بێبەش بکات کە دەیانەوێت دەستورو ڕێسای گەمەکە بگۆڕن.

دیموکراسی خۆرئاوا لەگەڵ پارتە کۆمۆنستەکان و چەپە ڕادیکاڵەکاندا ڕوبەڕوی تەڵەزگەیەکی لەمجۆرە بوەوە، چونکە ئەوانە دەیانویست بە مەبەستی دەستکاریکردنی مەرجەکانی گەمەی دیموکراسی و تەنانەت سڕینەوەشی بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن بکەن. ئەمڕۆکەش لەگەڵ پارتە ڕاستڕەوە پەڕگیرەکانی خۆرئاوادا ڕوبەڕوی هەمان کێشە بۆتەوە. ئەو پارتانە دەیانەوێت ئەزمونی فاشیزم لە ئەوروپادا دوبارە بکەنەوە و مافی هەڵبژاردن قۆرغکەن بۆ کەمایەتیەکی دیاریکراوی وەك سپی پێستەکان لەو کۆمەڵگایانەدا کە زۆرینەیان ڕەش پێستن، یاخود ئەو مافە بە هەندێك کەمایەتی وەکی کەمایەتی پەنابەرانی ئەوروپا ڕەوا نەبینن.

هەنوکە ئەم پەتایە جیهانی سێهەم و بەتایبەتیش وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیشی گرتۆتەوە. لە چەندین وڵاتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا زۆرێك لە بزاوتە فێندەمێنتالیستەکان بە ئاشکرا باس لەوە دەکەن کە ئەوان بەشێکی گەمەی دیموکراسیان پێ قبوڵە، تەنانەت نوێنەری هەندێ لەو بزاوتانەش کۆ لەوە ناکەنەوە بڵێن: (هەنگاوی یەکەممان دوای بردنەوەی

هەڵبژاردن، ناشتنی دیموکراسی و کۆتایی پێهێنانیەتی). ئەوەی ئەم قەیرانەش لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا قوڵتر دەکاتەوە (دوژمنانی دیموکراسی) کە حوکمرانی ئەو وڵاتانە دەکەن، ئەم هەڵویستەی فێندەمێنتالیستەکان وەك هەلێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی تا ئەبەد پرۆسەی دیموکراسی لە وڵاتەکانیاندا بە هەڵپەسێردراوی بهێڵنەوە.

لێرەوە "ئارۆن" هەستا بە گۆڕینی پێناسەکردنی خۆی بۆ (دیموکراسی) و پێی وابوو کە (دیموکراسی) بە تەنها بریتی نیە لە رێکخستنی کێبڕکێیەکی مەدەنیانەو دوور لە توندوتیژی لەسەر دەسەڵات، بەڵکو هاوکات و لە بنەڕەتدا بریتیە لە قبوڵکردنی پرانسیپەکانی ئەو کێبڕکێیەش. (دیموکراسی) بۆ خۆی بریتیە لە سستمی چارەسەری مامناوەندی و هەموو جۆرە پەرگیری و توندڕەوییەکیش رەت دەکاتەوە.

دیموکراسی لە بەریتانیادا دوای ئەوە هاتە ئارا کە دەسەڵاتی رەهای فەرمانڕەوا سنوردار کراو بەرەبەرە دەسەڵات کەوتە دەست پەرلەمان، پەرلەمانیش بۆ خۆی ئەو جێگایەیە کە توێژ و چینە ناکۆکەکانی تێدا کۆدەبنەوە و لەناو خۆیاندا لەسەر چارەسەرکردنی مەسەلەکان رێکدەکەون. گەر ئەمەش نەکرێت ئەوا حوکمرانی کردن و دەوڵەتداری کارێکی ئەستەم دەبێت.

چارەسەرکردنی ئەم کێشانە لەناو پەرلەماندا، لە قۆناغی یەکەمیدا بواری پەیوەندیەکانی نێوان فەرمانڕەواو چینی ئۆرستۆکراتەکانی گرتەوە، لە دوەم قۆناغدا گەیشتە کایەی پەیوەندییەکانی نێوان چینی ئۆرستۆکراتی کۆن و چینی بۆرژوازی نوێ. لە قۆناغی سێهەمیشدا پەیوەندی نێوان نوێنەری هەردوو چینی ئۆرستۆکراتی و بۆرژوازی لەگەڵ نوێنەرانی چینی کرێکاراندا گرتەوە. گەر هەر چینێك لەو چینانە بیویستایە پەرلەمان بۆ خۆی پاوان بکات، ئەوا چارەسەرکردنی کێشەکان بە توندوتیژی دەشکایەوەو (دیموکراسی)یش بونی نەدەما، یاخود گەر هەر دەستەو تاقمێك بیویستایە لە رێی توندوتیژیەوە بگاتە دەسەڵات و لە رێی توندوتیژیەوە گۆڕانکاری بکات، ئەوا ئەمە بە دەرچون و لادان لە دیموکراسی حیساب دەکراو سەرەتایەك دەبوو بۆ چونە ناو جەنگێکی ئەهلی یان بەرپابونی شۆڕش. بەمجۆرە کەواتە پرانسیپی دیموکراسی فەزیلەت نیە، بەڵکو ڕوحیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانە بە شێوەیەکی ئاشتیانەو دوور لە توندوتیژی. فەزیلەتی سەرەکی دیموکراسیش لەمەدایەو مەبەست لێی رێزگرتنی رێسای گەمەکەیە. کەواتە مەبەست لە فەزیلەت مانای ئەخلاقی وشەکە نیەو (دیموکراسی) خۆی لە بەکارهێنانی زمانی فەزیلەو ئاکار بەدوور دەگرێت.

هەرچەندە ململانێی شێلگیر و مەدەنیانە جەوهەری (دیموکراسی) پێکدێنێت، بەڵام ئەم کێبڕکێیە بونی خواست و ئارەزووی تایبەتی لای لایەنە ناکۆکەکان ناسڕێتەوەو بگرە بونیشی بە شتێکی پێویست دەزانێت، چونکە گەر خواست و ئارەزوی گرتنە دەستی دەسەڵات

لای ئینسانەکان نەبێت، ئەوا بیرۆکەی ململانێ و کێبڕکێش نەدەبوو.

کەواتە فەلسەفەی مۆراڵی دیموکراسی فەلسەفەیەکی واقیعیە، فەلسەفەیەکە وەك بوارێك بۆ نیشاندانی چاکەو جێگەیەك بۆ یۆتۆبیا سەیری سیاسەت ناکات، ئەمە بەبێ ئەوەی پشت لە بەها بەرزو باڵاکان بکات.

بەڵام خواستی سەرەکی ئەو ڕێگرتنە لە کەرت کەرت بوون و دابەشبونی دەسەڵات و سنوردارکردنی دەسەڵاتە، لەبەرئەوەی سروشتی هەموو دەسەڵاتێك وایە کە داوای دەسەڵاتی زیاترو زۆرتر دەکات. کەواتە دیموکراسی سستمێکی بێ خەوش نیەو وەکی هەموو سستمێکی تر کەموکوڕی خۆی هەیە، بەڵام کەموکوڕی لە هەموو سستمە سیاسیەکانی تر کەمترە.

واقعیەتی (دیموکراسی)ش لەوەدایە کە خۆی لە لیستی سستمە سیاسیە خراپەکاندا پۆلێن دەکات، بەڵام ئەوەی بۆ ئەم بەدەسکەوتێك دەنوسرێت لەوەدایە دەتوانرێت بە چاکترین سستمی خراپ ناوببرێت.

ڕەنگە بوترێت ئەوە سەیرکردنێکی ڕەشبینانەیە بۆ مرۆڤ و بۆ مێژووش، "ئارۆن"یش نکوڵی لەوە ناکات کە کەسێکی ڕەشبینە، بەڵام تێبینی ئەوەشی کردوە کە گەورەترین گەشبین لە بواری فەلسەفەی مێژوودا "کارل مارکس" بوە. "مارکس" وەکی چارەنوسی مرۆڤ سەیری سیاسەتی کردوەو ویستویەتی سیاسەت ببێتە مەلەکوتی خێری ڕەها. هەرچۆنێك بێت "ئارۆن" بۆ خۆی سروشتی وەها بوو کە ڕقی لە هەموو ئاینە سیاسیەکان دەبووەوە، چونکە تەنها کاری ئاینی سیاسی ئەوەیە بەڵێنی دروستکردنی بەهەشت لەسەر زەوی بدات، بەڵام زۆرجار بەڵێندان بەم بەهەشتە دنیاییە بە دۆزەخ کۆتایی دێت و جەهەنەمێك دەخوڵقێنێت.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (*12795*).

# کۆمەڵکوژیی فەرەنسیەکان لە جەزائیر

• حەسونە میسباحی
▪ لە عەرەبیەوە: سامان عەلی

**لە ڕۆمانێکی فەرەنسیدامۆسیقاژەنی ئەڵمانی نیکۆلاوس هارنۆنکۆرت لە مەترسیی لەناوچوونی مۆسیقای کلاسیکی وریامان دەکاتەوە.**

لە ساڵی *1860*دا نوسەری فەرەنسی ئەلکسەندەر دۆما (*1804–1870*)ی خاوەنی ڕۆمانی بەناوبانگی (سێ سوارەکە- الفرسان الثلاثة) گەیشتە شاری ناپۆلی ئیتاڵیا. لە بالکۆنی کۆشکی (شیاتمۆنت)ەوە کە نیشتەجێی بوو بەمجۆرە باسی ئەو شارە دەکات: "لەوێ بووم لە ناوجەرگەی کەنداوی ناپۆلی، لە نێو درەختی هەنارو پرتەقاڵ و گوڵی ژاڵەو لەبەردەم هەردوو دەرگای بانێکدا کە لەوێوە چاوەکانم دەتوانن هەموو ئەو کەنداوە دڵڕفێنە لە ملەی "میزینی"ەوە بۆ ملەی "کاجمینیلا" ببینن. چونکە لە ناوجەرگەی ئاوێنەی ناوەڕاستی شیندا دورگەی "کابری"م لەبەردەمدا بوو کە هەر دەڵێی پەڵەیەکی ڕەشە، لە لوتکەکەیدا بەشەو پێم وابێ تارمایی "تیێر" دەبینم کە سەری خۆی هەڵدەگرێت. لەلای چەپیشمەوە چیای "فیزۆف"ی بورکان دەبینم کە بە درێژایی کات دوکەڵ و، هەندێك جاریش ئاگری لێ بەرزدەبێتەوە. لەلای ڕاستیشمەوە "مارجیلینا" و "باوسیلیبا".

ئەلکسەندەر دۆما لە ساڵی *1853*دا سەردانی ناپۆلی کردبوو، هەر بۆیە زۆر چاك شارەزای بوو، هەروەها شارەزای مێژوو شتە شاراوەو نهێنیەکانیشی بوو. لە سەردانی دوەمیدا لەسەر داخوازی سەرکردە گاریباڵدی یەکخەری ئیتاڵیا چوە ئەوێ و هەر لەگەڵ گەیشتنیدا یەکڕاست گاریباڵدی کردیە بەڕێوەبەری مۆزەخانەو هەڵکۆڵراوە جێماوەکان. بەڵام تەنها بەم پۆستە بەرزەی بەسی نەکرد، بەڵکو ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەشی دامەزراند و ناوی لێنا "سەربەخۆ". گاریباڵدی لەوبارەیەوە دەڵێ: "ئەو ڕۆژنامەیەی کە دۆمای هاوڕێم دایمەزراند، دروست شایانی ئەو

ناوەیە کە لێی ناوە، زیاتریشی شایانە چونکە من یەکەمین کەس دەبم کە تیری ڕەخنەم ئاراستە دەکرێت ئەگەر وەك ڕۆڵەیەکی ئەم میللەتەو وەك سەربازێکی مرۆڤایەتی لە ئەرکەکانی خۆم لابدەم". لە ساڵی *1863*دا ئەلکسەندەر دۆما تەمەنی بوە شەست و یەك ساڵ و، داخڵ بەو شتە بوو کە بە "هەرزەکاریی پیرێتی" ناوزەدی کرد. لە کۆشکی پادشایەتیدا کە بە بڕیاری گاریباڵدی هاوڕێی تیایدا نیشتەجێ بوو لە ئارامی و هێمنی و لە ژیانێکی خۆشگوزەراندا ژیا. لەوێندەر دەست دەکاتە نووسینی ڕۆمانێکی دیکە کە ئەویش ڕۆمانی "سان فیلیس"ە بە وتەی خۆی بۆ ستایشی هەستی نیشتمانی لەلای خەڵکی ناپۆلی و بەدناوکردنی زوڵم و ستەمی بۆربۆنیەکان. بە هۆی ئەو خێروبێرە زۆرەشەوە کە بەسەریدا دادەباری، کەسانی چاوچنۆك و ئیرەکەری زۆربوون کە نازناوی "پادشای ناپۆلی"یان لێنابوو، لەلای گاریباڵدی چاڵیان بۆ هەڵدەکەند و بە تۆمەتی جۆراوجۆر تاوانباریان دەکرد.

بەڵام ئەو هیچ گوێی پێیان نەئەداو تا ڕادەیەکی زۆر هەر خەریکی کاروبارەکانی خۆی بوو. جاربەجاریش بە دزیەوە دەچوە لای یارە زۆرەکانی. ئەلکسەندەر دۆما لە ڕاڤەی ئەو ئامانجانەدا کە ڕۆژنامەی "سەربەخۆ"ی لە پێناودا دامەزراند دەڵێ: "ئامانجم هاوکاری کردنە لە جوانکردن و فراوانکردنی شارەکەو پارێزگاریکردن لە ڕەونەق و پاکوخاوێنیەکەی و پەرەپێدانی خوێندن و هونەر و خزمەتگوزاریە گشتیەکان. ئێمە دەست نادەینە بەرهەڵستکاریەکی ڕەهاو بە پشت بەستن بە کۆمەڵێك بەڵگەی بنەبڕ نەبێ هیچ کەس تاوانبار ناکەین". ڕۆژنامەی "سەربەخۆ" کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەسەر ڕۆژنامەگەریی ئیتاڵیا. ڕەخنەگر و بیرمەندی گەورەی ئیتاڵیا بەندیتۆ کرۆچە لە ستایشی ئەو ڕۆژنامەیەدا دەڵێ: "ئەم ڕۆژنامەیە بە شێوازێکی درەوشاوانە باسی هەموو ئەو مەسەلانە دەکات کە وابەستەن بە ئیتاڵیاوە"، هەروەها هەمیشە بەو جۆرە ستایشی ئەلکسەندەر دۆمای دەکرد و دەیوت:

"لە گاریباڵدی گاریباڵدیترە".

## جەزائیر ڕۆمانە

شەڕوشۆڕ و ئەو کارەساتانەی کە بە دوایدا دێت توخمێکی سەرەکیە لە هەموو ڕۆمانەکانی نوسەری فەرەنسی ڕینێ نیکۆلا ئایهنیدا. لە ڕۆمانە تازەکەیشیدا کە ناونیشانی "جەزائیر ڕۆمانە"ی هەڵگرتوە، دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی ئازادیخوازی جەزائیری کە لە تەمەنی بیست و دوو ساڵدا وەك سەربازێك بەشداری تیادا کردوە. لە ڕۆمانەکەیدا وەسفی پرۆسە سامناکەکانی ئەشکەنجەدان دەکات کە لە لایەن ئەفسەرە فەرەنسیەکانەوەو بە بەرچاوی ئەو سەربازە کەم تەمەنانەوە کە تازە پەیوەندیان بە ڕیزەکانی سوپای فەرەنسیەوە کردوە بەرامبەر بە نیشتمانپەروەرە جەزائیریەکان پیادە دەکرێت. ڕۆژنامەی "لۆمۆند"ی فەرەنسی لە بارەی ئەم ڕۆمانەوە نوسیویەو دەڵێ: "ئایهنی وەسفی واقیعێکی بەستەڵەك ئامێز دەکات. ئەو ناونیشانەیش کە بۆ ڕۆمانە تازەکەی هەڵبژاردوە ئێجگار

پڕمانایە. چونکە ئەو بۆ خۆی سەربازێك بوو هەرچییەکی ببینیایەو ببیستایە وەك بە پیرەوەچوونێکی ویژدانی ئەو نوسەرەی کە لە ئایندەدا دەبێ، تۆماری دەکرد. بەڵام لە پشت ڕاهێنانی زەین خاوێنیەوە، هەموو قەوارەی خۆی لە سەدایەکی لیریکیدا لەگەڵ مێژووی پیاواندا بەشدار پێدەکات. شەڕە کۆلۆنیالیستیەکان و، یادەوەری داپڵۆسینی سەر ئەو قەرەجانەی کە خۆی بە بنەچە دەچێتەوە سەریان. لە ڕۆمانەکەیشیدا هەموو شتێك ئاوێتە دەکات، منداڵێتی خۆی و، گێروگرفتە سێکسیەکانی و، مێژووی خێزانەکەی و ئارەزوی هەمیشەی بۆ یاخیبوون بەسەر قەدەغەکراو و بێدەنگی لێکراو لەو چواردەورەدا کە تیایدا ژیاوە".

## هارنۆنکۆرت و فەرامۆشکردنی هونەر

گەورە مۆسیقاژەنی ئەڵمانی نیکۆلاوس هارنۆنکۆرت کە لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانی سەدەی پێشوەوە بەشداری کرد لە نوێکردنەوەی مۆسیقای کلاسیکیداو ئەمساڵیش لە شاری میونیخ خەڵاتی پێشکەوتوی *SieMens*ی وەرگرت، هێرشێکی توندی کردە سەر کۆمەڵگا ئەوروپاییەکان کە خەریکە هێدی هێدی واز لە بایەخدان بە هونەر دەهێنن. هارنۆنکۆرت لەو بارەیەوە دەڵێ: "پێم وابێ هەستکردن بە هونەر، نەك هەر بە تەنها مۆسیقا بەڵکو هونەر بە شێوەیەکی گشتی، کە لە کۆندا بەشێکی گرنگی پەروەردەی مرۆڤ بوو لەوەتی لەدایکبوونیەوە، لەبەردەم شتی سودمەنددا لە کەمبوونەوەدایە. پاش ئەوەی بۆ چەند سەدەیەك هەمان ئەو بایەخەی شتی سودمەندی هەبوو ئێستا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هونەر کاریگەریی خۆی لەدەست دەدات چونکە چیدی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی باوەڕیان وایە کە هونەر بێ کەڵکە (..). من دەترسێم بە هۆی ئەمەوە مرۆڤ ڕەهەندە ترانسندنتاڵیەکەی خۆی لەدەست بدات و ببێت بە ئاژەڵ[٧]".

ئایا ئەمە مانای وایە کە خۆری مۆسیقای کلاسیکی خەریکە ئاوا دەبێ؟ نیکۆلاس هارنۆنکۆرت لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: "هەموو شتێك لە دەوروپشتماندا جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە مۆسیقای کلاسیکی لە دژوارترین قۆناغ و خراپترین قەیرانەکانیدا دەژی، من لەگەڵ ئۆزواڵد شپنجلەردا کۆك و هاوبۆچونم کە لە کتێبە بەناوبانگەکەی "داڕووخانی شارستانێتی خۆرئاوا"دا نوسیویەو دەڵێ: (مەترسی پەرەسەندن لەوەدایە کە بەرەو فەنابوون دەچێت. لە کۆندا مۆسیقاژەنەکان پێویستیان بە ماوەیەکی کەم و ژمارەیەك ئامێری دیاریکراو هەبوو بۆئەوەی شاکارگەلێکی مەزن دابنێن، بەڵام ئەمڕۆکە مۆسیقاژەنەکان مانگان و ساڵان خەریك دەبن بێئەوەی کارێکی مامناوەند دابهێنن. پاشانیش شتەکان ئاڵۆز دەکەن و واز لە سادەیی و ڕۆشنی دەهێنن کە ئەوسا دوو سیفەتی دێرینەکان بوو. هەمان شت لە نیگارکێشان و لە بوارە

هونەریەکانی دیکەشدا دەگوزەرێ).

هارنۆنکۆرت ئامۆژگاری دایکان و باوکان دەکات کە رۆڵەکانیان هان بدەن تاوەکو فێری مۆسیقای کلاسیکی بن. لەو بارەیەشەوە دەڵێ: (دەزانم کە ئەوە کارێکی سەخت و ئێجگار دژوارە. دەشزانم کە نەوە تازەکان نایانەوێت کەڵك و سود لە رابوردوو لە ئەزمونی گەورە مامۆستایان لە بواری مۆسیقاو هونەردا بە شێوەیەکی گشتی وەربگرن، وا دەزانن کە هەر خۆیان بە تاقی تەنها دەتوانن سەیرو سەمەر دابهێنن. ئێمە نابێ ئەو چراوگە بکوژێنینەوە کە هێشتا دەدرەوشێتەوە.. دەنا بەو کارەمان پاڵ بە جیهانەوە دەنێین بەرەو هەژاریی رۆحی و هونەری و مرۆیی زیاتر".

## ئەرجەنتینی بۆگەن کردوو:

نوسەر و رۆژنامەنوسی ئەرجەنتینی تۆماس ئالۆی مارتینیز کە تەمەنی *63* ساڵە لە هەموو رۆمانەکانیدا وەسفی ئەو قەیرانە ئابوری و کۆمەڵایەتی و، بە تایبەت سیاسیانە دەکات کە وڵاتەکەی بە درێژایی ئەو پەنجا ساڵەی رابوردوو تیایدا نغرۆ بوە، واتە لە سەردەمی خوان پیرۆنەوە تاوەکو ئەمرۆ. وەکی گابرێل گارسیا مارکیزیش سود لە ئەزمون و کارامەیی بەرزی رۆژنامەنوسی وەردەگرێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی زیندومان دەربارەی واقیع و خەڵکی پێشکەش بکات. لە رۆمانە تازەکەشیدا کە ناوی "دزیی شاژن- سرقة الملكة"ە لەگەڵ خۆیدا دەمانباتە قولایی هەڵدێرەکانی ئەرجەنتینی نغرۆی نێو قەیرانە سیاسی و ئابوریەکان و، هەروەها گەندەڵی و خراپەکاریەوە. پاڵەوانی رۆمانەکە کە ناوی کارماگۆیە لە شەست ساڵی تەمەنیدایەو حەزی لە کیژۆڵەکانە، بەڵام دوودڵی نانوێنێ لە فرۆشتنی ویژدانی خۆی لە بەرامبەر دەستخستنی پۆستێکی نوێ، یاخود برێك دۆلار. لەبەرئەوەی کە کچە رۆژنامەنوسی گەنج و شۆخ و شەنگ راینا ریمیس رەتی داخوازییە بە پەلەو پەرۆشەکانی کارماگۆ دەکاتەوەو قایل نابێت کە ببێتە یاری، هەر بۆیە ئەویش لە کاتی تورەبوونەکانیدا کە زادەی رژدیی (غیرە)ن، لە رۆژێکی گەرمدا بە وێنەی رەفتاری مارسۆ لەگەڵ عەرەبەکەدا لە شاکارە جوانەکەی نامۆی ئەلبێر کامۆدا، تەقە لە راینا ریمیس دەکات. رەخنەگرێك لەبارەی ئەم رۆمانەوە نوسیویەو دەڵێ: "ئالۆی مارتینیز بەوەی کە کارماگۆی کردوەتە یەکێك لە خەڵکە ئیحتیمالیەکانی ئەرجەنتینی هەنوکە نغرۆی نێو قەیرانەکان، توانیویەتی ببێتە کەسێکی زۆر ژیرو لێهاتوو. دەنگی حیکایەتخوان و پاڵەوان بەهۆی شێوازی سەربەخۆی ناراستەوخۆوە ئاوێتە دەبن. چونکە نوسەر چەند برگەیەکی لێکۆڵینەوەی رۆژنامەنوسی کە کارماگۆ دەیاننوسێت، تێکەڵ بە رۆمانەکە دەکات. هەمان ئەو شێوازەش بەکاردێنێ کە هەردوو نوسەری ئەمریکی نۆرمان مایلەر و تۆماس فۆڵف پێی ناسراون. دواجار ئێمە دەگەینە ئەوەی کە لێکچوونی نێوان کەسایەتیە خەیاڵی و کەسایەتیە راستەقینەکان تەنها رێکەوتێك بوەو هیچی تر".

# یۆستاین گاردەر لە مێژووی بۆچونەکانەوە دەگوازێتەوە بۆ مێژووی ڕێ پێنەدراوەکان..

• محەمەد عەلی ئەلیوسفی
▪ لە عەرەبییەوە: شۆڕش محەمەد حسێن

لە دوای ڕۆمانی (جیهانی سۆفیا) کە ناوبانگێکی جیهانی گەورەی پەیداکرد، نوسەری نەرویجی (یۆستاین گاردەر) لە ڕۆمانە نوێکەی "الحیاة في منتهی القصر- ژیان لە کۆتایی قەسردا" دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفە، بەڵام لە دەروازەی هیواو بیرەوەریەکانەوە، بە دیاریکراوی لە ڕێی کەسایەتی کەشیش[1] ئۆگستین کە نێوانی فەلسەفەو لاهوت کۆدەکاتەوە.

دەرچوونی ڕۆنامەکەش لە وادەی ئاهەنگ گێڕانی جەزائیر دێت بەیادی ئەو فەیلەسوف و لاهوتەی کە لە یەکێك لە شارەکانی لەدایك بوە.

یۆستاین گاردەر لە زۆربەی بەرهەمی ڕۆمانەکانی پەنا دەباتە بەر تەوزیفکردنی مێژووی فیکر. چونکە ئەو فەلسەفەو مێژووی فیکر دەخوێنێت (لە ساڵی *1952* لە ئۆسلۆ لەدایك بوە) سەرکەوتنی ڕۆمانی (جیهانی سۆفیا) وای لێکرد کە خۆی تەرخان بکات بۆ نوسین و ئەرکێکی تر کە خۆی لە تێکۆشان لە پێناو پاراستنی ژینگەدا دەبینێتەوە لە چوارچێوەی دەزگایەك کە بۆ ئەم مەبەستە دایمەزراند.

ڕۆمانی (جیهانی سۆفیا) ناوی نوسەری لەلای ڕەخنەگران و خوێنەران بەرزکردەوەو کردیە نوسەرێکی جیهانی، لە پاشانیش ڕۆمانەکانی تری یەك بەدوای یەك بڵاوکردەوە وەك: (لوغزی ئارامی- لغز الصبر) و (لە ئاوێنەیەکی تاریکدا- في مرآة معتمة) و (ئەو برا بچوکەی لە ئاسمانەوە هاتوە- الأخ الصغیر القادم من السماء) لە پاشان (ژیان لە کۆتایی قەسردا- الحیاة في منتهی القصر).

لەم ڕۆمانەی دوایدا (ژیان لە کۆتایی قەسردا) یۆستاین گاردەر لە دەروازەی دانپیانانە لاهوتیەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەو فیکر. بۆ ئەم

مەبەستەش ئەو دانپیانانە بەکاردەهێنێ کە (کەشیش ئۆگستین) بەجێی هێشتوون و جۆرێک لە دانپیانانی دژ پێکدەهێنێ، لەسەر زاری کەسێتیەکی ناوەندی لە ژیانی (ئۆگستین) کە گفتوگۆی بۆچونەکانی دەکات و زۆربەی ڕوانینەکانی لەبارەی ژن و خۆشەویستی و سێکس و کەنیسە پوچەڵ دەکات.

کەسێتیە (نوێ-کۆن)ەکە بریتیە لە فلۆریا خۆشەویستی (کەشیش ئۆگستین) لە قرتاج، پێش ئەوەی سەفەر بکات بۆ ڕۆما بۆ تایبەتمەندێتی و پاشان خوێندنی هونەری وتاربێژی، لەژێر کاریگەری کەشیش مۆنیکای دایکی کە دەیویست لە فلۆریا ئیملیای خۆشەویستی دوربخاتەوەو (ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ هیدایەتدانی کوڕەکەی).

(ئۆگستین) زانایەکی لاهوت بوو لە کەنیسەی لاتینی. لە تاغست (بازاڕی هراسی جەزائیری ئێستا) لە سالی (*354*)ی زاینی لەدایک بوەو لە (هیبون) - ئیتالیا- لە سالی (*430*)ی زاینی مردوە.

قۆناغی گەنجێتی و ئارەزوە گەنجیەکانی لە قرتاج بەسەربردوەو بوە بە یەکێک لە پەیڕەوکارانی (مانی[2])، پاشان لەژێر کاریگەری مۆنیکای دایکی و ئەمبروسیۆسی کەشیش دەستبەرداری بوو و بوە لاهوت و لە سالی -*396*-ی زاینی لە شاری هیبوون بوە (ئەسقەف)[3] دژی مانی وەستایەوە کە خاوەن دوو بڕوا بوون: بڕوای خێرو بڕوای شەڕ، ڕوناک و تاریک، هەروەک چۆن دژی بیلاجیوسیە بوەوە (تیۆری بیلاجیوسی ڕەبەن کە لە چەرخی چوارەمدا بە ئازادی ئیرادەی تەواوەتیەوە هەڵەی یەکەم "بنەڕەت"ی ڕەت کردەوە) هەروەک چۆن دژی دوناتیەش وەستایەوە (دڕۆی دۆنا کە ئەسقەفێکی قرتاج بوو لە سەدەی چوارەمی زاینی و بوە هۆی دابەشبوونی کەنیسە لە باکوری ئەفریقیا).

"ئۆگستنی کەشیش" هەوڵی گونجاندنی نێوان عەقڵ و بڕوای داو نێوانی ئەدەب و لاهوت و فەلسەفەی گرێداو کاریگەرییەکی بەرفراوانی لە زانستی لاهوتی ڕۆژئاوایی بەجێهێشت و ئەدەبی لاتینی دەوڵەمەند کرد.

چەندین نوسینیشی بەجێهێشت وەك (في النعمة) و (مدينة الله) و (الأعترافات) کە ئەمەی دواییان ڕۆماننوسی نەرویجی لە ڕۆمانەکەیدا (الحياة في منتهى القصر) کاری لەسەر کرد.

"ئۆگستین" دانپیانانەکانی لە نزیکەی سالی (*400*) زاینی دانا، کە لێوەی تابلۆیەکی بۆ ژیانی کۆتایی سەدەی چوارەم پێشکەش کرد و بۆچونێك لەبارەی ململانێی ڕۆحیەکان دەدات لە نێوان گومان و بڕواو ئەو چەرخەی بە تایبەت جوڵاند.

پێدەچێ (ئۆگستین) لەم چوارچێوەیەدا، هەروەك نوسەر لە پێشەکی ڕۆمانەکەدا ئاماژەی پێدەداو دەڵێ: (بریتی بێت لە پیاوێك پێش ڕێنسانس کە لە بەرامبەری هەست بەوە دەکەین لێمانەوە نزیکە).

ئایا چۆن ڕۆمان نوسەکە ئەو دانپیانانەی هونەریانە داڕشتوە؟! نوسەر وای لە فلۆریا کرد وەڵامی دانپیانانەکانی هاوڕێکەی "ئۆگستین" بداتەوە بە نامەیەکی دورو درێژ کە هەڵگری ناونیشانی

ڕۆمانەکەیە، لەگەڵ ناونیشانێکی تری ناوەندی (نامەیەك لە فلۆریا ئیمیلیاوە بۆ ئۆریلیۆس ئۆگستین)، بەلام ئەو نامەیە بە نادیاری مایەوە.

لە یەکێك لە سەردانەکانی نوسەر بۆ پێشانگای کتێب لە (بوینس ئایرس) لە بەهاری *1995* لە یەکێك لە بازاڕە میلیەکان، کە کتێبخانەیەکی کۆنی فرۆشتنی کتێب هەبوو. سندوقێکی سوری دۆزیەوە کە لەسەری نوسراوە (دەستنوسی فلۆریا)، لە کاتی هەڵدانەوەو چاوخشاندنەوە بە دەستنوسەکە کە بە لاتینی نوسراوە، ئاگایی بۆ پێشکەشکردنەکە دەچێت (فلۆریا ئیمیلیا سلاو لە ئوریلیوس ئۆگستین دەکات (ئەسقەفی هیبون))، نوسەریش موچوڕکەیەکی وروژاندن دایدەگرێ چونکە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان هیچ لە بارەی فلۆریا ئیمیلیا نازانن جگە لەو شتانەی کە (ئۆگستین) لە دانپیانانەکانی باسی کردوە.

پاش ئەوەو وەك نەریتی سەرەتایی، لەبارەی نرخی دەستنوسەکە لە نێوان نوسەرو خاوەن کتێبخانەکە گفتوگۆ دەکرێت و خاوەنی کتێبخانەکە (یۆستاین گاردەر) دەناسێتەوە بەهۆی دەرکەوتنی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و پێی دەڵێ:

-تۆ نوسەری (جیهانی سۆفیا)ی وانیە؟!

-کاتێك نوسەر وەلامی دایەوە، نرخی دەستنوسەکە زیادی کرد، لەگەڵ ئەوەی گومان هەبوو لە ڕەسەنێتی. هەر بۆیە نوسەر بە نرخێکی گران کڕی و خاوەن کتێبخانەکەش پێی وت: "پێویستە ئەم مامەڵەیە وەك (موجازەفەیەك)ی هاوبەش لێی بڕوانین! یان ئەوەتا دەستنوسەکە ڕەسەنەو لەوکاتەدا نرخەکەی لەوە زیاترە کە تۆ پێتدا و بەمەش تۆ قازانج دەکەیت! یان ڕەسەن نیەو بەمەش من قازانج دەکەم!".

لە ساڵی *1995* نوسەر دەستنوسەکەی برد بۆ کتێبخانەی ڤاتیکان لە ڕۆما، لە پێناوی خستنە ژێر پشکنینێکی قوڵ. بەلام ڤاتیکان بەدەستهێنانی نوسخەیەك لەو دەستنوسەی نکۆڵی لێکرد.

پاش ساڵێك لە سەرقاڵی توانی لە لاتینیەوە بۆ نەرویجی وەریبگێڕێت بە هاوکاری چەند هاوڕێیەکی کە لە پێشەکیەکەیدا ناویان دەبات. بەم جۆرە نوسەر دەستنوسەکە بە چوارچێوەیەکی ئەندێشەیی دەتەنێ، لە هەوڵێك بۆ گواستنەوەمان لە وەهمی ئەندێشەوە بۆ بوونی ڕاستەقینەی دەستنوسەکە، کە فلۆریا لە وەلامی دانپیانانەکانی ئۆگستین داینا.

بەلام نامە درێژەکەی فلۆریا هەڵێك لەبەردەم نوسەر (و مامۆستای فەلسەفە) دروست دەکات، تاوەکو تاوتوێی بۆچونەکانی ئۆگستین بکات و لێی بدوێت. بەڵکو ئەو نامەکە وا دەبینێ کە ئاراستەی هەموو کەنیسە کراوە نەك بە تەنها (ئۆگستنی کەشیش).

فلۆریا بە ڕەخنە کۆمەڵێك بابەت باس دەکات، دەکرێ لەژێر ناونیشانی ئەم ڕۆمانە (الحیاة فی منتهی القصر) کورتی بکەینەوە. ڕستەی ناونیشانەکەش لە ڕۆمانەکەدا دووبارە دەبێتەوەو بەشەکان و لاپەڕەکانی دەبەزێنێ لە دارشتەی جیاوازدا لەسەر زاری فلۆریا وەك (ژیان زۆر کورتە، ژیان لە کۆتایی قەسرەکەدا، ژیان لە قەسرەکەدا زیادەیە) تاوەکو پاساوی دژایەتیکردنی بۆ بۆچونەکانی

(ئۆگستین) بهێنێتەوە، لە کۆمەڵێك مەسەلەدا، گرنگترینیان:

*تەجاوزکردنی نێوەندێتی کەنیسەو تەعمید[4] و دانانی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ بە خودا.

*پیکۆڵی و سوربوون (الالحاح) لەسەر پێویستی چێژوەرگرتن لە ژیان مادامەکی دەستکردی خواوەندە. لە پاشان زیادەڕۆیی نەکردن لە چێژ وەرگرتنەکانی، لە نێوانیشیان ئارەزوە هەستیەکان و، ئەم جۆرە یادەوەریانەی ڕووبەڕوو دەکاتەوە: (بە بیرم دێت چۆن یاریت بە جەستەم دەکرد، بە جۆرێك یەکەیەکەی چرۆکانت لێدەکردەوە پێش ئەوەی بکرێنەوە؟ چەندە حەزت لە لێکردنەوەم دەکرد! چەندە بە بۆنی عەترەکەم ئاوێتە دەبویت و چێژت وەردەگرت!!).

لە قرتاج فلۆریا چیرۆکێکی خۆشەویستی گەورە لەگەڵ (کەشیش ئۆگستین) ژیا. ئەو پەیوەندیەش کوڕێکی لێ بەرهەم هات کە ناویان نا (ئەدیودات) بەڵام دایکی ئۆگستین کە (مۆنیکای کەشیش بوو) و کتێبە مێژووییەکان بەوە وەسفی دەکەن (هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ هیدایەتدانی کوڕەکەی) لە کارکردن بوو بۆ کۆتایی هێنان بەو پەیوەندیەو ڕازی کردنی کوڕەکەی بە پێویستی تەعمیدکردن، تاوەکو سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەوەی وای لێبکات سەفەر بکات بۆ ئیتاڵیاو دەبێتە قوتابی (ئەمبروسیوس کەشیش) لە میلانۆ.

ئۆگستین پلە بە پلە خۆشیەکانی دنیای نکوڵی دەکرد. بەڵام تارمایی فلۆریا (ئارەزوە هەستیەکانی) تەنانەت لە خەونیشدا هاوەڵی دەکرد: "وێنەی ئەو چێژو خۆشیانە تا هەنوکەش لە یادەوەریمدا جێگیرە.. لە کاتی بێداری و شەونخونی بەبێ هەست بۆم دێت، بەڵام لە کاتی خەوندا لە ناخمدا بە تەنها ئەو چێژە نامبزوێنێ بەڵکو ڕەزامەندیش لەسەر ئەو چێژە.. ئایا گەورەم جگە لە خۆم بڵێی کەسێکی تر بم..! ئای خوایە.." "دان پیانانەکان".

بەڵام فلۆریا بە درێژایی کتێبەکە، ئەو چێژانەی پێشوو و ئەو وشە عاشقیانەی بیردەخاتەوە کە بە گوێیدا چرپاندویەتی و، بەو قژەی کە لەژێر داری (تین) لە قرتاج بۆنی پێوە کردوە (لەسەر پردی ئەرنو دەستێکی لەسەر شانم داو ڕایگرتم و داوای لێکردم ڕێی بدەم قژم بۆن بکات وتی: ژیان لە کۆتایی قەسرەکەدا.. بۆچی ئەم ڕستەیەم وت؟ بۆچی دەتویست قژم هەڵمژی؟ دەتویست چی بڵێی و چاوپێکەوتنەکەمان بەو وشانە کۆتایی پێبهێنیت؟".

کاتێك مۆنیکای دایکی ئۆگستین دەمرێ دواجار فلۆریا دەتوانێ سەردانی ڕۆما بکات و دەگەڕێتەوە بۆ ژیان لەگەڵی. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیان جۆرێك لە گرژی بەخۆوە دەبینێ، لە دوای ژیان لەگەڵیدا هەست بە تاوان دەکات و دەکەوێتە لێدانی "ئایا بیری توندوتیژی لێدانەکانت ماوە؟ تۆ (ئۆریلیۆس) مامۆستای هونەری وتاربێژی، لێتدام.. چونکە لەبەردەم نەرمونیانەکەمدا لاواز بوویت.. بەم جۆرەش تاوانی ئارەزوەکانت بە ئەستۆ خستم (..) پاشان گریام.. وازت لە لێدانم هێنا بەڵام جەستەم بەردەوام دەچۆڕی.. دەگریایت و هەوڵت دەدا هێمنم بکەیتەوەو داوای لێخۆشبوونت لێ دەکردم (...) پاشان دەرتکردم بۆ

قرتاج و بێئەوەی هیچ شتێك لە بارەی هەواڵت بزانم، تەنانەت بێئاگاش بووم لە مردنی (دیودات)ی کوڕمان لە دوای دوو ساڵ".

نامە دورو درێژەکەشی بەمە کۆتایی پێدەهێنێ "لەو شتە دەترسم کە کەنیسە دەرهەق بە ئافرەتێکی وەك من دەیکات، نەك بەوپێیەی بە تەنها ئافرەتە.. چونکە هەروەها خودا دروستی کردوین، بەڵکو لەبەرئەوەی بابەتی فریودانە بۆ ئێوە، ئێوەی پیاوان، وەك چۆن خواوەند دروستی کردوون (...) ناگەمە بیرکردنی ئەو شتەی کە لە ڕۆما دەرهەق بە منت کرد.. ئەو ئافرەتەی ئەو ڕۆژەی بە لێدان هەڵتکوتایە سەری.. ئەی کەشیشی خۆشەویست، بەڵکو دیاریکراوی من نەبووم، بەڵکو حەوا بوو.. هەڵەی یەکەم بوو..

ماڵئاوا ئەی کەشیشی بەڕێزم. من ئێستا لەژێر تێنتنای پیر لە قرتاج دانیشتووم.. لەم ساڵەدا بۆ جاری سێهەم گوڵی گرتەوە، بەڵام یەك میوەشی نەبەخشی.. ئاگاداری خۆت بە".

دەستنوسەکە کۆتایی دێت و دەنگی نوسەر دێتەوە: "ئایا فلۆریا ئەم نامەیەی بۆ ئوریلیۆس ناردوە یاخود ئەو لە پەرچەکرداری کەنیسە ترسا؟ وای بۆ دەچم ئەو کردبێتی. نامەکەش بە نهێنی دەگوێزرایەوە بە درێژایی مێژووی کەنیسەی کاسۆلیکی.

پێدەچێ ئەم نوسخەیەش لە یەکێك لە (دێرەکاندا) بوبێت و ڕەبەنێك (لە بوینس ئایرس) بە هۆی پێویستی مادییەوە فرۆشتبێتی.

وەك چۆن لەوانەیە ئەو کاتەی عەرەبەکان فەتحی ئەفریقیای باکوریان کرد لە چەرخی حەوتەمدا گەیشتبێتە عەرەبەکان و پاشان لەگەڵ خۆیان بردبێتیان بۆ ئەندەلوس و لەپاش عەرەب ئیسپانیەکان گواستویانەتەوە بۆ ئەمریکای باشور.

وە ئەگەر (کەشیش ئۆگستین) خوێندبێتیەوە ئەوە ئایا پەرچەکرداری چۆن بوە؟

بەمجۆرەش دەردەکەوێ کە دەستنوسی فلۆریا مێژوویەك بوو بۆ فیکرە سەرکوتکەرەکان (مقموعة)، یاخود ڕوانینی تر کە بەردەوام سەدەکانی لە ڕێ پێنەدانێکی نهێنیدا دەبڕی، وەك ئەوەی دەستنوسێکی بڵاونەکراوە بێت، ڤاتیکانیش لە دوای دۆزینەوەی دانیان پیادانەنا.

## پەراوێزەکان

*1*–کەشیش: بە مانای (قدیس) نوسراوە.

*2*–مانی: پێغەمبەرێکی بەناوبانگ و پێغەمبەرێکی ناسراوی ئێران بووە لە ساڵی (*216* زاینی) لە بابل لەدایکبوە، پەیڕەوانی ئەو دینە خوو بە دورەپەرێزییەوە دەگرن و پێیان وایە مرۆڤ ئاسودەیی لە نەکردنی سێکس و نەخواردنەوەی شەراب و نەخواردنی گۆشتدایە، نالی لە کۆپلە شیعرێکی لەو بارەوە دەڵێ:

مانی نیەتی قوەتی تەسویری برۆی تۆ
ئەو قەوسە بە دەستی موتەنەفیس نەکشاوە

*3*–ئەسقەف: پلەی ئەسقەفی لە کەنیسە کاسۆلۆکیەکاندا بەرزترین پلەی دینیە، هاوتای (پاك دەبێت) و وشەیەکی یۆنانیەو بۆ پێشەوایانی ئاینی مەسیحی بەکارهاتوە.

*4* –تەعمید: یاخود (غوسلی تەعمید) یەکێکە لە نەریتە پەیڕەوکراوەکانی دینی مەسیحی و دەروازەیەکە بۆ نەسرانیەت و بریتیە لە شۆردنەوەی منداڵ و تۆژەکانی تر بە ئاو بەناوی باوك و کوڕ و ڕۆحی پیرۆزەوە.

# سەرهەڵدانی سینەماو ئاوابوونی فەلسەفە

• حەمید ڕەزا ئەبك

▪ لە عەرەبییەوە: جەمال محەمەد هەڵەبجەیی

هەنوکە ئیدی وێنە سینەماییەکان دنیای ئێمەیان کۆنترۆڵ کردوە، ئێمە لە چوارچێوەی وێنە ئەکتیڤ و جۆراوجۆرە دەنگی-ڕەنگیەکاندا گیرۆدە بووین، سەرنجراکێش ئەوەیە کە خودی ئێمە تێدەکۆشین تا هەرچی زیاترە بە قوڵایی ئەم زەریایەدا ڕۆبچین، بە پێکانی خۆمان دەڕۆین بۆ سینەما، گڵۆپەکان خامۆش دەکەین و تەواوی هەست و هۆش و



Catherine Karnow/Corbis

بونی خۆمان بە خاوەن کلیلی کێشەی سینەما دەسپێرین تاوەکو پەردە سپیەکەی بەرامبەرمان ڕوناك بكاتەوە، لە پرۆسەی دیموکراسیدا، سینەمامان وەك فەرمانڕەوایەکی خۆمان هەڵبژاردوە و هەنوکە چ بمانەوێت یا نەمانەوێت دەبێت خۆمان بدەینە دەست جیهانگیری ئەم دیکتاتۆرە بە دەسەڵاتە، ئەوەمان قەبوڵ کردوە کە جارێکی دیکە قەشەکانمان بخوێنینەوەو

تەنانەت موساش بەو دە فەرمانە بناسین کە لە سەر پەردەکە بینومانە، سینەما چیتر سەرگەرمیەك، تەکنیکێك، پیشەسازی و تەنانەت هونەرێکیش نیە؛ سینەما شێوەی بیرکردنەوەی ئێمەیە، ڕۆژگارێك لە بوگارتەوە فێربوین کە بە چ شێوەیەك بەوپەڕی توندوتیژیەوە جگەرەکەمان فڕێ بدەینە قەراغی جادەو ئێستا گێڕانەوەی برگمان لە باوەڕی کیرگاردی لە کتێبی "ترس و لەرز" پێ باشترە.

پێشتر سینەماکاران دەیانکۆشا تاوەکو تەواوی نمونە قوڵ و سومبولە سەرەکیەکانیان لە نوسین و گوتەکانی فەیلەسوفە گەورەکان هەڵبژێرن و ئەمڕۆ وەك بڵێی فەیلەسوفەکان قەبوڵیان کردوە ڕاڤەی گوتەکانیان بە هێنانەوەی نمونەگەلێك لە فیلمەکانی ئەنتۆنیونی، ئارکوفسکی، بونوئل و تەنانەت هیچکاك بڕازێننەوە، ئایا فەلسەفە دەسەڵاتداری بێ ڕکەبەری مەعریفە لە هەموو سەردەمەکاندا، وردە وردە دەبێت شوێنی خۆی بە منافیسە نوێ و جورئەتەکەی بسپێرێت؟ ماوەیەك لەوەوپێش لە سایت ئینتەرنێتی هایدگەر وتارێکی مایکڵ بیچۆڤ بە ناوی (سەرهەڵدانی فیلم و ئاوابوونی فەلسەفە) بڵاوکرایەوە، ئیدیعای سەرەکی نوسەری بابەتەکە ئەمەیە کە فیلم بە تایبەت فیلمی سینەمایی پێی ناوەتە ئەو سەرزەویانەوە کە فەیلەسوفە گەورەکانی مێژوو هەمیشە هەوڵیانداوە تاوەکو لە تخوبەکانی نزیك ببنەوە، ئەو دەخوازێت نیشانی بدات فیلمە سینەماییەکان مەودای فراوانیان بۆ گەڕانەوە بۆ زۆرێك لە بابەتە گرنگ و تەوەریەکان هەیە کە لە ڕێگەی فەلسەفەی کلاسیك و ئەکادیمیەوە تا ئێستا بە ئێمە گەشتوە، بە بۆچونی بیچۆڤ سینەما پێکهاتەیەکە لە هونەرو ئەندێشە، تێکڕای بابەتە بیست لاپەڕەییەکەی بیچۆڤ ڕاڤەکردنی ئەم خاڵەیە بە سودوەرگرتن لە یەك نمونە.

بیچۆڤ بۆ سەلماندنی ئەم بۆچونەی ئاماژە بە فیلمە بەناوبانگەکەی (ویم وندرس)ی دەرهێنەری ئەڵمانی، واتە "باڵەکانی ئارەزو"، *1987* دەکات کە لە وڵاتی ئێمەدا بە ناوەکانی "بەهەشتێك بەسەر ئاسمانی بەرلینەوە" و "لەژێر ئاسمانی بەرليندا" ناسراوە. بیچۆڤ دەڵێت هایدگەر بڕوای وابوو کە فەلسەفەی کلاسیك لە سەردەمی سوقراتەوە بە ڕێی هەڵەدا ڕۆشتوە و پرسیارە بنەڕەتیەکەی خۆی فەرامۆش کردوە، ئەو پرسیارەی کە فەیلەسوفەکانی پێش سوقرات -سقراط- وەکو هراکلیتوس و پارفیدس خستبوویانە ڕوو: پرسیار لە بوون. بیچۆڤ بڕوای وایە کە فیلمەکەی وندرس بەرهەمێکە خەریکی خستنەڕووی ئەم پرسیارە گەورە فەلسەفیەو سەرقاڵی وەڵامدانەوەیەتی، فیلمەکەی وندرس داستانی خواوەندێکە کە لە مرۆڤی دروستکراوی خۆی تورە بوەو دەیەوێت زەوی بۆ هەمیشە بە تەنهایی ڕەها بکات. چەند فریشتەیەکیش بۆچونێکی دیکەیان هەیەو لە خوا دەخوازن کە دوایین بەخت و هەل ببەخشێتە مرۆڤی یاخی، بەڵام خواوەند لەم فریشتانەش تورە دەبێت و دوریان دەخاتەوە بۆ بەرلین، ئەویش ئەو بەرلینەی کە لە

سەروبەندی کۆتایی هاتنی شەڕی دوەمی جیهانیدایە.

ئەوان نەفرەت لێکراوەکانی خواوەندن و دەبێت تا هەتایە چاودێری مرۆڤەکان بن؛ ئەویش بەبێ هیچ دەسەلاتێك بۆ ئەنجامدانی بچوکترین گۆڕانکاری دامیل و کاسیل، دوو فریشتەی بەرلین، لەنێو خەڵکیدا سەریان لێدەشێوێت و هەنگاو دەنێن، تەنها منالان دەیانبینن، بەلام پاش ماوەیەك دامیلی عاشقی ماریون کچۆڵەی ئاکرۆباتی سێرکی گەڕۆك دەبێت و بڕیارێکی سەیر دەدات، بڕیار دەدات بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە ئەزەلیەت بکات، بێت بۆ سەرزەوی، عاشق بێت، چەمینەوەی پەنجە مرۆییەکان هەست پێبکات، تا دایبگرێت و دواجار لە ئاگری تاسەو ئارەزودا بمرێت، ئەو دەبێتە کەسێکی خاکی.

بیچۆڤ دوای ئاماژە بە ژیان و هزری وندروس و هایدگەر و پاش خستنەڕووی چەند خالێك لە باڵەکانی ئارەزو تامەزرۆ دەچێتە سەر نامیلکەکەی هایدگەر "پرسیار لە تەکنەلۆژی".

هایدگەر تەکنەلۆژی ئەمڕۆ بە تەواو جیاواز لەو پیشەسازیە دادەنێت کە لە سەردەمی زێڕینی یۆنانی کۆن و دوای ئەو باو بوو، ئەو بڕوای وایە کە تەکنەلۆژی مۆدێرن بەرهەمی بەردەوامی میتافیزیکی کلاسیکە کە چەندین سەدە لە زەین و هزری مرۆڤەکاندا بە بەردەوامی هەبوە.

هەر بۆیە ئەو لە بەشێك لە پرسیار لە تەکنەلۆژی ئاماژە بە مەترسی ئەم ماشینە دەسکردەی مرۆڤ دەکات، بەلام بیچۆڤ بڕوای وایە سینەما وەك یەکێك لە ڕۆڵەکانی تەکنەلۆژی میتافیزیکی کلاسیك ڕۆڵێکی جیا لەوەی کە هایدگەر بڕوای پێیەتی بینیوە، سینەما بە تایبەت فیلمەکەی وندرس، یارمەتی پێشخستنی پرۆژەیەکی داوە کە هایدگەر تەمەنێك لەبن درەختەکانی دارستانی ڕەشدا، بۆ لەدەستدانی حەسرەتی کێشاوە، واتە هەمان ئەو گەشتەی کە هایدگەر بە (زاڵ بوون بەسەر میتافیزیك)ی ناودێر دەکات، بە وتەی مایکل بیچۆڤ، بەهەشت بەسەر ئاسمانی بەرلینەوە، ئەم سنورەی تێکشکاندوە، وندرس شتێکی (نیشانداوە) کە لە (وتن) نەدەهات.

بێگومان هیچ یەکێك لە فەیلەسوفەکان چ ئەوانەیان کە میتافیزیکین چ ئەوانەیان کە ڕویان لەم نەریتە وەرچەرخاند، هێندە ڕوی خۆشیان نیشانی ئەم وتارەی بیچۆڤ نادەن، بەلام وتارەکەی بیچۆڤ تەنانەت ئەگەر ڕاستیشی تێدا نەبێت، پڕیەتی لە جورئەت.

### سەرچاوە

همشهری، ژمارە *2744*

# من خەون دەبینم

• هوبەرت سێلبی جر

▪ لە ئەڵمانیەوە: بەكر عەلی

ئەم نوسەرە ئەمریكیە تەمەن 73 ساڵە لە شاری بروكلاین لەدایكبوەو هەر بە لاوی چوەتە ریزی بازرگانی دەریاییەوە، سیەكانی توشی نەخۆشیەكی توندی ئەوتۆ بوون بە رادەیەك زۆرجار پزیشكەكان بێئومێد بوون لێی، كەچی ئەو هەرگیز دەستبەرداری ژیان نەبوە. لە قۆناغێكی ژیانیدا بریاردەدات ببێتە نوسەر. شەش ساڵ كاری لە رۆمانی یەكەمیدا بە ناوی "دوا دەروازە بۆ بروكلاین" كردوە، ئێستا لە لۆس ئەنجلس دەژی و تازە بە تازە رۆمانێكی بە ناوی "قۆناغی چاوەروانی"یەوە بلاوكردۆتەوە.

ئەو خەون بەوەوە دەبینێت كە مرۆ بایەخ بە شتێكی تر بدات وەك لە پارەو سامان و سەروەری.

ئەمەی خوارەوە بە كوردیكردنی كورتە نوسینێكی ئەوە.

ئەگەر من خەون ببینم، ئەوا خەون بە كۆتایی خەونێكەوە دەبینم، بە كۆتایی خەونی ئەمریكیەوە *American Dream*، ئەو خەونەشم ئەم كتێبەم گرتویەتیە خۆ "نوێژێك بۆ خەون".

ئایا خەونی ئەمریكی چیە؟ بریتیە لە: مانای ژیان ئەوەیە بسەنیت، نەك بدەیت. گەر كەسێك ئەوەی بۆ لوا هەموو شتە جوانەكانی هەبێت، ئەوە مرۆیەكی بەختیارە. پیرۆزترین خێروخۆشی بە لایەوە بریتیە لە پسولەی حسابی بانك. لە "نوێژێك بۆ خەون"دا كۆمەڵە كەسانێك دەبینین كە شوێن ئەم خەونە كەوتوون. هەندێكیان ئەوەیان بۆ دەرەخسێت ئەو خەونە بۆ ماوەیەكی كورت بەدیبهێنن و هەندێكی تریان نا. بەلام هەر هەموویان بە كارەساتێكی تەواو كۆتاییان دێت، كارەساتێك كە خەونە ئەمریكیەكە بە مسۆگەری لەناو دەبات. بە راستی خەونێكی پۆخڵ و كوشندەو مرێنەرە.

ژیان هەرگیز ئەوە نیە کە ئێمە شتەکان لەسەر یەك کەڵەکە بکەین، بەڵکو بریتیە لە دۆزینەوەی ئەو شتەی مرۆڤ هەیەتی، بەلاّم مرۆ کاتێك بەوە دەزانێت کە شت دەبەخشێت. ژیان بریتیە لە دۆزینەوەیەك، دەیسەلمێنێت کەوا مرۆ بریتی نیە لەو شتەی لە هزرماندا وێنامان کردوە.

بەڵکو مەسەلەی ژیان ئەوەیە، درۆ ئاشکرا بکرێت و راستی بدۆزرێتەوە، راستیش ئەوەیە کەوا ئێمە هەر هەموومان، واتە هەموو تاکێکمان، زۆر جوانتر و قەشەنگتر بین لەوەی جارێك لە جاران هزرمان کردوە.

هەڵبەت بە هۆی چەندین هۆی جۆراوجۆرەوە ئێمە دەرکمان بەمە کردوە و تاوەکوش ئێمە بەم خەونە ئەمریکیە گەورەیەوە پابەند بین، ئەوا هەرگیز ناگەینە ئەو ئاستەی ئەم دۆخە بناسینەوە. ئەم خەونە هەموو ئەو فۆرمە ئاکاریەو هەموو ئەو گونجانە رەوشتیەی کە هەمانە لەناو دەبات. هەموو بەهاکان لەم خەونەوە تێك دەشکێن، ئەم خەونە درۆیەکەو ئێمە لەناودەبات، لەبەرئەوە من خەون بە کۆتایی هاتنی ئەم خەونە ئەمریکیەوە دەبینم.

دیارە ئەوە سەرچڵی و ریسکێکی گەورەیە لە ئەمریکای ئەمڕۆدا مرۆ خەونی وەهای هەبێت، هەروەك چۆن سەرچڵیشە لەتەك رەوتی ئاپۆرەی خەڵکیشدا رێنەکەیت.

ئیدی مرۆ دەبێت چ درۆیەك بکات؟ هەڵبەت من بە دیوێکدا لەوە دەترسم رۆژێك لە لایەن کەسێکەوە پێشێل بکرێم و، بە دیوەکەی تریشدا من دەشپرسم، داخۆ کەسێك هەبێت من بە هەند وەربگرێت.

دیارە گرفتەکە من نیم، گرفتەکە بریتیە لە هەموو ئەوانی تر: سیاسەتمەداران خۆیان گۆڕیوە بۆ جەنگاوەران. ئەوەشی بوێرێت لە دوای *11*ی سێپتێمبەرەوە لەگەڵ "سەرۆك"دا هاوبیرو هاورا نەبێت، ئەوە یەکراست دەکەوێتە ژێر گومانی ئەوەی پشتیوانی تیرۆریستان بکات. دیارە هەنووکە خەڵکی دەخوازن ئەوە بزانن: بۆچی پۆلیسی نهێنی ئاگاداری ئەوە نەبوو، ئەگەرچی لەبەردەم سەرۆکدا زانیاری هەبوو، بەلاّم ئەم چی کرد؟ ئەم دەڵێت: "پێویستە هەنووکە ئێمە هاوهەڵوێست بین، چونکە ئێمە خۆمان لە جەنگدا دەبینینەوە!". بوش پیاوێکی ترسناکە بۆ ئەم سەرزەمینەو بۆ هەموو ئەوانەشی لەسەری دەژین و، بگرە بۆ هەموو ئەوانەشی کە هێشتا لە ژیاندا نین. ئەوەشی بە تایبەت من هەراسان دەکات بریتیە لەو زمانەی بوش پێی دەدوێت "چاکەکان و بەدکارەکان" ئەمە بەلای منەوە زۆر سەمەرە دەزرنگێتەوە. رەنگە ئەو خۆی بە قەشەیەك و مزگێنی بەخشێك دابنێت، بەلاّم ئەو یەکراست دەماننێرێتەوە بۆ سەدەی *19* و بە جیهان دەڵێت: ئێوە لە رێگا لاتان داوە! ئەدی لەبەر کام هۆ ئەو پرۆتۆکۆڵی کیۆتۆی ئیمزا نەکرد. دیارە لەبەرئەوە بووە کە رەنگە ئەوە بۆ ئابوری ئەمریکا خراپ بووبێت.

خۆ ئەگەر ئەوەش بۆ تەواوی سەرزەمین خراپ بێت و بۆ ئابوری ئەمریکی چاك بێت ئەوە بە کارێکی چاکە دادەنرێت، بە راستی ئەم چاوچنۆکیە لە

بــــاوەڕدا نــــەماوە. ئەمـــەش ڕاسـپاردەیەکی گـەلێك ترسـناکە، کــــەوا منداڵــــەکانمان هــــەروا بەجێبهێڵین.

خۆشویستنی جەنگ لەلایەن سیاســەتمەدارەکانەوە لەوەدایــە، کەوا شتێکی زۆر سانایە مرۆگـەل لــە ڕق و کینـــەدا کۆبکەیتـــەوە. دواجـار هــەموو نـاڕازی بوونێـك هەســتی پێدەکرێــت و ئەمـــەش واتــە: ئــەوانی ئەوبــەرەوە بــە گونـاهن! ئـەوەی بـە ڕاسـتی مـن هەراسان دەکات ئەو گاڵتەجاڕی و ئیرۆنیەتە تراژیدیەیە کە "گشت" هەیەتی: گەر ئێستا یەکێك وەکو ئیندوڤیدومێکـی سـەربەخۆ لـەم وڵاتــەدا، کــە ئــێرە بــە وڵاتــی ئیندیڤیدوومــــی ســــەربەخۆ دادەنرێــت، بــەرگری لــە خــۆی بکـات، ئـەوە ڕەنگـە نـاوی ببـەن مــــــــارتن لوتــــــــەر. ئیندیڤیدوالیســتەکان ئاوەهایــان بەسەردێت. بەڵام کێشەکە بریتیە لە:

مـن نیویۆرکیـم و هـەروا بـە ســانایی نــاتوانم دەمــم بگــرم، لەبەرئەوەیـە ئیـدی مـن بـەردەوام سـەبارەت بــە خەونەکــە دەدوێــم ویـــڕای هــەموو شــتێکیش مـــن ناخوازم لە کاتێکی تردا بژیم، من پـڕ هــەراترین کــاتم لــە مێــژووی مرۆڤایـەتیدا گـوزەران، خــەمۆکیٚ گەورەکـە، دوو جـەنگی جیـهانی و هــەموو ئــەو شــتانەی بــە دوای ئەودا هـاتن، لـە هـەمان کـاتدا ئـەو گۆڕانە خەیاڵئامێزانەیەش: کە من منــاڵ بــووم تــەنیا ئەســپەدارینە هــەبوو، کــەچی ئێســتا ئێمــە لــە بۆشــــایی ئاسمــــاندا دەفڕیــــن. پەشیمان نیـم کـە هـەموو ئەمانـە ژیـاوم، مـن تـەنیا لـەوە پەشـیمانم کــەوا مــن هیــچ شــتێکم لەگــەڵ ژیـانمدا دەست پێنـەکرد. لـەوەوە من هەمیشـە دەمزانـی کـەوا حـەزم دەکــرد شــتێکم لــە ژیــانمدا بەکاربردایــە، دواجــار ژیــانیش بریتیە لە دیاریەك کە مرۆ دەبێت بەهەر جۆرێك بێت سوپاسگوزاری بکــات. مــن ئاوەهــا بوومــە نوسەر و چ شتێکی دیم نایەتەوە یاد.

ئەگــەرچی حــەزم دەکــرد بیووومایە بە کۆمپۆنیست "موزیك دانـەر" یـاخود نیگـارکێش، بـەڵام بۆ یەکەمیان دەبوو من ماوەیـەکی درێـژ بچووومایەتـە خوێندنگـاوە و بـۆ دوەمیشـیان مـن لـە بـەهرەدا هەژار بووم.

مـن کـاتی خـۆی ئـامێرێکی چــــاپم کــــڕی و یەکڕاســــت لەبـەردەمیدا دانیشـتم و نوسـیم. ئیـدی بـەو شـێوەیە بـوو. ئەوسـا هــەندێ شـتی تریـش هـەبوو: بـە نمونــــە، کتێبـــــی زۆر چــــاك دەردەچــوو، خـــەڵکیش تـــەنیا کتێبی چاکیان دەکڕی. ئەمڕۆ بە جۆرێکی دی دەردەکەوێت، ئەمڕۆ خانــەی بڵاوکراوەکــان بــە دوای کتێبـــــــــــــــــــی *Blockbuster* "ســــنوربەزێن"دا دەگـــــەڕێن، کەسێکی وەك من چیدی چاپی بۆ ناکەن و لە وڵاتەکەمدا بە دەگمەن مـن پاداشـت وەردەگـرم. لـەبری ئەوەش کەسانێك هەن کە هێشتا تاکــە کتێبێکیــان نەنوســیوە و پاداشـتی گـەورەش وەردەگـرن، دیــــارە لەبەرئـــەوەی کەســـێك مەبەسـتی بـازاڕکردنی ئـەوەو لـە تەلەفزیۆنەکانیشدا بـاش دەریـان دەخــەن. ئەمــە جــارێك بەســەر هـاوڕێم "گیلبـەرت سۆرێنتینۆ"دا ڕویـــدا، کــاتێك یـــەکێك لـــە کتێبـەکانی لـە سـەرجەمی خانـەی پەخشی نیویۆرکـدا ڕەتکرایـەوە. یــــەکێك لــــە خوێنـــــەرەوەکان نامەیـەکی لەتـەکدا بۆ نـاردبووەوە: "بـە داخـەوە، ڕەنگـە ئەمـە تاکـە

بیانویەکی فرۆشتنی ئەم کتێبە بێت، کەوا بەڕێز سۆرێنتینۆ نوسەرێکی چاکە، لەبەرئەمەیە پێویستە ئەم کتێبە ڕەت بکەینەوە". بەر لە چەند ساڵێك کیژۆڵەیەکی یازدە ساڵ 600000 دۆلاری وەك پاداشتێك بۆ کتێبێك لەسەر "پەتای قەڵەوی" وەرگرت. لەم وڵاتەدا هەموو کەس دەتوانێت بە پاداشتەکانی ملیۆنەهای دەست بکەوێت. "زۆرتر، زۆرتر، زۆرتر" ئێمە هەموو ئەمەمان دەوێت. گەر مرۆ سەختگیرانە بۆ ئەوە کاربکات، خانویەکی لەسەر گردۆڵکەیەك و حەوزێکی مەلەکردن و سەگێك و شەش حەوت ئۆتۆمبیلی هەبێت ئەمە بەلای خەڵکیەوە گرنگە، بەڵام من بە شتێکی پوچی دادەنێم. ئەوەی بەلای منەوە جێی بایەخە ئەوەیە کەوا مرۆ نابێت ئەوانە بە تاکە مانای ژیان دابنێت. شتی لەم جۆرە نەنگیەو مرۆ بەمانە فێڵ لە ڕەهەندە ڕۆحی و هەناویەکانی دازاینی "هەبوونی مرۆییانە"ی خۆی دەکات. لەودیو هەبوونی دنیای ماتریالیمانەوە هەمیشە دیوێکی ڕۆحیان هەیە کە لەو ئەزمونە دەرکپێکراوانە ڕاستەقینەترە، کە دەشێت بریتی بێت لە دیتن و لە ئاشکراییمان. ژیان بەم جۆرە ڕێدەکات و کەمێك بە جۆرێکی تریشەو لەو خەونە ئەمریکیەش زۆر چاکترە.

ئەوەی من لە ژیانمدا گوزەراندومە بەرەو شتێکی باڵاترم دەبات، بەرەو باوەڕهێنان بە دەستەڵاتێکی خوڵقێنەر. من نەخۆشی سیەکانم هەبوو، دەشمزانی ڕۆژێك دەبێت بمرم، زۆرجاریش ئەمەم پێگوتراوە و من کۆڵم نەداوەو هەمیشەش دیدی من ئەمە بوە: نەفرەت بێت! من نامرم ئەی بەرازینە! من نیویۆرکیم و هیچ کەسێك پێی ڕانەگەیاندووم کارم بە چیەو کارم بەچی نیە! ئەم لوتبەرزیەشم یارمەتی ئەوەی داوم بە زیندویی بمێنمەوە، بەڵام دیوێکی سێبەراویش هەیە: من بەرپەرچی ئەوە دەدەمەوە کە لە ئێستاو لێرەدا جدیەتی ئەم دۆزەم قبوڵ بکەم، من پیرەمێردێکم و بەرپەرچی ئەوە دەدەمەوە کە بە مەرگی خۆم بزانم. ئەمە بۆ هەموو کەس هەڵەیەو من هەر دەشزانم کەوا دەمرم و بەر لەوەشی بمرم دوو شت هەن ڕوودەدەن، یەکەمیان: من تەواوی ژیانم دەخەمەڕوو و پەشیمانیش نیم، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی سامناکە. مرۆ بەرلەوەی بمرێت خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات کە بۆ جارێکی دی بیر لە تەواوی ژیان بکاتەوەو بزانێت کەوا: مرۆ ژیانی بەد کردوە، واتە هەموو ژیان بە تەواوی. ئیدی ئەم هەموو کلۆڵیە لە پێناوی چیدایە! دوەمیان: من دەرك بەو حەزە دەکەم کەوا هەموو شتەکان جارێکی تر بگوزەرێنمەوە، جارێکی تر هەموو شت!

**سەرچاوە**

*Die Zeit Nr. 25 13 Juni 2002*

# خوێندنەوەیەك بۆ ڕۆمانی "گەشتی بالداسار"

• ئەمین مەعلوف

▪ خوێندنەوەی: هەورامان وریا

ڕۆمان ئەو ژانرە ئەدەبییەیە تا بێت پێگەی لە نێوان ژانرەکانی دیکەی ئەدەبدا تۆکمە و قایمتر دەبێت، تا بێت پانتاییەکی فراوانتر لە ناوەندەکانی ڕۆشنبیری و چاپەمەنییەکان بۆ خۆی داگیر دەکات، ئەوەشی ئەم خاسیەتە دەداتە ڕۆمان ئەوەیە کە ڕۆمان زیاد لە ڕوداوێك و زیاد لە کاراکتەرێك و زیاد لە جیهانبینییەك لە خۆ دەگرێ. واتە ڕۆمان ژانرێکی فرە ڕەهەندە و توانای لەخۆگرتنی چەندین دەنگی جیاواز جیاوازی هەیە، هەر دەنگەش دەکرێ دەربڕی جۆرێك لە جیهانبینی و شێوەیەك




بێت لە شێوە بێشومارەکانی ژیان.

ڕۆمان کاتێك دێتە قسەکردن، جیهانێك دەخولقێنێت جیاواز لە واقعی زانرا و لەو ژیانە ڕۆتینییەی ڕۆژانە بەناویدا گوزەر دەکەین. جیهانێك بێ ئەوەی پێی بزانین لە تەنیشتمانەوە دەڕوات و ئاگامان لێی نییە. ڕۆمان پێمان دەڵێ جگە لەم شێوە ژیانەی کە تۆی خوێنەر پێیدا تێدەپەڕیت و هەڵسوکەوتی تێدا دەکەیت، جگە لەو حەزو ئارەزوانەی کە تۆ هەتە، جگە لەو ئەنگێزانەی لەناوەوە پاڵت پێوە دەنێن بۆ گەڕان و پشکنین و دیاریکردنی ژیانت، دواجار جگە لەو پانتاییەی کە تۆی خوێنەر تێدا لەدایك دەبیت، گەورە دەبیت ، دەمریت، ئەوا چەندین پانتایی و چەندین شێوە

ژیانی دیکە هەیە کە ڕەنگە لە تۆ بچن و جیاوازیش بن، ڕەنگە وەك تۆ بن و لەتۆش نەچن، هەموو جیاوازیەك و لەیەك نەچونێکیش لە نێوان تۆی خوێنەر و ژیانی ناو ڕۆمانەکان بە سەرکەوتنێك بۆ ڕۆمانەکە دەنوسرێ، چونکە دواجار ڕۆمان ئەو شتانەمان بۆ ئەدۆزێتەوە کە ئێمە پەی پێ نابەین و دەرکی پێناکەین، ئەو ڕوداوانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ئێمە تێیدا نەژیاوین و ئاگامان لێیان نییە، ڕوداوێك ڕەنگە لە نزیکمانەوە بێت و ڕەنگە دووریش بێت، ڕۆمان چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە نە داپیرە پێی وتوین و نە لە پۆلەکانی خوێندندا ئاشنا بوین پێی.

لەمەوە ڕۆمان دەروازەیەکی گەورە و والایە بۆ دۆزینەوەی مانای تازەی ژیان، ئاشنابون بە فۆرمێکی دیکەی پەیوەندی و بیرکردنەوە، شارەزایی پەیداکردن لە ژیانی مرۆڤگەلێك کە بە هەزاران فەرسەخ دوورن لێت و لە سوچێکی دیکەی گۆی زەوین.

خوێندنەوەی ڕۆمان لەسەرێك لەسەرەکانیەوە گەشتێکی بێ جوڵەی ڕاوەستاوە، بەواتایەکی دی تۆ لە چوارچێوەی ماڵەکەتدا و لەپاڵ کتێبخانەکەتدا بەهۆی خوێندنەوەی ڕۆمانەکانەوە هەموو دنیا تەی دەکەیت و بەناو کەلتوری میللەتە دورە دەستەکان و لاچەپەکاندا تێدەپەڕیت، دەیان ڕوبار و پێدەشت و شاخی هەمە جۆر دەبڕیت و دەگەیتە ناو شارە گەورە و جەنجاڵەکان، لەوێوە دەرئێیت و بەرە و قولایی مێژوو دەگەڕێیتەوە. گەشتێکە بەبێ ئەوەی دوو هەنگاو هەڵنێیت، گەیشتویتەتە لای هیندیەکان، سیبریا، ئەمریکای لاتین، ولاتانی هەمیشە باران، لە هندستان تۆزێك بۆنی بەهارات دەکەیت و کە بێزار بویت دەچیتە ژێر بورجەکەی ئیڤل، لەوێشەوە دەگەڕێیتەوە بۆ سلێمانی و بە گوزەری ئاسنگەرەکاندا سەردەکەویت تا دەگەیتە سەراو ناو ماڵی خۆت.

ئەوەتا ڕۆمانی "گەشتی بالداسار" دەمانباتەوە بۆ سەدەی شانزە و ئاشنامان دەکات بەو شێوە ژیان و بیرکردنەوانەی لەو زەمانەدا باو بون. "بالداسار" ئەم پیاوە لەدوکانێکدا کتێب و شتی دەگمەن و گرانبەها و بەنرخ دەفرۆشێت ژیان بەسەر دەبات. ژیانێکی سادە و ساکار، ئەم کارەشی لە باوباپیرانیەوە بۆ ماوەتەوە. لەو سەردەمەدا مقۆ مقۆی کۆتای هاتنی دنیاو نزیك بونەوەی ڕۆژی قیامەت بەشێوەیەکی سەیر و بەربلاو باسی لێدەکرێت، بلاوبونەوەی ئەم دەنگوباسە هاوکاتە لەگەڵ ڕوداوی هەندێ ڕوداو کە گوزارشت لەو هەوالانە دەکەن.

"بالداسار" پیاوێکی خوێندەوار و توانای هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی ڕوداوەکانی هەیە و مەسەلەی کۆتایی هاتنی دنیا بەڕاست نازانێ و باوەڕی پێی نییە. بەلام ئەم حاڵەتە تا سەر بە خۆڕاگری نامێنێتەوە و ناوە ناوە توشی دڵەڕاوکێ و بەدگومانی دەبێت. لەو کەش وهەوایەدا دەنگۆی ئەوە بلاودەبێتەوە گوایە کتێبێك هەیە بەناوی "سەدەمین ناو-الاسم المئة" ئەم کتێبە باس لەوە دەکات کە خوای گەورە جگە لەو "نەوەدونۆ ناوەی" کە هەیەتی و زانراوە ناوێکی دیکەی تریشی

هەیە، بەڵام ئەم ناوەیان نەزانراوە و کەس پەی پێنەبردوە. ئەم ناوە لەو کتێبەدا هاتوە کە "ئەبو ماهر مازندەرانی" نوسیویەتی.

پەیبردن بەم ناوە و زانینی دەبێتە هۆی دورکەوتنەوە لە دەردو بەڵاو ناخۆشیەکان، واتە زانینی ئەم ناوە لەو نەهامەتی و کارەساتانەی ڕۆژگار دەیهێنێتە پێشەوە دەتپارێزێ، ئەوەتا دەڵێن "نوح" پێغەمبەر ئەم ناوەی زانیوە بۆیە توانی خۆی و قەومەکەی لەکاتی تۆفانەکەدا ڕزگار بکات.

"بالداسار" بەڕێکەوت ئەم کتێبە ئەدۆزێتەوە. کتێبەکە لای پیاوێکی پیر و کەنەفت و بەساڵاچوو بووە، ئەم پیاوە ناوی "حاجی ئیدریس"ە، یەکەم گومانی "بالداسار" لە وەرگرتنی کتێبەکەوە دەست پێدەکات، گومانی ئەوەی ئەم کتێبە ناتوانێ هیچ کارەسات و هەژاری و دەردو بەڵایەك ڕەتبکاتەوە، چونکە "حاجی ئیدریس" کە کتێبەکەی لایە بۆخۆی پیاوێکی دەستکورت و نەدار و بێنەوایە، لە خانویەکدا دەژی تا بڵێی پەڕپوت و تاریکە. "بالداسار" کاتێ کتێبەکەی لێوەردەگرێ و دەیەوێ چاوێکی پیا بخشێنێت بەرچاوی تاریك دەبێت و ناتوانێت بیخوێنێتەوە، لەو کاتەدا "بالداسار" وا هەستدەکات لەبەر تاریکی ژورەکە بێت- بەڵام ئەم حاڵەتە چەند جارێکی تر و لە هەندێ شوێنی دیکەدا دیسانەوە دووبارە دەبێتەوە- "بالداسار" بڕیار دەدات لە کاتێکی تردا کتێبەکە بخوێنێتەوە، هەربۆیە بە دڵخۆشیەوە بە خۆی و کتێبی "سەدەمین ناو" دەگەڕێتەوە بۆ دوکانەکەی، کتێبەکە دەشارێتەوە بۆئەوەی لە دەرفەتێکدا بیخوێنێتەوە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە دوادەکەوێت و نایەتە دی، هۆکەشی ئەوەیە ڕۆژێ دوای ئەوەی کتێبەکەی لەناو دوکانەکەیدا شاردەوە، نێردراوی کۆشکی فەرەنسا "هوغ دو مارمونتیل" کە پیاوێکە خاوەن مەعریفەیەکی گەورەیە و زانیارییەکی باشی لەسەر کاروباری ڕۆژهەڵات هەیە دێتە دوکانەکەی و بەڕێکەوت چاوی بە کتێبەکە دەکەوێت و بەزۆری و بە پارەیەکی زۆر کتێبەکە دەکڕێ و دەڕوات بۆ قوستەنتینیە. دوای کڕینی کتێبەکە "بالداسار" پارەکەی دەباتەوە بۆ "حاجی ئیدریس" بەڵام کاتێ دەگاتە خانوە تاریك و تەنگەکەی هەواڵی مردنی پێدەدەن. بە بیستنی ئەم هەواڵە "بالداسار" توشی نائومێدی و حاڵەتێکی دەرونی ناخۆش دەبێت، بۆیە بڕیار دەدات هەرچۆنێ بێت کتێبەکە دەست خۆی بخاتەوە، چونکە "بالداسار" مردنی لەناکاوی "حاجی ئیدریس" وا لێکدەداتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ لەدەستدانی کتێبەکە و فرۆشتنی بەو کابرا فەرەنسیە. لێرەوە گەشتەکەی "بالداسار" دەست پێدەکات، لەم گەشتەدا "بالداسار" توشی کۆمەڵێ ڕوداو دەبێت کە هەموویان گوزارشت لە نزیکبونەوەی کۆتای هاتنی جیهان دەکەن، هەندێك جار "بالداسار" زۆر نزیك دەبێتەوە لەوەی کە کتێبەکەی وەربگرێتەوە کەچی لە ناکاودا ڕوداوێك دێتە پێش و دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانێ کتێبەکە وەربگرێتەوە. سەیری ئەم کتێبە لەوەدایە هەر کەسێ کە کتێبەکەی دەست دەکەوێت بە شێوەیەك لە

شتەکان ژیانیان لەدەست دەدات، لەبەرئەوە لەباتی ئەوەی کتێبەکە بەڵاو ناخۆشیەکان دوور بخاتەوە کەچی خودی ئەو کەسەی کە کتێبەکەی لایە ژیانیان لەدەست دەدات. هەر بۆیە دواجار کاتێ "باڵداسار" بە کتێبەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ "جنوی"

بەسەرداریەوە لە کتێبەکە دەڕوانێ و حەز بە خوێندنەوەی ناکات. دەتوانین بڵێین ئەو ئارەزو و حەزەی سەرەتا "باڵداسار" هەیبو بۆ گەڕانەوەی کتێبەکە و خوێندنەوەی، لەپاش دەستکەوتنی کتێبەکە نامێنێت. چونکە "باڵداسار" تێدەگات ئەم کتێبە نە دەتوانێ کارەساتەکان ڕەت بکاتەوە و نە دنیاش کۆتای هاتوە.

ئەم گەشتە گەرچی لە بنچینەدا گەڕانە بەشوێن کتێبێکدا، بەڵام لەهەمان کاتدا سەفەرێکە تێیدا "باڵداسار" چەندین وڵات و شار و خەڵکی هەمە جۆر دەبینێت. هەر لەم گەشتەدا ئافرەتێك بۆ ماوەیەکی کەم لە ئوتێلێکدا دەناسێ و پەیوەندیەکی خۆشەویستی گەورە لە نێوانیاندا دروست دەبێت. لەوەدا بۆ یەکەم جار "باڵداسار" لە ژیانیدا توشی خۆشەویستی دەبێت و لە نزیکەوە لە ئافرەت تێدەگات. تێدەگات خۆشەویستی پرۆسەیەکە زۆر جار لەناکاو و لە پڕێکدا مرۆڤ توشی دەبێ و گیرۆدەی دەبێت.

لەم گەشتەدا ئەو ساڵەی کە گوایە دنیا تێیدا کۆتایی دێت تێدەپەڕێت و دنیاش هەروەك خۆی ماوەتەوە. "باڵداسار" دواجار بڕیار دەدات کە کتێبەکە نەخوێنێتەوە و لە شوێنێکدا هەڵی بگرێت تا دەستێکی دیکە و لە سەردەمێکی تردا یەکێکی تر بێت و بیخوێنێتەوە.

لە کۆتاییدا با گوێ لەم پەرەگرافەی "باڵداسار" بگرین کە لەکاتی یەکێك لە نوێژەکانیدا دەیڵێت: "خودایە، زۆر لێم دوورمەکەوەرەوە! زۆریش لێم نزیك مەبە، لێم گەڕێ لە دامێنی کراسەکەتەوە تەماشای ئەستێرەکان بکەم! بەڵام، ڕوخساری خۆتم بۆ دەرمەخە. بهێڵە هاژەی ڕوبارەکان ببیستم کە هەوایان لێدەکەیت بڕۆن، گڤەی ئەو بایانەم گوێ لێبێت کە فو بە دارەکاندا دەکەن، پێکەنینی ئەو منداڵانە ببیستم کە دروستت کردون! بەڵام، خودایە! خودایە! مەهێڵە گوێم لە دەنگت بێت".